# ناسیۆنالیزم چیە "1"

**ستانلی بن**

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

دەکرێ لایەنیکەم وشەی ناسیۆنالیزم بە پێنج مانای جیاوز پێناس بکرێ:

*1*–جۆرێك هەستی وەفاداری بۆ نەتەوەیەکی تایبەت (واتە جۆرێك لە نیشتیمانپەروەری)

*2*–لەبارەی ڕێباز و سیاسەتێکەوە، مەیل بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی نەتەوەی خۆ، بەتەنیایی، بەتایبەتی کاتێك پێی ململانێ لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەکانی دیدا لەئارادا بێت.

3_ گرنگیدانی سەرەکی بە خەسڵەتە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەك و لێرەوە

4– قسەکردن لە پێویستی پاراستنی کلتوری نەتەوەیی.

5– بڕوابوون بەو تیورەیە لە سیاسەت و مرۆڤناسیدا کە ڕەگەزی مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی دابەشبووە بۆ چەند نەتەوەیەك، هەندێك پێوەری دیاریکراو هەیە بۆ دیارکردنی نەتەوە و تاکەکانی و هەر نەتەوەیەك ماڤ خۆیەتی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێت و دەوڵەتەکانیش تەنها تا ئەوکاتە ڕەوایەتیان هەیە کە بەپێی ئەم بنەمایە دروستبووبن و دواجار جیهان لەڕووی سیاسیەوە تەنها ئەوکاتە دەتوانێ بەشێوەیەکی دروست ڕێکبخرێ کە هەر نەتەوەیەك دەوڵەتێکی هەبێت و هەر دەوڵەتێك لە کۆی نەتەوەیەك پێکبێت.

## ماهیەت و پێوەرەکانی نەتەوە

بنەما و تیورەکانی سەر بە بەشی 4 و 5 لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە ڕەواجیان پەیداکرد. ئەڵبەتە بێگومان پەیوەندی هەستی کەسێك بە نەتەوەکەی خۆیەوە و بڕوابوون بەوەی بۆ نمونە ئینگلیزەکان هەموویان نەتەوەی ئینگلیز پێکدەهێنن، ڕابوردویەکی زۆر دورتر لەمەی هەیە. مرۆڤەکان هەمیشە هەستیان بە پەیوەندی بە جۆرێك "گروپی خودی" چ عەشیرە یان خێڵ و شار و نەتەوە بێت، کردووە. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هەستیان کردووە بەوەی هەرکەسێك کە لەخۆیان نیە، بێگانەیە (هەندێکجار بەچاوی دوژمنیشەوە

تەماشایان دەکرد) بەڵام دەبێ ببینین خەسڵەتی نەتەوەکان چیە و چ شتێك لە گروپەکانی دی جیایان دەکاتەوە.

**پێناسی نەتەوە بە پێی دەوڵەت:**

ئایدیۆلۆژیستی شۆڕشی فەڕەنسی "ئابێ سێ یس" لە 1789دا نوسی نەتەوە"یەکێتی تاکەکەسانێکە کە یاسایەك فەرمانڕەوایان دەکات و یەك ئەنجومەنی یاسادانان نوێنەرایەتیان دەکات". کەوابوو بەپێی ئەم وێنایە یەکێتی و شوناسی نەتەوە لقی ڕێکخستنی سیاسیە و دەوڵەت پێشینەیەکی لۆژیکی بەسەر نەتەوەدا هەیە. تیورەکەی سێ یس هاوجووت بوو لەگەڵ بنەمای دانانی تاك یان بەشی دابەشنەبوو لە تیگەیشتنی گروپدا و ئەم بڕوایە کە لۆك بەیەکێك لە تەفسیرکەران و بەرگریکەرانی سەرەکی دادەنرا، خەسڵەتی زۆربەی تیورە کۆمەڵایەتیەکان بوو لە بزوتنەوەی ڕۆشنگەری سەدەی هەژدەدا. نوسەرانی وەك دیدرۆ و کۆندریسە لەو بڕوایەدابوون کە دەبێ گریمانەی ئەوە بکەین تاکەکان لەگەڵ دامەزراندنی سیستەمی سیاسیدان، لەبەرئەوەی (لەو روەوە) کە ئەمکارە لە بەرژەوەندی تاك و کۆیانە. بەرژەوەندی یان سودی گشتی کە بەمشێوەیە دروستدەبێت، بناغە و هۆی ئەرکی سەرشانی تاکەکەسە بۆ پاراستنی رژێمی ناوبراو و بەرگریکردن لێی و دەوڵەت وەك بابەتی ئەم بەرژەوەندیە، بەتایبەتی دەبێتە بابەتی وەفاداری. کەسانێك کە لەم بەرژەوەندیە گشتیەدا بەشدار بن، نەتەوە یان گەلێك پێکدەهێنن. سەلمێنەری ئەم تێڕوانینە لەبارەی نەتەوەوە بەکارهێنانی هاومانای دوو وشەی "تەبعیەت" و "نەتەوەیە"ە لە زۆریك لە حاڵەتەکانی قسەی باوی رۆژانەدا. (رۆژگارێك ئەم حوکمە لەبارەی زاراوە یاساییەکانیشەوە راستبوو، بەڵام هەنوکە زۆرێك لە دەوڵەتەکانی جیاوازی دەکەن لەنیوان ئەو ئەرکانەی دەرئەنجامی تەبعیەت و نەتەوەن). ئەگەر بمانەوێت جیاوازی بکەین لە نێوان تەبعیەت و نەتەوەدا ئەمکارە بەشێوەیەکی سەرەکی بەوشێوەیە ئەنجامدەدەین کە تەبعیەت سنوردار دەکەین بە مەسەلە سیاسی و هەلومەرجە یاساییەکانەوە و لە دیارکردنی نەتەوەشدا پێوەرگەلێك بەکاردێنین وەك شوێنی لەدایکبوون و دایك و باوك و زمان و نەریتی کلتوری.

**پێناسی نەتەوە بە پێی زمان و کلتور:**

وێنای نەتەوە بەمانای زمان و کلتور لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا و بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی بەرهەمی هەندێك بیریار و نوسەری ئەڵمانی وەك هێردەر، نۆڤاڵیس و شلایر ماخەر و فیشتە وەك جەمسەرێك لە جەمسەرەکانی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیستی، دەربڕا و بڵاوبۆوە. شۆڕشگێڕانی فەرەنسی بڕوایان وابوو نەتەوە کۆمەڵێك کەسە کە هەر هەموویان سەر بە رژێمێکی سیاسین. بەڵام ئەڵمانیەکان لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە خوداوەند و سروشت نەتەوەکانی لێکجیا کردۆتەوە و هەر نەتەوەیەك خاوەن خەسڵەتیکی تایبەتە کە پەیوەندیەکی نزیکی بە زمانی هاوبەشی ئەو نەتەوەیەوە هەیە. لەبەرئەوەش کە زمان هەڵگری نەریتەکان، هەستەکان و رەمزەکانە و پەیوەندیە سۆزداری و ئەفسانەیەکان دەگوێزێتەوە، کەوابوو بەشداربوون لەهەر زمانێکی خۆییدا بەمانای بەشداربوونە لە کلتورێکی هاوبەشدا. بە نوسینی شلایر ماخەر "هەر زمانێك یەکسانە بە شێوەیەك بیرکردنەوەی تایبەت، ئەوەی بەزمانێك بیری لێدەکرێتەوە، هەرگیز مومکین نیە بەوشێوەیە

بەزمانێکی دی دوبارە بێتەوە". ئەم وێنایە بۆ نەتەوە کەم کەم لەگەڵ تیورەیەکی میتافیزیکیدا پەیوەست بوو کە پەیڕەوەکانی بڕوایان وابوو هەر نەتەوەیەك دەرکەوتی رۆح یان ئایدیای هەمەکی ئەویدیە کە ئەویش بە نۆبەتی خۆی دەرکەوتێکی جوانی راستیە. وە جیاوازی نەتەوەکان، هەمەڕەنگی بوون پیشان دەداتەوە و هەر نەتەوەیەك بەشی خۆی هاوکاری پێشکەوتنی رەگەزی مرۆڤ دەکات و لێرەوە تاکەکانی نەتەوە لەرووی ئەخلاقیەوە پاراستن و پەروەردەکردنی نەتەوەیان لەئەستۆیە. لێرەوە بوو کە ناسیۆنالیستە کلتوریە ئەڵمانیەکان، لە کاردانەوە بەرامبەر بە نیشتیمان گەردوونی *Aufklarung* (یان بزوتنەوەی رۆشنگەری لەو سەرزەمینەدا) کە مەیلی بەلای فەرەنسادا هەبوو، لەگەڵ رەهەندی ناسیۆنالیستی بیرکردنەوەیاندا، هەروا تەماشای نەتەوەکانیان لە دیمەنی گشتی مرۆڤایەتیدا دەکرد و بڕوایان وابوو هەر نەتەوەیەك دەبێت بەشی خۆی لە چارەنوسی پڕ هەوراز و نشێوی ئادەمیزادە، بدات.

ئەم دەستەیە لە بیریاران و نوسەران بڕوایان وابوو بوونی نەتەوە نەبەستراوە بە ویستی تاکەکانیەوە، تاکەکان ناتوانن بڕیار بدەن ئەندامی نەتەوەکەی خۆیان نەبن. چونکە بوونی نەتەوەیە کە فۆرمەلەی هوشیاریان دەکات. نەتەوەی ئەڵمانیا لەبەرئەوە بونێکی سروشتی هەیە کە کەسانێك بەپێی نەریتی ئەڵمانی لەدایکبوون، خۆبەخۆ پیاوازن لە ئینگلیز یان فەرەنسیەکان. کەوابوو ئەڵمانیەك گەر بیەوێت مەیمون ئاسا لاسایی فەرەنسیەکان بکاتەوە، دەبێتە رێگر لەبەردەم گەشانەوەی خودی و سروشتی خۆی و دەبێ قەناعەت بەو شتە بکات کەلای ئەو لاوەکی و شتیکی دروستکراوە.

**پێناسی نەتەوە بە پێی میراتی هاوبەش:**

وێنای نەتەوە بەمانای زمان و کلتور، لە 1882دا لە وتاری بەناوبانگی"نەتەوە چیە"دا بەتوندی کەوتە بەر رەخنەی ئەرنست رینان. رینان دەیگوت هەڵەیە گەر کەسانێك نەتەوەکان لەگەڵ گروپە زمانیەکاندا تیکەڵبکات. بنەما و رەگی هاوبەشی نەژاد یا زمان یان دین یان بەرژەوەندی ئابوری هاوبەش یان راستیە جوگرافیەکان، بۆ دروستبوونی نەتەویەك بەس نین. نەتەوەگەلێك هەن وەك سویسریەکان کە لەم خەسڵەتانەدا هاوبەش نین، و هەندێك گروپی زمانیش هەن وەك نەتەوە ئینگلیز زمانەکان کە خاوەن ئەم خەسڵەتانە هەن و بەڵام پێکەوە نەتەوەیەك پێکناهێنن. رینان بڕوای وابوو ئەوەی دەبێتە هۆی دروستبوونی دەوڵەت، لەپلەی یەکەمدا بوونی مێژووی هاوبەشە، بەتایبەت مێژووی رەنج و ئازارەکان، واتە گەنجینەیەکی هاوبەشی یادەوەری کە مایەی هاودەردی و شانازی بێت. بەڵام ئەو لە هەمانکاتدا بڕوای وابوو کە گرنگە هەندێك شتەکان لەبیر بچنەوە، چونکە تا برینە دێرینەکان ساڕێژ نەبن، هەستی بەشداربوون لە نەریتێکی هاوبەشی قارەمانیدا، پەیدا نابێت. کەوابوو دوهەم مەرجی بوونی نەتەوە خواست و ئیرادەی پێکەوەژیان و بە زیندوو هێشتنەوەی میراتی هابەشە. بە وتەی رێنان ("دوو" مەرجی پێویستنی دروستبوونی نەتەوەیەك ئەوەیە کە "خەڵکی" بەرێکەوت کاری گەورەیان کردبێت و بیانەوێت دیسان لەو کارانە بکەن... بوونی نەتەوە...وەك "وەڵامێکی پۆزەتیڤە" بە راپرسیەکی رۆژانە).

بەڵام تەنانەت بەگریمانەی گرنگی ئەوەی کەسێك خۆی بە نەریتێکی هاوبەشەوە گرێبدات لە

ژیانی نەتەوەیەکدا، دیسان جێی گومانە تەعبیری مەجازی یادەوەری هاوبەش، ئەوەندە کاریگەری لە رونکردنەوەی ئەو مەسەلەیەدا هەبێت کە ئەو شتەی یەکێتی و بەردەوامی بە نەریتی نەتەوەیی دەدات، چیە؟ یادەوەری لەرووی خودناسی و شوناسی فەردیەوە گرنگە، بەڵام تاکەکان ناتوانن بەم مانایە بیریان بێتەوە کە پێش لەدایکبوونی ئەوان چی رویداوە. هەروەها مەرج نیە پێشینانە قارەمانەکانیان، پەیوەندیەکی فسیۆلۆجیان پێیانەوە هەبێت. فەرەنسیەك تەنها بە مانایەکی مەجازی دەتوانێ بڵێت ژاندارك نەنکی ئەوە، وە تەنها لەبەرئەوە دەزانێت چ کەسێك بە ئەژدادی خۆی بزانێت کە پێشتر هاوبەش بووە لە نەریتی نەتەوەدا. هەر هەلومەرجێك پێویستی بە جۆرێکی تری وەفاداری هەیە و ئەو ئەژدادانە کە تاکەکەس بەموڵکی خۆی دەزانێت رەنگە بەپێی هەلومەرج بگۆڕێت. ئەمەریکیەکی یەهودی بە رەگەز ئەڵمانی رەنگە هەندێکجار خۆی لەگەڵ جفرسن و هەندێکجار لەگەڵ یەهودای مەکابیێدا و هەندێکجاری دی لەگەڵ فردریکی مەزندا، بەیەك نەژاد بزانێت. پاشان تاکەکان رەنگە تەنها لەبەرئەوەی لە فلان روداودا پێکەوە بوون لە یادەوەریەکدا هاوبەش بن، بەڵام بوونی مێژووی هاوبەش تەنها بەوە نیە کە هەمووان هەمان روداوی مێژووی بزانن، بەڵکو بەوەیە کە خۆیان لەگەڵ کۆمەڵەیەك رەمزی مێژووی هاوبەشدا بەگرێدراو ببینن و لەبەردەم خۆیاندا بەیەك هونەرنواندن بنازن و هەست بە توڕەیی لەبەرامبەر سوکایەتپێکردنێکدا بکەن.

فەڕەنسیەك رەنگە ئەوەندەی لەبارەی ژاندارکەوە دەزانێت، هێندەش لەبارەی فردریکی گەورەوە بزانێت، بەڵام لەبەرئەوەی فەڕەنسیەکە ژاندارك موڵکی ئەوە و فردریکیش موڵکی کەسانی دی. کەوابوو نەتەوە لە شوێنێکدا هەیە کە کۆمەڵێك کەس بەمشێوەیە مەیلیان بۆ کۆمەڵێ رەمزی هاوبەش هەبێت و خۆیان بە هاوگروپ و بەشدار لە تێڕوانینێکی هاوبەشدا بەرامبەر بەو رەمزانە بزانن و هەستێکی خەمخۆرییان بۆ یەك هەبێت کە نەیانەوێت کەسانی دی تیا بەشدار بن. دیارە رەنگە لەرووی زمان و دین و شکڵیشەوە هەندێك خەسڵەت هەبن کە دەستنیشانی بکات چ کەسانێك دەبێت بەم وەسفانە بناسرێنەوە و گرنگی هەر یەکێك لەم سیفەتانەش بەپێی گۆڕان هەلومەرج، دەگۆڕێت.

**هەلومەرجی نەتەوە بە پێی سەرزەمین:**

یەکێك لە خەسڵەتەکانی نەتەوە کە لەهەموو بەشەکانی تری پەیوەندی کۆمەڵیی گرنگترە، پەیوەندی نەتەوە و سەرزەمینە. ئەگەر کۆمەڵێك لەرووی سەرزەمینەوە پەیوەندییەکی تایبەتیان نەبێت، هۆیەك نیە کە لەپاش ئەمەوە بە دەستە یان خێزان یان چینێکی کۆمەڵایەتی دابنرێن. کەوابوو پێدەچێت وێنای وڵات یەکێك بێت لە خودێتی وێناکانی نەتەوە. کەسێك کە بەڕاستی جیهان نیشتیمانە سەر بە هیچ شوێنێکی دیاریکراو نیە. ئەم مەسەلەیە ئەوە روونەدەکاتەوە کە لەنێوان دوو چەمکی نەتەوە و دەوڵەتدا پەیوەندیەکی نزیك هەیە، چونکە بناغەی دەوڵەتیش سەرزەمینە و دەوڵەتیش کەسانێك سەر بەخۆی نەبن تەنها لەژێر هەلومەرجێکدا قبوڵدەکات کە خۆی دیاری دەکات.

لە هەلومەرجێکدا کە مێژووی ناوچەیی باس لە ناکۆکی نێوان گروپە مەزهەبی یان زمانی یان رەگەزیە جیاوازەکان دەکات، هەر گروپێکیش لە سەرزەمینێکی دیارکراودا جێگیر بێت، تاکەکانی گروپ خۆیان بە گروپی جیاواز و خاوەن مێژووی پەیوەندیدار بەو سەرزەمینەوە دەزانن و هەست بە

بڵندی یان بەرگەگرتنی سەختیەکان دەکەن. خەسڵەتەکانی گروپەکانی دەوروبەر جیادەکاتەوە، بە خەسڵەتی خەڵکی ئەو سەرزەمینە دەزانرێت، ئەگەرچی لەدەرەوەی ئەو ناوچەیەش خەڵکی وا پەیدا بن. دەکرێ چاوەڕێی ئەوەبین کە هەر گروپێکی لەمچەشنە کە لە دەسەڵات مەحروم بێت، ئارەزووی سەربەخۆی بکات و بیەوێت خۆی راستەوخۆ مەرجەکانی بەهرەمەندبوون لە دەسەڵات و بایەخ، دەستنیشانی بکات. هەر گروپێکی نەتەوەیی رەنگە شوناسی خۆی و تاکەکانی خۆی بە کۆمەڵێك خەسڵەت بزانێت. ئەوەی کە لەهەر حاڵەتێکدا کام خەسڵەت دەبێتە تەوەرەی سەرەکی نەتەوایەتی، پەیوەستە بەوەوە گروپەکە لەچ رێگەیەکەوە بە خودهوشیاری گەیشتووە. زوربەی جار پێوەری گروپ بۆئەوەی بڵێت زوڵمی لێکراوە، هەمان ئەو خەسڵەتە دەبێت، هەروەها دەگوترێت کە وڵاتی گروپی ستەملێکراو هەمان ئەو سەرزەمینەیە کە گروپی ناوبراو تیایدا باڵادەستە یان تا ئەو جێگەیەی کە یادەوەری هاوبەش پیشانیدەدات، رۆژگارێك لە رابردوودا﴿لەو سەرزەمینەدا﴾ باڵادەست بووە.

### پێناسی نەتەوە بە پێی ئامانجی هاوبەش:

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبەرئەوەی ناسیۆنالیزم زوربەی جار شێوەیەکی ناڕەزایی دەربڕینە، چەمکی نەتەوە کە پێوەی گرێدراوە، رەنگە تەنها نەك پەیوەندی بە ژماردنی خەسڵەتە پۆزەتیڤە هاوبەشەکانی گروپەوە هەبێت، بەڵکو بەهەمان ئەندازە پەیوەندی بە دەستنیشانکردنی "گروپی بێگانە" ئامانجی پیکدادانەوە هەیە. بۆ نمونە لە سەدەی بیستەمدا ناسیۆنالیزمەکانی ئەفەریقا و ئاسیا بەتوندی پشتیان بەوە بەستبوو

کە کۆلۆنیالیکردنی سپیپێستەکان رەد بکەنەوە و بیانەوێت لەگەڵ ئەواندا بە رابەر دابنرێن. بەڵام ئەمە بەتەنها بۆ دروستبوونی نەتەوە بەس نیە، چونکە ئەگەرچی ئەم هەستانە لە زوربەی ئەفەریقای رەشدا دەبینرێت، بەڵام تەنها ژمارەیەکی ئەفەریقیەکان خۆیان بە یەك نەتەوە دەزانن و ئارەزوو دەکەن هەمویان پێکەوە لەیەك دەوڵەتدا یەکبگرن. لەراستیدا رەنگە ناسیۆنالیزم لەپێش نەتەوەوە بوونی هەبێت، ئەگەر بەمانای ئارەزووی گروپێکی دەستەبژێری خاوەن پەروەردەی ئەوروپی بۆ سەربەخۆی سەرزەمینێك بژمێرێت کە سنورەکانی یەکێك لە ئیمپراتۆریەکان بە سەرنجدان لەرووی ئیداری و تەنفیزیەوە دەستنیشانی کردووە، نەك هیچ جۆرە نەریتێکی خۆیی یان ئارەزویەکی رەمزی. ناسیۆنالیزمی وڵاتانی وەك غینیا دەبێ پاش گۆڕانی کۆلۆنی پێشوو بۆ دەوڵەتێکی نوێ، تازە دەستبکەن بە دروستکردنی نەتەوە. بوونی دەوڵەت رەنگە هەرئەوەندە لەرووی دروستبوونی نەتەوەوە گرنگی هەبێت کە بوونی نەتەوە بۆ دروستبوونی دەوڵەت هەیەتی. بەڵگەی ئەم قسەیە سەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێتە. ئیمپراتۆری نەمسا، هەنگاریا لەبەرئەوە لێکهەڵوەشایەوە کە لە دروستکردنی نەتەوەیەکدا شکستی هێنا.

### مافی چارەی خۆنوسین

تیورەی ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ لە دوو سەرچاوەی هاوتاوە دێتە دەرێ: یەکێکیان وێنای فەرەنسیەکان بۆ فەرمانڕوایەتی خەڵکی و ئەویدیان ناسیۆنالیزمی رۆمانسی ئەڵمانیایە کە بناغەکەی ئەنترۆپۆلۆجی بوو. بیریارانی زانستی سیاسەت لە سەدەی هەژدەدا، فەرمانڕەوایەتیان لەبری پاشا، بە

موڵکی خەڵك دادەنا و بەمشێوەیە مافیان بە خەڵکی دەدا کە راستەوخۆ جۆری حکومەتەکەی خۆیان دەستنیشان بکەن. ئەم کارە هەڵگری هیچ مەترسیەك بۆ رژێمی ئەو وڵاتانە نەبوو، لە فەرانسا و ئینگلتەرەدا کە خەڵکی هوشیار بوون بە بونی خۆیان و سنورەکانی کەمتازۆر لەگەڵ سنورە جێگیرەکانی وڵاتدا هاورێك بوو، وە دەوڵەت لەپێشەوە بوو بوو بە رەمزی نەتەوە، هیچ جۆرە یەکێتی خوازیەك لەئارادا نەبوو. بەڵام لە ئەڵمانیا و ئیتالیادا نەتەوایەتی لە سنورەکانەوە لێیدەڕژا. قسە لەسەر ئەوە بوو گەر خەڵك فەرمانڕەواییان هەیە، کەوابوو دەتوانن رژێمی سیاسی ئارەزومەندانەی خۆیان هەڵبژێرن، جگە لەمەش گەر "خەڵکی" دەبێ بەدەر لە هەلومەرجی وڵاتەکان ، بەپێی نەتەوایەتی پێناس بکرێن، کەوابوو ئیرادەی نەتەوەیی بۆ بەدەستهێنانی یەکێتی و سەربەخۆی خۆبەخۆ رەوایە، ئەگەرچی ببێتە هۆی کەرتبوونی دەوڵەتە هەبووەکان و تێکچونی رەوایەتی خاندانە سەڵتەنەتیەکان و ببێ بە رێگەپێدەرێك بۆ دەستدرێژی ئازادیخوازانەی نەتەوەیی وڵاتێك بۆسەر وڵاتێکی دی. ناسیۆنالیستی ئیتالی جۆزێف ماتزینی لەم مەسەلەیەدا توندڕەوی کرد و گوتی بڕوای وایە خوداوەند وای ویستووە کە هەر نەتەوەیەك لەناو سنوری سروشتی خۆیدا خاوەن یەکێتی و سەربەخۆی خۆی بێت. جۆن ستیوارت میل لە کتێبی ″حکومەتی هەڵبژێراودا″ بە پەیڕەوکردن لە سروشتی میانڕەوی خۆی، تێڕوانینێکی نەرمتری پێشکەشکرد و نوسی:

“لە هەر شوێنێك هەستی نەتەوایەتی کەمتازۆر بە توندی هەبێت، دەکرێ گریمانە لەسەر پێویستی یەکێتی کۆی تاکەکانی ئەو نەتەوەیە لەژێر حکومەتێکدا و دامەزراندنی حکومەتێکی جیا و تایبەت بە خۆیان دابنرێ. مانای ئەم قسەیە لەوە زیاتر نیە کە بڵێین خەڵکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتێك شایستەی ئەوەن خۆیان مەسەلەی حکومەت بخەن بەلایەکدا. ئەگەر هەر بەشێك لە رەگەزی مرۆڤ لە دیاریکردنی ئەم مەسەلەیەدا ئازاد نەبێت کە دەیەوێت پەیوەندی بە کام کۆمەڵی مرۆڤەوە بکات، ئیدی دیاری نیە لە چ شتێکدا ئازاد دەبێت".

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مافی چارەی خۆنوسینی فەردی و کۆیی هەڵگری گەلێك کێشەی گەورەیە. وێنای دەوڵەت وەك رێکخراوێکی باڵادەست بەسەر هەموو تاکەکان لەناو سنوری وڵاتدا، ناکۆکە لەگەڵ وێنای بەراست زانینی ئازادی هەرکەسێك لە وەفادار مانەوەدا بۆ ئەو وڵاتە. ئەڵبەتە هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە کاریگەری لەوەدا هەبێت کە دەیەوێت چ کەسێك و چۆن حکومەتی بەسەردا بکات، بەڵام ئەمە بەمانای مافی بەشداریکردنە لە وەرگرتنی هەندێك بڕیاری یاساییدا کە تیایدا بوونی چوارچێوەی سیاسی بە بەڵگەنەویست دادەنرێ، نەك بە مانای ئەوەی هەر کەسێك چۆنی ویست رەفتار بکات. کێشەی مافی کۆیی لەمە کەمتر نیە. لە کرداردا هیچ سنورێك بۆ جیابونەوە و دابەشبوون مومکین نیە کە هەرکەسێك لە ناوچەیەکی وەك باڵقاندا، لە وڵاتی ئارەزومەندانەی خۆیدا دابنێ.

بەڵام مەسەلەی سەرەکی یەکلاکردنەوەی ئەو خاڵەیە کە لەرووی مافی چارەی خۆنوسینەوە گروپی نەتەوەیی بریتیە لە چی؟. وەك چۆن کۆنگیەکان مافی چارەی خۆنوسینیان لە کاتانگا سەند، ئەمڕۆش دیسان بە ناوی یەکێتی نەتەوەوە، ناسیۆنالیستەکانی غانا ئەم مافە لە ئاشانتیەکان زەوتدەکەن. ئەگەر ئەڵمانیەکان دەڵێن هەموو خەڵکی

ئەڵمانی زمان، تاکەکانی نەتەوەی ئەڵمانن و لێرەوە دەبێ بەشێکی ئەڵمانیا بن، ئایا لەسەر بناغەی مافی چارەی خۆ نوسینی نەتەوەیی بۆ کەسانی ئەڵمانی دەرەوەی وڵات، هەڵبژاردنێك لەم زەمینەیەدا دەمێنێتەوە؟ ئەگەر نکوڵیان کرد وەك تاکی ئەڵمانی نکوڵیان کردووە یان وەك نائەڵمانی؟ ئەگەر وەك ئەڵمانی، ئایا ئەمە ناکۆك نیە لەگەڵ مافی چارەی خۆ نوسینی کۆی خەڵکی ئەڵمان؟ ئاشکرایە گەر بڕیار بێت بەپێی پێوەری بابەتی وەك زمان لەبارەی نەتەوەوە داوەری بکرێت، بنەمای مافی چارەی خۆنوسین، بەدەر لە ئارەزوەکانی وردە گروپە *subgroup* پەیوەندیدارەکان، سەلمێنەری سیاسەتی پاوانخوازی دەبێت، چونکە گریمانەکە لەسەرئەوەیە بۆ دەربڕینی خواست و ئیرادە، بەشی گەورەتر بنەمایەکی پتەوترە لە بەشی بچوکتر. بەڵام ئەگەر بڕیار بێت نەتەوە لەسەر بناغەی پێوەرە زیهنیەکانی وەك ئیرادەی ژیان لەژێر سایەی حکومەتێکدا، هەڵسەنگێنرێ، ئەوەی کە وردە گروپی ناوبراو، بەشداری نەکردووە، بەروکەش بەڵگەیەك دەبێت بۆئەوەی بڵێین بەشێك نەبووە لەو نەتەوەیە. بەهەمان شێوە رەنگە کەمایەتیەکی نەیار لەناو ئەم گروپە بچوکەدا بانگەشەی شوناسێکی نەتەوەیی جیاواز بکات و بەمشێوەیە تادوایی..ئەگەر کەسێك پێوەرە زیهنیەکان بۆ مافی چارەی خۆ نوسینی کۆمەڵێك قبوڵبکات، ئیدی هیچ بەڵگەیەکی بۆ رێگەگرتن لە گشتگیریان بۆ مافی چارەی خۆ نوسینی فەردی نابێت.

پێوەرە بابەتیەکان زۆرجار قابیلی بەکارهێنان نین لەهەندێك حاڵەتی واقعیدا، بەڵام بنەمایەکی روون بۆ دامەزراندنی دەوڵەت بەشێوەیەکی دروست دەدەن بەدەستەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تیوریەی خاوەنەکانی تاك بە بنەما دادەنێن و بڕوایانوایە کە بنەمای ئەرکە سیاسیەکان رازیبوون و قبوڵکردنی تاکەکەسە، سەلمێنەری ئەو پێوەرانە نیە. بنەمای ﴿رازیبوونی و قبوڵکردنی تاکەکەس﴾دەوری خۆی لە مێژووی ناسیۆنالیزمدا بینیوە. کانت بڕوای وابوو بنەمای هەڵبژاردن و ئۆتۆنۆمی"2" ئەخلاقی پێویستی بەوەیە مرۆڤەکان لەرووی پەیوەندیان بە مەلەکوتی غایات و لەو رووەوە کە خۆیان یاسا بۆ خۆیان دادەڕێژن، ئەرکی سیاسیش لە ئەستۆی خۆیان بنێن و سەروەری و دەسەڵات دەبێت بەجۆرێك کە لە یاساکاندا رەنگی داوەتەوە، سەرچاوە بگرێت و پێرەوی ئەو بێت. بەڵام ناسیۆنالیستانێکی وەك بیریاری ئابوری سیاسی ئەڵمانی، ئادەم مولەر دەستیان خستە ناو بەڵگاندنەکانی کانتەوە بەو شێوەیە کە گوتیان تاك لەگەڵ نەتەوەدا یەك شتە، و رۆحی نەتەوەیی *[Volksgeist]*دەرکەوتی راستەقینەی ئیرادەی هەمیشەی تاکەکەسە تا هەرجۆرە ئارەزویەکی فەردی. بەمشێوەیە ئیرادەی گشتی کە بەبڕوای رۆسۆ و کانت ئۆتۆنۆمی ئەخلاقی فەردی لەگەڵ دەسەڵات و سەروەری سیاسیدا دەگونجان، بوو بە ئامرازێك بۆ بانگەشەی ئەوەی بڕیاری تاکێك کاتێك نەیاری رۆحی نەتەوەیی بێت، بێ هودە و نابابەتیە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ناسیۆنالیزم لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەچەندان نیەتی مرۆڤانە و ئازادیخوازانە ئارایشت کرابوو. فیشتە و ماتسینی لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە تا نەتەوەیەك بەشێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و خاوەن دەسەڵاتدارێتی و یەکێتی پەیدا نەبێت، تاکەکانی خاوەن بایەخی یەکسان و جێی رێز نابن. لەروانگەی خۆشیاندا خاوەن کەرامەت و عیزەتی نەفس نابن. جوانی ناسیۆنالیزم لە ئەفەریقا و ئاسیادا بەشێوەیەکی سەرەکی لەم بیرەوە سەرچاوە

دەگرێت.چارە رەشانێك كە ناچنە ژێر ركێفی سپی پێستەكانەوە، هەستدەكەن كە لەرووی عیزەتی نەفسی خۆشیانەوە بووە، دەبێ خاوەن فەرمانڕەوایانێك بن لە پێست و رەنگی خۆیان كە پەیوەندیان پێیانەوە هەبێت و سەرانی دەوڵەتانی دی مافی حوكمڕانیان لەخۆیان نزمتر نەبینن.

بەڵام هەر كە یەكێتی و سەربەخۆی بەدەست دێت، هەمان دڵەڕاوكێی ئەخلاقی كە ناسیۆنالیزمی بەرهەمهێناوە و هەندێكجار گەورەترین هۆی رەوایەتی بووە، بە ئاسانی دەگۆڕێت بەشێوەیەكی جەسارەت و وێرانكاری و لەخۆ رازیبوونی نەتەوەیی. وەك ئەوەی شارل مۆرا لە فەرەنسادا ناوینا "ناسیۆنالیزمی تەواو" و لە وەسفیدا نوسی كە بریتیە لە "بەدواداچوونی پەتی سیاسەتە نەتەوەییەكان و پاراستنی رەهای سەرجەمێتی و زیادبوونی لەسەرخۆی دەسەڵاتی نەتەوەیی". دەوڵەتی تاك نەتەوەیی چیدی لە ئاسۆی فراوانی مرۆڤایەتیدا سەرنج نادرێ و هەنوكە پێویستی بەهیچ تەوجیهێك جگە لەبوونی خۆی نیە. ناسیۆنالیزم بەم رەنگ و بۆنەوە بێگومان دژی بنەما عەقڵیەكانە و لە وتاری بەرەمزی وەك "خوێن و خاك" دەوروژێت و گەرچی لە روانگەی مێژوونوس و كۆمەڵناسەوە گرنگیەكی زۆری هەیە، بەڵام هەڵەیە بەچاوێك تەماشا بكرێت وەك ئەوەی شایستە رەخنە و هەڵسەنگاندنی جدی عەقڵی بێت.

## پەراوێزەكان

*1)Stanly i. Benn, Nationalism, Encyclopedia,ed.Paull Edwards, 1967.*

2–بە بڕوای كانت تەنها ئەو دەستور یان رێسایە بەهای ئەخلاقی هەیە كە سەرچاوەكەی ئیرادەی ئازادی مرۆڤ بێت و مرۆڤ بە پێی فیترەتی دروستی خۆی، بۆخۆی هەڵبژاردبێت. لێرەوە ئۆتۆنۆمی ئیرادە تەنها كاتێك روودەدات كە ئیرادە پەیڕەوی یاسای دانراو لەلایەن خودەوە، واتە بابەتی رەها، بێت، بەجیا لە پەیڕەویكردن لە یاسا و رێسای دانراو لەلایەن دەرەوە. (و.ف)

## سەرچاوە

ئەم وتارە لەم سەرچاوەی خوارەوە كراوەتە كوردی:

عزت الله فولادوند. خرد در سیاست. طرح نو. ص342

# هاوڵاتیبوون

ئالان تۆرین

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

دیموكراسی بوونی نیە گەر هوشیاری ئینتما بۆ گروپێكی سیاسی لەئارادا نەبێ، كە زۆرجار بریتیە لە ئینتما بۆ نەتەوەیەك، یان كۆمۆنەیەك یان هەرێمێك، یان یەككگرتنێكی فیدراڵی وەك ئەوەی یەكێتی ئەوروپا خەریكە هەنگاوی بۆ دەنێ. دیموكراسی لەسەر بنەمای بەرپرسیارێتیێ هاوڵاتیان لە وڵاتدا دادەمەزرێ. واتە گەر ئەو هاوڵاتیانە هەستیان بە بەرپرسیارێتی نەكرد بەرامبەر حكومەتەكەیان، یان پێیانوابوو ئەو حكومەتە دەسەڵات لە قەڵەمڕەوێكدا پێڕەودەكا كە هی ئەوان نیە یان بەزۆر دروستكراوە، لە كاتێكی وادا فەرمانڕەوایان هیچ ناونیشانێكیان نیە لە نوێنەرایەتیكردندا، ئەو كەسانەش كە فەرمانڕەوایی دەكرێن هیچ هەڵبژاردنێكی ئازادانەیان لەبەردەمدا نیە.

## هاوڵاتیبوون و كۆمیونیتی:

وشەی هاوڵاتیبوون بەشێوەیەكی دەسبەجێ دەمانگەڕێنێتەوە بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی. بەڵام هەروەك (مایكڵ واڵزەر) دەتوانین مانایەكی بەرفراوانتر ببەخشین بە وشەكە، ئەو باس لە مافی ئەندامێتیبوون[1]، یان مافی ئینتما بۆ كۆمەڵێكی دیاریكراو (كۆمیونیتی) دەكا. ئینتمایەكی لەوجۆرە، جا ئیدی بۆ كۆمەڵێكی ئاینی بێت یان كۆمەڵێكی پیشەیی، ئەو ماف و گرەنتیو جیاوازیانە دەسەلمێنێ كە تایبەتمەندی دەبەخشن بە ئەندامانی ئەو كۆمەڵەو پرۆسەی خەمڵینی داخوازیە دیموكراتیەكانیش دەستەبەردەكەن. ئینتما خۆی لەخۆیدا پرسێكی دیموكراتی نیە، چونكە (بۆ نمونە) هیچ جۆرێك لە دیموكراسی لە هوشیاری ئەو سەربازەدا نیە كە ئینتمای بۆ سوپایەكی دیاریكراو هەیە، یان لە هوشیاری ئەو كرێكارەی كۆمپانیای "تۆیۆتا" كە ئینتمای بۆ ئەو دامەزراوە هەیە، بەڵام (بایەخی) ئەندامێتیبوون لەوەدایە كە دژی پاشكۆیەتییەو دەستەبەری ڕستێك ماف دەكا. واتە مەرجێكە لە مەرجە بنەڕەتیەكانی دیموكراسی.

هوشیاریی ئینتماکردن، دوو ڕووی یەکتەواوکاری هەیە. لەلایەکەوە مرۆڤ هوشیارە بەوەی هاوڵاتییە، ئەو هوشیارییەی کە لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسییەوە سەریهەڵداو بەپلەی یەکەم پەیوەست بوو بە ئارەزووی دەربازبوون لە ڕژێمی کۆن و ڕەتکردنەوەی پاشکۆیەتیو گوێرایەڵی. بەڵام لەهەمان کاتدا هوشیاریی ئینتما بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو دژی سنوردارکردنی دەسەڵات نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەواوکەریەتی. چونکە دەسەڵاتی ڕەها، گروپ و تاکەکان بەکاردێنێ وەك کەرەستەو ئامرازگەلێك، نەك وەك چەند گروپێك کە خاوەنی کەسایەتیەکی دەستەجەمیو سەربەخۆییەکی دیاریکراو بن بۆ بەڕێکردنی کاروبارەکانی خۆیان. لەلایەکی ترەوە، ئینتما بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو، لایەنێکی بەرگریکار لە هوشیاری دیموکراتیدا پێکدێنێ گەر بەشداری بکا لە دەربازکردنی تاك لەهەر باڵادەستبوونێکی کۆمەڵگەیی یان سیاسی. چونکە ئینتما بۆ کۆمەڵ (کۆمیونیتی)ی نەتەوەیی پەیوەندیەکی نەپساوەی هەیە بە لەدایکبوونی چەندین دەزگای ئازادەوە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو بەریتانیای مەزن و فەرەنسا، هەروەك چۆن لەهەمان ئەو وڵاتانەدا پەیوەندیەکی نەپساوەی هەیە بە فیکری دیموکراتییەوە.

چەندین وڵات لە جیهاندا هەن کە هێشتا نەگەیشتوونەتە بنیاتنانی یەکگرتنی نەتەوەیی. چونکە لەو وڵاتانەدا تاوەکو ئێستا جیاوازی نێوان گروپە ئیتنیو ئاینیو ناوچەییەکان گرنگترە لە ئینتما بۆ تاکە گروپێکی نەتەوەیی. دۆخێکی لەمجۆرە لە دۆخی ئەو وڵاتانە دەچێ کە یەکبوونی نەتەوەیی توندیان بەخۆیانەوە بینیوە، بەڵام لەبری ئەوەی مرۆڤ شوناسی نەتەوە وەرگرێ، شوناسی گروپە تایبەتەکان و کەمینە دیاریکراوەکان زور بە تۆخی وەردەگرێ. خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو دوو دۆخە لەوەدایە کە تاکەکان لەسەر بنەمای هەلومەرجی گوزەرانیان، وەك ئەوەی کە هەیە، یەکدەگرن... نەك لەسەر بنەمای تێگەیشتنیان بۆ ژیانی دەستەجەمی. لە کۆمەڵگەی دیموکراتیدا سەلماندنی مافی کەمینەکان کارێکی باشە، بەمەرجێ یاسای زۆرینە دانی پێدا بنرێو کەمینە تەنها هۆگری جەختکردن و بەرگریکردن نەبێ لەسەر شوناسی خۆی. چونکە ئەو فرەییە کولتورییە رادیکاڵەی کە (بۆ نمونە) لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەیە، هەرچەندە لەڕووی سیاسییەوە خۆی پێدروستە، بەڵام سەرەنجام دەبێتەهۆی لەناوبردنی ئینتما بۆ کۆمەڵگاو نەتەوە. چونکە ئەگەرهاتو ئەفەریقیە ئەمریکیەکان، یان دانیشتوە ڕەسەنەکانی ئەمریکا، یان وردتر ئافرەتانی ئەو وڵاتە، بەرلەهەر شتێك پەنابەرن بۆ دەستنیشانکردن و خۆجیاکردنەوەی خۆیان لە کەسانی تر بەوجۆرەی کە هەن، ئیدی لە کاتێکی وادا دیموکراسی ناتوانێ پارێزگاری لەخۆی بکا، چونکە کەسانێکی وا دەزگاکان وەك ئامرازگەلێك بۆ خزمەتی نوخبەیەکی باڵادەست، یان بەپێچەوانەوە بۆ خزمەتی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان دەبینن! ئەم چەپڕەوییە کولتورییە لە ئەنجامدا لەگەڵ ئەو رەفتاری دابڕانەدا یەکدەگرێتەوە کە چەپڕەوە سیاسیەکان پێڕەویاندەکرد: (بۆ نمونە) هەندێك لە ماویەکان و ترۆتسکیەکان ساڵی 1968 دەیانوت "هەڵبژاردن تەڵەیەکە بۆ ڕاوکردنی گەمژەکان". بەشێوەیەکی گشتی دروشمێکی لەمجۆرە لە فەرەنسا، هیچ نەبوو جگە لە گوزارشتکردن لەو ترسەی چەپەکان هەیانبوو لە بەرامبەر زۆرینەیەکی زەبەلاحی کۆنەپارێزدا، بەڵام هەر ئەو دروشمە لە ئەڵمانیاو بەتایبەتیش لە

ئیتالیا هانی خەڵکانێکی دا بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆریستی، کە زۆر کەم وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو فەرەنسایان گرتەوە. بەهەرحاڵ دابڕانێکی لەوجۆرە لەگەڵ زۆرینەیەکی خاوەن پێگەدا کە ببێتە هۆی جۆرێك لە گەمەپێکردن و مافداماڵین، مەترسی لەسەر دیموکراسی دروستدەکا، چونکە دیموکراسی پێویستی بە متمانەیەکی دیاریکراو هەیە لەئاست دەنگدانی زۆرینەدا. دیموکراسی کارێکی نەشیاوە گەر نکوڵی لەمافی کەمینەکان بکا، بەڵام بەهەمان شێوە کارێکی نەشیاوە گەر زۆرینە لەلایەن کەمینەکانەوە ڕەتبکرێنەوە، هەروەها ناشێ دیموکراسی جەختبکاتەوە لەسەر ئەو کولتورە دژو کۆمەڵگە (بچوکە) ئاڵتەرناتیڤانەی کە پێگەی خۆیان لەڕێگەی ململانێی کۆمەڵگەییەوە ناسەلمێنن، بەڵکو نکوڵی لە خودی کۆمەڵگە دەکا بەو پێیەی وتەزاو ڕوبەرێکە بۆ درکاندنی باڵادەستی. کەوابێ پێویستە مرۆڤ، بەتوندیو بەهەمان ئەندازە، هەردوو (چەمکی یەعقوبی بۆ هاوڵاتیبوون) و (فرەیی کولتوریی پەڕگیر کە هەموو جۆرە فۆرمێکی هاوڵاتیبوون ڕەتدەکاتەوە) لە هاوکێشەی دیموکراتی دەربهاوێ. چونکە دیموکراسی بوونی نیە گەر داننەنرێ بەو کایە سیاسییەی کە تیایدا ململانێ کۆمەڵگەییەکان گوزارشتیان لێدەکرێو بڕیارەکان بەگوێرەی دەنگدانی زۆرینە لەلایەن هەموو کۆمەڵگەوە ڕەوایەتی وەردەگرن. دیموکراسی پشتئەستورە بە بیرۆکەی ململانێی کۆمەڵگەیی، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نیە ڕەخنەی ڕادیکاڵی لەسەرلەبەری کۆمەڵگە بگیردرێ، لەگەڵ ئەوەشدا نیە کە فرەییەکی کولتوری پەڕگیر لەئارادا بێ. بەهەمان شێوە دیموکراسی دژی ئەو مۆدێلەی چەقگیرییە، کە بەناوی تیۆرێکی پەڕگیری پاشکۆیەتییەوە، دژی هەموو جۆرە چالاکیەکی جەماوەرییەو تەنها بڕوای بە زەبروزەنگ هەیە لە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی ساختەی نۆکەری ئیمپریالیزمدا.

## دەوڵەتی کۆمەڵبەندی (تایەفەگەری) لەدژی دیموکراسی

لە سەردەمانی پێشوودا دیموکراسی پەیوەندییەکی پتەوی بە دەوڵەتی نەتەوەییەوە هەبوو. (سۆشیالیزمی– دیموکراتی)و (دیموکراسی پیشەسازی) لەسەر بنەمای دەستێوەردانی دەوڵەتی نەتەوەیی لە ژیانی ئابوریدا، سنورەکانی خۆیان دیاریکرد. لەدایکبوونی دیموکراسیش لە ئەمریکاو فەرەنسا پەیوەندییەکی نەپساوە، بەڵکو پەیوەندییەکی هاوشوناسی بە نەتەوەو جەختکردنەوە لە سەربەخۆیی و ئازادی نەتەوە هەبوو. بەڵام دیموکراسی مۆدێرن دوچاری چەندین مەترسی بۆتەوە کە لەلایەن فیکری نەتەوەییەوە ئاڕاستەی کراوە بەڵکو زۆرجار لەلایەن ئەو فیکرەوە ڕووبەڕوی لەناوچوون بۆتەوە. کەواتە تەنها هێندە بەس نیە مرۆڤ بڵێ دیموکراسی پێویستی بە بوونی بوارێکی سیاسی یەکگرتوو هەیە، جا ئیتر لە بواری شاردا بێت یان لەبواری دەوڵەتی نەتەوەییدا. واتە دیموکراسی لەگەڵ جۆرە تێگەیشتنێکی دیاریکراوی (دەوڵەت– نەتەوە)دا کۆکەو لەگەڵ جۆرە تێگەیشتنێکی دیکەیدا ناکۆکە. کاتێ دەوڵەت وەك گوزارشتکار لە بوونەوەرێکی دەستەجەمی بەرجەستەدەبێ، جائیدی بونەوەرێکی سیاسی بێ یان کۆمەڵگەیی یان کولتوری نەتەوەیی، یان لەهەمووی ترسناکتر کاتێ وەك گوزارشتکار لە یەزدانێك یان ڕێبازێك بەرجەستەدەبێ کە گەل و نەتەوەو خودی دەوڵەتیش دەبنە چەند کرێگرتەو فەرمانبەرێکی پەتی لە خزمەتی ئەو ڕێبازەدا، لە کاتێکی وادا هیچ شوێنێك بۆ دیموکراسی

نامێنێتەوە، تەنانەت گەر سیاقی ئابوریش ڕێگە بەمانەوەی چەند ئازادییەكی گشتی بدا. دیموكراسی لەسەر بنەمای بەدیهێنانی ئازادانەی بەركەوتی سیاسی دامەزراوە، پشتئەستورە بە سەروەریی میللیو ئازادییە بنەڕەتیەكانی هەڵبژاردن لەئاست هەموو میراتێكی كولتوریدا. پرۆسەی دیموكراتیزەكردن، كۆمەڵ (كۆمیونیتی) دەكاتە كۆمەڵگایەك كە پەیوەستە بە یاساگەلێكەوە، دەوڵەتیش دەكاتە نوێنەری كۆمەڵگەو لەهەمان كاتدا دەیكاتە دەسەڵاتێك كە خاوەنی چەند مافێكی بنەڕەتیی سنورداره. بەڵام تێگەیشتنی پێچەوانە كە دەكرێ بەتێگەیشتنی میللی، یان ئەڵمان وتەنی بە ڤۆڵكش[2] ناوی بەرین (ئەو وشەیەی نازیەكانیش وەك واتایەك بۆ رژێمەكەی خۆیان بەكاریاندەهێنا)، بیرۆكەیەك دەسەپێنێ كە دەڵێ تەنها تاقە یەكێتیەكی بنەڕەتی هەیە كە باڵدەكێشێ بەسەر هەموو هەڵبژاردنەكانی تردا، ئەو حاڵەتەش ڕێگە والادەكا لەبەردەم دامەزراندنی فیكرێكی نەتەوەییدا كە لەگەڵ پرنسیپی دیموكراسیدا ناگونجێ. چونكە لەبری ئەوەی دیموكراسی پەیوەندییەكی راستەوخۆ لەنێوان گەل و میردا (بەچەند پیتێكی گەورە) دابمەزرێنێ، گەلی كردۆتە هاوڵاتیو میریشی كردۆتە دەسەڵاتدار هەروەك رۆسۆ گوزارشتی لێكردوە. گەر ئاوەڵناوی كۆماریی بخەینەپاڵ دەوڵەتێكی لەوجۆرە، ئەوا كۆماریخوازی دەبێتە یەكێك لەو كۆڵەكانەی كە دیموكراسی ناتوانێ دەستبەرداری بێ، تەنانەت گەر ئەو كۆماریخوازییە لە دیموكراسیش هەڵبگەڕێتەوە، كاتێ كۆمەڵگا ملكەچی دەسەڵاتێكی سیاسی دەكاو دەسەڵاتخوازییەكی كۆماریی ئەوتۆ پێكدێنێ كە دواجار چەندین كارەسات و كاری نابەجێ ئەنجامدەدا، (مێژوش دۆخی لەمجۆرەی بەخۆوە بینیوە) هەر لە شۆڕشی فەرەنسییەوە تا شۆڕشی ڕۆشنبیریی چین. هاوڵاتیبوون پێویستی بەبوونی دەوڵەتێكی كۆماریی خاوەن توانای بەرفراوان نیە، بەڵكو پێویستی بە كۆمەڵگەیەكی نەتەوەیی هەیە، واتە پێویستی بە یەكانگیرییەكی پتەوی نێوان كۆمەڵگەی مەدەنیو سیستمی سیاسیو دەوڵەت هەیە. مۆدێرنەی سیاسی، كە لە مێژویەكی كۆنەوە، لە ڕێگەی لەناوبردنی پادشایەتی ڕەهاوە لە بەریتانیای مەزنەوە ئامادەكاریی بۆكراوە، خۆی بەو دەق و بڕیارانە گوزارشتی لەخۆی كردوە كە لەو مێژوە بەدواوە بە بنەڕەتی دانراون، وەك جاڕنامەی سەربەخۆییو جاڕنامەی دەستوری ئەمریكا، یان جاڕنامەی مافەكانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوون لە فەرەنسا. هەروەها مۆدێرنەی سیاسی لەڕێی چەند بڕیارێكی یەكالاكارەوە گوزارشتی لەخۆیكردوە، وەك بڕیاری گۆڕینی ئەنجومەنە گشتیەكانی فەرەنسا بۆ ئەنجومەنێكی نیشتمانی لە 17 ی حوزەیراندا، یان وەك سوێندخواردنی "گەمەی لەپیدەست"[3] لە 20 ی حوزەیرانی 1789دا. كۆمەڵگەی سیاسی بەچەندین فۆرمی جیاواز لە بەریتانیاو ئەمریكاو فەرەنسا ئەوەی سەلماندووە كە كۆمەڵگەیەكە ڕەوایەتی لەخودی خۆی وەردەگرێ، واتە لە سەروەریی میللییەوە، نەك لە یەزدان و نەریتەكان و ڕەگەزەوە.

لەبەرابەر ئەم كەلەپورەدا كە لەچەند ناوچەیەكی جیهاندا پەرەی سەندوە، هوشیارترین نوێنەریشی لە سەدەی بیستەمدا تۆماس مازاریك دامەزرێنەری چیكۆسلۆڤاكیا بوو، كەلەپوری میللیو نەتەوەیی وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا وەك خۆی مایەوە. دەكرا كۆكبوون بسازێنرێ لەنێوان ئەمجۆرە تێگەیشتنەو چەند بزاوتێكی ئازادیی نیشتمانی، بەڵام مەرج نیە ئەم بزاوتانە هەمیشە دیموكراتی بن: ڕەنگە بچێتە

ژێرباری خواستی کارکردن بۆ وەدیهێنانی سەرکەوتنی سەروەریی میللیو خولقاندنی کۆمەڵگەیەکی سیاسی ئازاد. هەروەها ڕەنگە زۆرجار پەیوەست بێ بەخەباتکردنەوە دژی بالادەستیی بیانی، بەناوی (بەرگریکردن) لە زەوی یان زمان یان مێژو یان ئاین. ئەمجۆرە خۆبەستنەوەیەش بەبوونەوەرێکی مێژوییەوە، ناکرێ بەرەو دیموکراسی ببرێ، بەڵکو ئەو شۆڕشانەی کە زادەی بزاوتەکانی سەربەخۆیی نیشتمانی بوون، هەمیشەو بە جۆرێك لە جۆرەکان لەنێوان ئاڕاستەیەکی دیموکراتیو ئاڕاستەیەك بەرەو دیکتاتۆریەتی میللی یان نەتەوەیی لەدابەشبووندا بوون. ئەڵبەتە دیموکراسی تەنها لەوەدا کورتنابێتەوە کە بریتیبێ لە سەرگەرمبوونی هێمنی ئەو وڵاتانەی لەناوەوە گەشەدەکەن، یان لەڕێگەی پەرەدان بە توانا تەکنەلۆجیەکان و کۆنترۆڵکردنی جیهانەوە، خۆیان دەوڵەمەند دەکەن. چونکە دیموکراسی تەنانەت لە دۆخەکانی شۆڕشیشدا ئامادەیی هەیە. بەڵام ئامادەییەکی لەوجۆرە ناکرێ دەستنیشان یان پێناسەبکرێ، گەر زۆر بەڕوونی جەخت نەکرێ لەسەر ئەوەی لکاندنی هەموو پرنسیپێکی ناسیاسی بە کارێکی سیاسییەوە، یان هەموو بەستنەوەیەکی سیاسەت بە پاشکۆیەکی میتاسیاسییەوە، جائیدی یەزدان بێ یان زەمین یان زمان یان ڕەگەز، کارێکە لەگەڵ دیموکراسیدا ناگونجێو ناکۆکە. چونکە ناکرێ بڵێین دیموکراسی سپیپێست یان ڕەشپێست، دیموکراسی مەسیحی یان موسڵمان هەیە. دیموکراسی لە هەموو فۆرمەکانیدا ئازادی هەڵبژاردنی سیاسی دەخاتە سەرو هەموو جۆرە ئیعتباردانانێك بۆ وتەزاکانی ژیانی کۆمەڵگەیی (سروشتی). هەرئەمەش دوامانای پێناسەکردنی خودی دیموکراسییە: ئازادی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان لەلایەن ئەو کەسانەی فەرمانڕەوایی دەکرێن.

هەروەها پێویستە هەروەك لیبراڵیەکان داوابکرێ کە سنورێکی ڕوون بکێشرێ لەنێوان ئەو کۆمەڵگە سیاسییەی کە بۆ دیموکراسی تێدەکۆشێو ئەو دەوڵەتەی (کە بانگەشەی) پەیامداری دەکاو کۆمەڵگە لەناودەبا. ئەمەش وادەخوازێ مرۆڤ ئەمین بێ لەو جیاکارییەی کەسێکی وەك بنیامین کۆنستان خستویەتیە نێوان ئازادی لای کەسانی کۆن و ئازادی لای تازەکان، هەروەها دەبێ مرۆڤ بەرەنگاری ئەو کەسانە ببێتەوە کە هەمیشە قسە لە سەروەری میللی دەکەن بەجۆرێك ئەو سەروەرییە کراوەتە پرنسیپێکی ڕەها کە کەمتر نیە لە ڕەهایەتی یەزدان یان ڕەگەز، هەروەها کۆمەڵگەو ئیرادەی گشتییان کردۆتە هوشیارییەکی دەستەجەمی کە لەسەرو هەر هوشیارییەکی تاکەوەیە. کەواتە ئەوانە لە باشترین حاڵەتدا دەمانگەڕێننەوە بۆ ئازادی کەسانی سەردەمی کۆن کە بریتی بوو لە ملکەچپێکردنی هاوڵاتی بۆ شارەکەی یان بۆ ئاینە نیشتمانیەکەی.

بیرۆکەی هاوڵاتیبوون بانگەوازکردنە بۆئەوەی هەموو مرۆڤێك بەرپرسیارێتی سیاسی لەئەستۆ بگرێ و بەرگری بکا لە ڕێکخستنی کارگێڕیی ژیانی کۆمەڵگەیی، دژی هەر جۆرە لۆجیکێکی ناسیاسی کە هەندێ ئیدعای ئەوە دەکەن "سروشتییە"، جائیدی لۆجیکی بازاڕ بێ یان لۆجیکی بەرژەوەندیی نەتەوەیی بێ. گەر هاوڵاتیبوون بەمشێوەیە پێناسەبکەین، ئەوا ناکرێ بیکەینە هاوشوناسی هوشیاری نەتەوەیی، ئەو هوشیارییەی هەروەك باسمانکرد کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی کەمتر نیە لە کاریگەرییە پۆزەتیڤەکانی لەسەر زەینیەتی دیموکراتی. هاوڵاتیبوون

نیشتمانپەروەریی نیە، هەرچەندە هەندێ وڵات (تا ئێستاش) لەڕووی یاساییەوە جیاکاری ناکەن لەنێوان ئەم دوو وتەزایە: لەکاتێکدا نیشتمانپەروەری واتە ئینتمای مرۆڤ بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی، بەڵام هاوڵاتیبوون مافی بەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی کاروباری کۆمەڵگە دەبەخشێ بەهەموان. نیشتمانپەروەری هاریکاری لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکاندا دەخولقێنێ، بەڵام هاوڵاتیبوون مافەکان دەبەخشێ. بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوەیی وەك بیرۆکەیەکی ئازادیخواز دەمێنێتەوە، تا ئەوکاتەی گوزارشت لە یەکێتی دەوڵەت و هێزە کۆمەڵگەییو کولتورییە چالاکەکان دەکا لە چوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی سیاسی ئازادو نەتەوەیەکی پشتبەخۆبەستوودا. بەڵام هەمان ئەو بیرۆکەیە مەترسی لەسەر ئازادی دروستدەکا، کاتێ دەوڵەت دەکاتە تاقە زامنی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگەو دەسەڵاتێکی شەرعی ئەوتۆی پێدەبەخشێ کە هیچ سنورێکی نیە. مەترسی ملکەچبوونی کۆمەڵگە بۆ دەوڵەت لەو شوێنەوە گەورە دەبێ کە کۆمەڵگەی سیاسی بەتەواوی لە کۆمەڵگەی مەدەنی دەترازێ. لەکاتێکی وادا کۆمەڵگەی سیاسی ناتوانێ خۆی بەدووربگرێ لە تێکەڵاوبوون بە دەوڵەت یان خۆی بەدووربگرێ لەوەی نەبێتە ئامرازی ملپێکەچکردنی هێزە کۆمەڵگەییە چالاکەکان لەبەرابەر دەسەڵاتی خۆیدا. ئەڵبەتە خودی سیاسیەکانیش ئەوەیان وتووە کە ئەو هێزانە هەمیشە دیلی تایبەتمەندی و بەرژەوەندیەکانی خۆیانن. هەربۆیە پێویستە دیموکراسی مۆرکێکی کۆمەڵگەیی هەبێ. بەڵام ناکرێ بەشێوەیەکی چالاکانە بەرگری لە تەواوی مافەکانی مرۆڤ بکرێ گەر زۆر بەڕوونیو لە هەموو دۆخە تایبەتەکاندا ئەو پرۆسەی بەرگریکردنە دژی هێزە باڵادەستەکان بەدیاریکراوی ئەنجام نەدرێ. لە فەرەنسا زەینیەتی دیموکراتی دژی ڕژێمی کۆن هاتەگۆڕێ کۆلۆنە ئینگلیزی و ئیسپانیەکانی ئەمریکاش سەربەخۆیی خۆیان لەڕێی بەرەنگاری دەسەڵاتی مترۆپۆڵە ئابوریو سیاسیەکانەوە چنگکەوت. بەهەمان شێوە بزاوتەکانی کرێکاران تەنها ئەوکاتە مافە کۆمەڵگەییەکانیان بۆ سەلمێنرا کە توانیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هوشیاری چینایەتی، واتە خەبات دژی باڵادەستیەکی کۆمەڵگەیی، ببەستنەوە بە بەرگریکردن لە پرنسیپە گشتیەکانی وەك ئازادیو دادپەروەری. ئیتر هەرچەندە ئەو مافانە لەڕووی ناوەرۆکەوە تایبەت بوون، بەڵام لەڕووی پرنسیپەوە گشتی بوون.

کەلەپوری بەریتانی هەر لە سەرەتاوە، بەتایبەتی لە شۆڕشی 1688 بەدواوە، بەرگری کردوە لە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییە تایبەتەکان. بەڵام مافەکانی هەڵبژاردن لەو وڵاتەدا (ئینگلتەرا) وردە.. وردەو چاکسازی لەدوای چاکسازی گشتێنران، بەجۆرێك ئەو مافانە نەبەخشران بەهەموو پیاوە پێگەیشتوەکان (لەڕووی تەمەنەوە) تاساڵی 1884. لێرەوە ناتوانین لە دیموکراسی تێبگەین تەنها بەو سیفەتە نەبێ کە تەواوکاری جەختکردنە لەسەر مافەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕەها، وەك نمونە ئەمریکیو فەرەنسیەکەی، هەروەها بەو سیفەتەی بەرگریکارە لە مافە تایبەتەکان بە شێوازە ئینگلیزییەکەی. ئەمەش لەلایەکەوە بەدوورگرتنی دیموکراسی نوخبەیە یان دیموکراسی گینرۆ، کە مافی هەڵبژاردن تەنها بۆ کەسێك دابیندەکا کە باج دەدەن، لەلایەکی تریشەوە بەدوورگرتنی هاوشوناساندن (تەماهیپێکردن)ی دیموکراسییە بە دەوڵەتی کۆماری. بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە

هوشیاری نەتەوەیی چالاكی دیموكراتی سەقامگیردەكا، ئەو چالاكیە دیموكراتیەش خۆی لەخۆیدا دەخوازێ كە پەیوەندییە كۆمەڵگەییە فیعلیەكان بەگوێرەی كارێكی ئەوتۆ گۆڕانیان بەسەربێ  كە یەكێتی بسازێنێ لەنێوان پرۆسەی بەرگریكردن لە مافە گشتیەكانی مرۆڤ و سازكردن (تەعبیە)ی گروپە كۆمەڵگەییە فیعلیەكان دژی پاشكۆیەتیو ستەم. بەرگریكردن لە دەوڵەتی كۆماری كە دەنگدانەوەیەكی تایبەتی هەیە فەرەنسا، زۆرجار دژو ناكۆكە لەگەڵ زەینیەتی دیموكراتی، چونكە دەبێتەهۆی بەرگریكردن لە قورسایی دەوڵەت و پایە كۆمەڵگەییەكانی لەسەر هێزە كۆمەڵگەییە چالاكەكان، جائیدی هێزی فەرمانڕەوا بن یان فەرمانڕەواییكراو، تازەگەر بن یان پەراوێزخراو.

## نابوتبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا :

دابەزاندنی لەبەرچاوی سەروەریی ولاّتانی ئەوروپای خۆرئاوا بۆخاتری دەوڵەتێكی ئەوروپی فیدراڵی، كە لە قۆناغی دروستبووندایە، هوشیاری نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانە لاوازدەكاو ڕەنگە مەترسی لەدەستدانی ئەو پێكهاتە كۆكەرەوەیە بێنێتەئاراوە كە بیرۆكەی كۆماریی بەو مەزنیە دروستكرد. بەڵام كەسانێكی زۆریش بەپێچەوانەوە پێیانوایە لاوازیی دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا سەربەخۆیی زیاتری كۆمەڵگەی سیاسیو كۆمەڵگەی مەدەنی دەچەسپێنێ. لەڕاستیدا مەترسی ڕاستەقینە لەوێوە دەستپێدەكا كە كەلێن بخرێتە نێوان بازاڕێكی ئابوری گشتیو كۆمەڵە ناوخۆ داخراوەكان. بۆیە پێویستە بە جۆرێكی تر پێكەوە گونجان بسازێنرێ لەنێوان دەوڵەتێكی ئەوروپی خاوەن ئامرازەكانی سەروەریی وەك: ڕەخنە، توانای بەرپاكردنی ئاشتی یان شەڕو توانای بەڕێوەبردنی كاروباری ئابوری سنوردار لەلایەك و... ژیانێكی كۆمەڵگەیی زۆر هەمەجۆر لەلایەكی ترەوە، وەك سیستەمگەلێكی سیاسی نەتەوەیی كە تەگبیر بكا بۆ تەواوی سیاسەتە كۆمەڵگەییەكان، هەر لە دەستەبەری (زەمان)ی كۆمەڵگەییەوە تا پەروەردە، هەر لە دادوەرییەوە تا پاراستنی خاكی نەتەوەیی، لە وەرگرتنی كۆچبەرانەوە تا بەرگریكردن لە كەمینەكان. بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، ئارەزو دەكەم لەیەك كاتدا خاوەنی رەگەزنامەیەكی ئەوروپی بم و پارێزگاریش لە هاولاّتیبوونی فەرەنسی خۆم بكەم.

ئەوەی لاوازیی دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا دەردەخا، بریتییە لەو جیاكارییەی كە دەخرێتە نێوان دوو شتەوە كە زۆرجار بەناو یەكتردا چوون، ئەو دوو شتەش دەوڵەت و كۆمەڵگەیە كە بیرۆكەی كۆماریخوازی تێكەڵی یەكتری كردوون. ئێستا ئێمە لە هەلومەرجێكدا دەژین ڕۆژ بەڕۆژ لە كۆماریبوون دووردەكەوێتەوە، بەڵام ئەو هەلومەرجە تازەیە نابێ ببێتە ڕێگر لەبەردەم بنیاتنانی كۆمەڵگەی دیموكراتیدا، بەڵكو بەپێچەوانەوە ڕەنگە قەیرانی نیشتمانپەروەری كارێكی باش بێ بۆ پێشكەوتنی هاولاّتیبوون. لەمبارەیەوە چەندین نمونەمان لەبەردەستدایە، چونكە خەڵكانی نەتەوە جیاوازەكان كە لە كۆمەڵی ئەوروپادا هەن، ئێستا دەتوانن بەشداری لە هەڵبژاردنی (هەندێ) لەو ولاّتەدا بكەن كە ماوەیەكی دیاریكراوە لێی دەژین. كەواتە بۆچی ولاّتەكانی تری ئەوروپاش چاو لەو ولاّتانە ناكەن كە مافی دەنگدانیان، بەلانی كەم لە هەڵبژاردنە مەحەلیەكاندا، بەخشیوە بە كۆچبەرەكان، جا سەر بەهەر رەچەڵێك بن بەمەرجێ چەند ساڵێك بەسەر مانەوەیان لەو ولاّتەدا

تێپەڕیبێ؟ ئاماژەکردن بە ڕووە پۆزەتیڤەکانی نابووتبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی مانای ئەوە نیە گەورەیی مێژویی ئەو وڵاتانە لەیادبکەین. بەڵام بانگەشەچیە پەڕگیرەکانی یەکێتی کۆماریی ئەو خاڵە لەیاددەکەن کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگە هەرگیز پەیوەندیەکی یەکتەواوکەری تەواو نەبووە.؟ بەڵکو ئێمە سەردەمانێکی درێژە وا ڕاهاتووین کە دەوڵەتی مەرکەزی لەگەڵ کۆمەڵگە مەحەلیەکاندا پێکەوە ببەسرێنەوە، کە هەندێکیان دەوڵەتۆکە یان زەوی کشتوکاڵی بوون، کاتی خۆی شوێنی دوورەدەست بوون و بەئاستەم ڕێگەوبانیان پێگەیشتوە، کوشتەی دەستی جەنگ و تاڵان و بڕۆو پەتاو باجی زۆرو مافی میریی بوون، کە دروستکراوی دەستی چەند تاقمێکی لێکدابڕاو بوون، لەچەند ڕووبەرێکی بەرتەسکدا، بەجۆرێك ڕێنمایی‌و کاری خۆڕێکخستنیان زۆر دڕەنگ پێگەیشتووە. چونکە کاریگەری‌و گوشارە دەرەکیەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە دەرەوەی ئەو کۆمەڵگەو کولتورانە دەمێننەوە کە بەئاڕاستەی هێشتنەوەی بەرکەوتی تەقلیدی خۆیان کاردەکەن زیاتر لەوەی کار بەئاڕاستەی بەرهەمی گۆڕانکاریەکان بکەن. ئەو هاوسەنگییە هەروەك خۆی مایەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە، دواتریش لەکاتی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی: چونکە تەنها ئەو کاتە بیرۆکەی کۆمەڵگەی نەتەوەیی هاوڕەگەزو یەکگرتو هاتەگۆڕێ. لەڕووی پراکتیکییەوە هیچ کۆدەنگیەك سەبارەت بەو قسەیە دەربارەی یەکێتی نەتەوەیی کامڵ لەئارادا نەبووە، سەرباری ئەوەی وەك دۆمینیك شنابەر دەڵێ ئەو قسەیە لە فەرەنسا هەمیشە کاریگەری خۆی هەبووە. بەڵام لەهەر شوێنێك بووبێ قسەیەکی لەوجۆرە وردە.. وردە فۆرمێکی نەتەوەیی بەبەردا کراوەو هێدی.. هێدی لە وتەزای هاوڵاتیبوون دوورخراوەتەوە. بەڵام حاڵی حازر مەترسی ڕاستەقینە لەوێوە دەستپێدەکا کە لێکگرێدانی دەوڵەت و کۆمەڵگەو کولتور دەسەپێندرێ. چونکە لەکاتێکی وادا، کاتێ کار بۆ سڕینەوەی کەمینەکان دەکرێ‌و هەندێ جاریش ئەو کارە بە ئاگرو ئاسن ئەنجامدەدرێ، هاوڵاتیبوون و دیموکراسی هیچ بوونێکیان نامێنێ. هەر ئەمەشە وادەکا بیرۆکەی هاوڵاتیبوون بیرۆکەیەکی زۆر پێویستی بیری دیموکراسی بێ: چونکە پشتئەستورە بە جیاکردنەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی لە کۆمەڵگەی سیاسی. هەروەها زەمانەتی مافە سیاسی‌و یاساییەکانی هەموو هاوڵاتیان دەکا لەهەر وڵاتێکدا، سەرباری ئینتما کۆمەڵگەیی‌و ئاینی‌و ئیتنییە جیاوازەکانیان، یان هەر ئینتمایەکی تریان.

دیموکراسی لەڕێگەی پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕی ئابوری‌و کولتوری کۆمەڵە تایبەتەکانەوە زیاتر سەقامگیر دەبێ. بەڵام لە بەرامبەریشدا دوچاری مەترسیی مەرگ دەبێتەوە ئەگەر هاتوو ئەو دوالیزمەیە دوچاری تەقینەوەی تەواوی کۆمەڵگەی نەتەوەیی بۆوە. چەندین ناوچەی جیهان ئەوجۆرە کابوسە ترسناکەیان بەخۆوە بینیوە، تەنانەت ناوجەرگەی ئەوروپایشی گرتەوە، کاتێ پاکتاوی ڕەگەزی دژی چەند ناوچەیەکی کرواتیا پێڕەوکرا، بەتایبەتی دژی بۆسنە، بە پێڕەوکردنی زەبروزەنگێکی کەمتریش لەچەند ناوچەیەکی دیکەی یۆگۆسلافیای پێشو. واتە کورتکردنەوەی کۆمەڵگە لە بازاڕداو ملپێکەچکردنی لەئاستی خەونی دەوڵەتی یەکگرتوی هاوڕەگەزدا، دژی دیموکراسییە. ئاڕاستەی دووەمیش بەرەو بابەتی شوێنی ئاینی دەمانبا، وەك کارکردنێك بەو وتە لاتینییەی دەڵێ: "زەویەکەی ئاینەکەیەتی"[(4)]، ئەو

بابەتەی لە سەردەمی ئێزابیل ـی کاسۆلیکییەوە باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشاوە، لەو سەردەمەدا جولەکەکان دەرکران و شارستانیەتی عەرەبی لەناوبرا، تا ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی نانت لەلایەن لویسی چواردەوە ساڵی 1685، پاشان هەموو ئەو قەسابخانەو ڕاگواستن و نەفیکردنانەی کە دژی پرۆتستانت مەزەبەکان پێڕەوکرا بۆ ناوخۆو دەرەوەی فەرەنسا، بەتایبەتی لە ناوچەی سیڤێن.

داخۆ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوە دەربارەی دیموکراسی چ سوودێکی هەبێ؟ گەر لەپێناو بەرگریکردندا نەبێ دژی هەردوو دوژمنە سەرسەختەکەی: شەیدابوونی شوناسی نەتەوەیی‌و ئیتنی‌و ئاینی لەلایەك و.. تەمبەڵی‌و پشتبەستن بەو هێزە ئابوریانەی کە بەرخۆریی جەماوەریی بەرجەستەدەکەن لەلایەکی ترەوە.

زۆرجار لەنێوان کۆماریخوازی‌و دیموکراسیدا شوناسگۆڕکێ ئەنجامدەدرێ، بەشێوەیەکی تایبەتیش ئەم کارە لە ئەمریکاو فەرەنسا ئەنجامدەدرێ، بەم دواییانەش لە ئیتالیا بینیمان کاتێ دیداری ڤیکتۆر ئەمانۆئێل و گاریباڵدی کرایە هێمای هاوپەیمانی نەتەوەیی لەگەڵ زەینیەتی شۆڕشگێڕانەی دیموکراسیدا. ئەم شوناسگۆڕکێیە زیاتر لە ئایدیۆلۆجیاوە نزیکە نەك واقع، تەنانەت زۆرجار دەوڵەتی نەتەوەیی بەگوێرەی زەینیەتێکی دژ بە دیموکراسی پێکهێنراوە، هەر لە ریشیلۆ ـی فەرەنسییەوە تا بۆمیدێن ـی جەزایری. بەڵام پێویستە ئەمڕۆ خەباتێکی دیموکراسی دوولایەنە دژی دەوڵەتی دەسەڵاتگەر لەلایەك و دژی کۆلۆنیالکردنی بازاڕی جیهانی لە سەرانسەری دنیادا لەلایەکی ترەوە پێڕەو بکرێ لەلایەن ئەو هێزە کۆمەڵگەییە چالاکانەوە کە توانای خۆڕێکخستن و بەرگریکردنیان لە ئازادییە تایبەت و گشتیەکان هەیە. پرسی هاوڵاتیبوون واتە بنیاتنانی ئارەزومەند و ئازادانەی ڕێکخستنی کۆمەڵگەیی کە یەکێتی یاسایی‌و هەمەجۆری بەرژەوەندیەکان و ڕێزگرتنی مافە بنەڕەتیەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. هەروەها لەبری شوناسگۆڕکێ لەنێوان کۆمەڵگەو نەتەوەدا وەك لە گەرمەی چرکەساتەکانی سەربەخۆیی ئەمریکا یان شۆڕشی فەرەنسا بینرا، بیرۆکەی هاوڵاتیبوون مانایەکی نوێ‌و دیاریکراوی بەرجەستە بە دیموکراسی دەبەخشێ: کە بریتیە لە بنیاتنانی بوارێکی سیایی بەمانا ڕاستەقینەکەی، بەجۆرێك نە نێودەوڵەتی بێ‌و نە بازاڕییش بێ.

## یەکێك لەناو سیاندا:

دیموکراسی تەنها پرۆسەیەکی پەتیی یەکخستنی ئەو سێ پرنسیپە نیە کە شیمانکردنەوە، بەڵام ئەو سێ پرنسیپەش لای خۆیانەوە تەنها چەند وەسفێك نین بخرێنە پاڵ جۆرێکی دیاریکراوی فەرمانڕەوایی، کە بتوانین سروشتە گشتیەکەی لەسەر ئاستێکی بەرزی ئەبستراکت دیاریبکەین. کەوابێ سروشتی پەیوەندیەکان چۆنن لەنێوان: (یەکەم) سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت، (دووەم) شێوازی نوێنەرایەتیکردن کە پێویستە فەرمانڕەوا سیاسیەکان پێڕەویبکەن و (سێیەم) هاوڵاتیبوون؟ سەرەتا دەبێ بڵێین هەر یەکێك لەم توخمانە لە بەرەنگاربوونەوەی یەکێك لە مەترسیەکاندا دەچێتە سنورێکی سەلبییەوە. یەکەمیان زۆرجار بەرەنگاری ئەو دەوڵەتانە دەبێتەوە کە دەسەڵاتگەر یان تۆتالیتارییە. دووەمیان بەرەنگاری کورتکردنەوەی کۆمەڵگە دەبێتەوە بۆ تەنها چەند بازاڕێك. هەرچی سێیەمیشە بەرەنگاری شەیدابوونی شوناسی کۆمەڵبەندی (تایەفی) دەبێتەوە. بەڵام بەر

لەهەرشتێك پێویستە ئاماژە بەوەبدەین كە ئەم شێوازانەی بەرگری بێهودەن گەر بەو پرنسیپە پێكهێنەرانەی دیكەی دیموكراسی پشئەستور نەبن. چونكە چۆن دەكرێ دەسەڵاتی دەوڵەت سنورداربكرێ بەبێ پەنابردن بۆ پشتیوانی "هێزە كۆمەڵگەییەكان"، هەروەها بەبێ جەختكردنەوە لەسەر سەربەخۆیی كۆمەڵگەو بەرپرسیارێتی كۆمەڵگە؟. ناتوانین بەربگرین بەكورتكردنەوەی دیموكراسی لە بازاڕێكی سیاسی دەركە والأدا گەر لەو سەرەتایەوە دەستپێنەكەین كە دەبێ چەند مافێكی بنەڕەتی لەئارادا بن ملكەچی فەرمانی بازاڕ نەبن، هەروەها گەر بەرگری لە هاولاٌتیبوون نەكەین كە زۆر لە كاروباری بازاڕەوە دوورە. خەباتكردن دژی پەرتبوون و لەتوپەتبوونی كۆمەڵگە پێویستی بە شیكردنەوەی دینامیەتی گشتی كۆمەڵگە هەیە، هەروەها پێویستی بە پرنسیپە كۆكەرەوەكان هەیە. لە دۆخێكی ئاوهادا، یەكبوونی ئەو سێ كۆڵەكە سەرەكییە زیاتر پراكتیكییە نەك تیورییی. ئیدی مەحاڵە بەرگری لەیەكێكیان بەبێ دوانەكەی تریان بكرێ، ئەگەر جیاكاریەكیشمان لەنێوان ئەو سێ جۆرە سانایەی دیموكراسیدا ئەنجامدابێ، ئەوا هۆكارەكەی ناگەڕێتەوە بۆ ئەو گریمانەیەی كە پێیوایە دەكرێ سیستمێكی دیموكراسی هەبێو پشتئەستوربێ بە تەنها یەك پرنسیپ لەو پرنسیپانەی باسمانكردن، بەڵكو مەبەستەكە تەنها بۆ یادهێنانەوەی ئەو ئەزموونە مێژوییە جۆراوجۆرانەیە كە هەریەكەیان بایەخێكی جیاوازو تایبەتی بە گەورەیی بابەتەكە داوە.

گەر وتمان دیموكراسی نایەتەگۆڕێ تەنها لەڕێی پێكەوەتێكەڵكردنی چەند توخمێكی جۆراوجۆرو تەنانەت دژبەیەك نەبێ، ئەوە مەبەستمانە بڵێین: دیموكراسی ئەو خۆرە نیە كە سەرلەبەری كۆمەڵگە ڕووناكدەكاتەوە، بەڵكو بریتیە لەو نێوەندەی كە دەكەوێتە نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگەی مەدەنی. واتە گەر بەلایەكیاندا زۆر بیشكێنێتەوە، ئەوا لەسەر حسابی لایەكەیتر بەهێزیدەكا. ئەم مەسەلەیە خەڵكانی بواری دەستورو بواری یاسا بەگشتی لێیتێدەگەن، باشتر لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی سیاسی كە هەوڵدەدەن پێناسەی رۆحیەتی دیموكراسی بكەن، چونكە دیموكراسی بەرلەهەر شتێك كۆمەڵێك زەمانەت و تەگبیریی ئیجراییە كە ئەڵقەی پەیوندیی نێوان یەكێتی دەسەڵاتی خاوەن ڕەوایەتیو هەمەلایەنیی هێزە كۆمەڵگەییە چالاكەكان دابیندەكا.

ئەم خەوشەی كە بە دیموكراسیەوە دەبینرێ، لەوێوە سەرچاوەی گرتووە كە دیموكراسی تەنها لەڕێگەی خۆبەرهەمهێنان و سەرلەنوێ خۆدروستكردنەوە بوونی هەمیشەیی خۆی دەسەلمێنێ. دیموكراسی بەرلەوەی بیرۆكەیەك بێ زیاتر كارو كردارە. دیموكراسی ئەوكاتە ئامادەیە كە مافەكان بەرگرییان لێبكرێو دانیان پێدابنرێ، ئەوكاتەی كە لەڕێی كۆششكردنەوە بەرەو ئازادی پاساو بۆ دۆخێك لە دۆخەكان بهێنرێتەوە، نەك تەنها لەڕێی گەڕان بەدوای سوودی كۆمەڵگەییو هۆكار دۆزینەوە بۆ تایبەتمەندیی ئەزمونێك لە ئەزمونەكان.

هێزی سەرەكی دیموكراسی لە ئیرادەی هاولاٌتیاندایە بۆ كاركردنی بەرپرسانە لە ژیانی گشتیدا. زەینیەتی دیموكراتی هوشیاریەكی دەستەجەمی پێكدێنێ، بەلاٌم رژێمە دەسەلاٌتگەرەكان بوونی خۆیان لەسەر بنەمای چواندنی هەر مرۆڤێك بە سەركردەیەك لە سەركردەكان یان بە ڕەمزێك لە ڕەمزەكان، یان بە بوونەوەرێكی كۆمەڵگەیی دەستەجەمی، بەتایبەتی

وەك نەتەوە، دادەمەزرێنن. هەندێ کەس سیفەتی دیموکراسی دەخەنەپاڵ بایەخدانی زیاتر بە کاروباری کۆمەڵگەیی نەك بڕیاری سیاسی. کەسانێکی تر بەپێچەوانەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە هاوبەندیی کۆمەڵگەیی، پاشان شوناسی کۆمەڵگەیی، بەشێوازێکی دیموکراتی لەڕێی کاری سیاسییەوە ئەنجامدەدرێ. بەڵام لەڕاستیدا دیموکراسی بەکامڵبوونی وەك یەکی هەردوو پرسەکە دیاریدەکرێ. چونکە بەبێ دیموکراسی بۆشایی نێوان جیهانی دەسەڵات و جیهانی شوناسە دەستەجەمیەکان فراوانتردەبێ. تەنها دیموکراسی دەتوانێ ئەو دوو لایەنە لێك نزیك بکاتەوە کاتێك داخوازیەکانی کۆمەڵگەو دەربەستیو پێداویستیەکانی دەوڵەتیش، پێکەوەو لەیەك کاتدا، دەخاتە ئەستۆی خۆی. ئەمەش جارێکی تر دەمانباتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە یەکتەواوکەرەی کە لەنێوان سێ ڕەگەزە پێکهێنەرەکەی کۆمەڵگەدا هەیە. چونکە لەکاتێکدا هاوڵاتیبوون بەندە بە یەکێتی دەوڵەتەوە، سیفەتی نوێنەرایەتیکردن ئەوە دەخوازێ بایەخی زیاتر بە داواکارییەکانی کۆمەڵگە بدرێ، ئەم پرسە دەخوازێ، لەڕێی بانگەشەکردنەوە بۆ مافە بنەڕەتیەکان، بایەخیکی مەرکەزی بە پرنسیپی سنودراکردنی دەسەلاتی دەوڵەت بدرێ.. چونکە ئەو پرنسیپە، بەتایبەتی لەڕووی داڕشتنەوە، ئەو دوو بازنەیە فراواندەکا کە دیموکراسی هەوڵدەدا لێکیان نزیکبکاتەوە بێ ئەوەی تێکەڵی یەکتریان بکا.

ئەم پەیوەندییە یەکتەواوکەرە ئەو کاتە سەردەگرێ کە سێ توخمە پێکهێنەرەکە، دوو.. دوو، بەشێوازێکی دامودەزگایی پێکەوەگرێبدرێن. بەوجۆرەش دیموکراسی دەبێتە خاوەنی سێ بایەخی دامودەزگایی سەرەکی. یەکەمیان مافە بنەڕەتیەکان دەبەستێتەوە بە پێناسەی هاوڵاتیبوونەوە، ئەمەش ئەو ڕۆڵەیە کە دیموکراسی لەڕێی ئامرازە دەستوریەکانیەوە دەیگێڕێ. دووەمیان ڕێزگرتن لە مافە بنەڕەتیەکان دەبەستێتەوە بە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکانەوە، ئەمەش بابەتی سەرەکی حوکمە یاساییەکانە. هەرچی سێیەمیشە نوێنەرایەتیکردن گرێدەداتەوە بە هاوڵاتیبوونەوە، ئەمەشیان ئەو فەرمانە سەرەکیەیە کە پرۆسەی هەڵبژاردنی پارلەمانی ئازاد پێڕەوی دەکا. لێرەوە مرۆڤ دەتوانێ دەربارەی سیستمێکی دیموکراتی بدوێ کە توخمە دەستوریەکانی، شەرعیو پارلەمانیەکان، کار بۆ خستنەگەڕی سێ پرنسیپەکە دەکەن: سنوردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەت بەناوی مافە بنەڕەتیەکانەوە، نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵگەیی لەلایەن هێزە سیاسییە چالاکەکانەوە، ئینجا هاوڵاتیبوون.

## ئازادی، یەکسانی، برایەتی:

هەربۆیە هەموو ئەو هەوڵو کۆششانە شکست دێنن کە دیموکراسی تەنها لە چەند تەگبیرو ڕەفتارێکدا قەتیس دەکەن، یان تەنها وەك فەرمانڕەواییەکی یاسایی لەقەڵمیدەدەن. ڕەنگە مرۆڤ، وەك ماکس ڤیبەر، ناکۆکیەك لەنێوان مەرجەعیەتی ئەقڵیی خاوەن ڕەوایەتیو مەرجەعیەتی کاریزمیدا بدۆزێتەوە. بەڵام هیچ لەو دوو مەرجەعیەتە گوزارشت لە دیموکراسی ناکەن. هەربۆیە ماکس ڤیبەر ناچاربوو جۆرێك لە دیموکراسی ڕاپرسئامێز وێنابکا کە لەیەك کاتدا مارەکردن سازبدا لەنێوان ڕێزگرتنی یاساو ڕۆڵی سەرکردەی کاریزمی. دیموکراسی دەکەوێتە پنتێکەوە کە هێزەکانی ئازادی کۆمەڵگەییو

ئامرازەکانی یەکخستنی دەستوریو یاسایی یەکتردەبڕن. کاتێ دیموکراسی هەندێ کاری توندوتیژی یان هەندێ لەو گوشارانە ڕەتدەکاتەوە کە زادەی هەڵچوونی داخوازی کۆمەڵگەیین، ئیدی هێندە نابا خۆی دەبێتە ئامرازێکی سەپاندنی فۆرمەکانی دەسەلات. بەلام کاتێ داخوازیە کۆمەڵگەییەکان زاڵدەبن بەسەر یاساکان و ئامرازەکانی دانوستانی دەستوریدا، ئیدی دەسەلاتگەری دەبێتە نزیکترین چارەسەر. واتە ناکرێ دیموکراسی شوناسگۆڕکێ لەگەڵ دەسەلاتی سەرکردەیەك یان پارتێکی میللی یان دەسەلاتی دادوەریدا بکا، بەڵکو پشتئەستورە بە هێزو سەربەخۆیی سیستەمی سیاسی کە بەرژەوەندیو داخوازی زۆرترین هێزی کۆمەڵگەیی چالاك بەرجەستەبکا. واتە گەرمایی بزاوت و ئایدیۆلۆجیەکان، لە هەناوی دیموکراسیدا، تێکەڵ بە ساردیی بنەما یاساییەکان دەبێ.

ئەم خاڵەی کە لە شیکردنەوەکەماندا پێی گەیشتوین، بەر لە سەدەو نیوێك کۆماری فەرەنسا ئاماژی پێداوە کاتێ ئەو دروشمەی بەرزکردەوە کە تەواوی دیموکراتخوازەکان پەنایان بۆ بردوە: "ئازادی، یەکسانی، برایەتی". ئەم دروشمە ئەوە دەسەلمێنێ کە دیموکراسی هیچ پرنسیپێکی سەنترالی نیە، چونکە پێناسەکەی تێکەڵێکە لەهەر سێ پرنسیپەکە. هەربۆیە ئەم دروشمە ڕووبەڕووی ڕەخنەی زۆر بۆتەوە بەوەی دروشمێکە لە رواڵەتدا واقعییە بەلام خۆی لە پرسە گەوهەریەکە دەدزێتەوە. چونکە رژێمێك بەمجۆرە بایەخ ببەخشێتە ئازادیو بیکاتە خەسڵەتێکی هێندە تایبەتمەند بواریش دەڕەخسێنێ بۆ پەرەسەندنی نایەکسانی، بەهەمان شێوەو لەبەرامبەردا، کۆشش لەپێناو هێنانەدی یەکسانیدا لەسەر حسابی وازهێنان لە ئازادی دەگاتە ئەنجام. بەلام ئەوەش ڕاستە کە دیموکراسی بوونی نیە گەر تێکەڵەیەك نەبێ لەو دوو ئامانجە (ئازادیو یەکسانی)، کە بیرۆکەی برایەتی پێکەوە گرێیان دەدا.

تەنانەت دەکرێ ئەم شیکردنەوەیەمان ببێتە ڕاڤەیەك لەسەر ئەو دروشمەی کە مێژو ڕەونەقێکی بێوێنەی پێبەخشیوە. چونکە یەکسانی مانای چیە گەر یەکسانی نەبێ لەنێوان ئەو مافانەی کە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ دەیانهێننەوە یادمان. لەئاست ئەو ستەمەی کە واقعی حاڵ دەیسەپێنێ، پێویستە بانگەشەکردن بۆ یەکسانی لەیەك کاتدا پشتئەستور بێ بە بنەماگەلێکی مەعنەویو سیاسی. هەندێ پێیانوایە مرۆڤەکان هەموویان یەکسانن بەو حوکمەی هەموویان بونەوەری خاوەن ئەقڵن.. بەلام هەندێکی تر ،کە ڕەنگە هەر هەندەکەی پێشوتریش بن، پێیانوایە یەکسانی لەڕێی بەشداریکردن لە پەیمانی کۆمەلایەتیدا یان لەڕێی دامودەزگا کۆمەلایەتیەکانەوە دێتەبوون. هەرچی ئازادییە، لای خۆیەوە هیچ کاریگەرییەکی نامێنێ گەر کۆمەڵگەیەکی فرەڕەنگ و هەمەجۆر نەخاتەوە، کە تیایدا پەیوەندیەکان و ململانێکان و دانوستانەکان و یەکڕازیکردنەکان پێکەوە کۆبکاتەوە. چونکە پرنسیپی نوێنەرایەتیکردن کە دەسەلاتداران هەیانە گوزارشتێکە لەو گوزارشتانەی کە بیرۆکەی ئازادی بەشێوەیەکی گشتی لەخۆی دەگرێ. بەلام برایەتی ڕەنگە بەجۆرێك لەجۆرەکان هاوواتا (مرادف)ی هاولاتیبوون بێ، کە دەکرێ لێرەدا دەستنیشانی بکەین بەوەی بریتیە لە ئینتمای کۆمەڵگەیەکی سیاسی کەخۆی خۆی ڕێکدەخاو چاودێری خۆیشیدەکا، بەجۆرێك هەموو رۆڵەکانی لەیەك کاتدا بەرهەمهێنی کۆمەڵگەی سیاسیو بەرخۆریشن، واتە لەیەك کاتدا بەڕێوەبراو

و یاسادانەریشن. دروشمی "ئازادی، یەکسانی، برایەتی" باشترین پێناسەمان بۆ دیموکراسی پێشکەشدەکا، چونکە توخمگەلێکی سیاسی بەشێوەیەکی فیعلی یەکدەخا لەگەڵ توخمگەلێکی تردا کە سروشتێکی کۆمەڵگەیی و مەعنەوییان هەیە. دروشمەکە بەڕوونی ئەوە دەردەخا کە دیموکراسی، گەر بەڕاستی جۆرێك بێ لە جۆرەکانی سیستەمی سیاسی نەك جۆرەکانی کۆمەڵگە، ئەوە لەو پەیوەندیانەدا بەرجەستەدەبێ کە تاکەکان و ڕێکخستنی کۆمەڵگەیی و دەسەڵاتی سیاسی دایدەمەزرێنن، نەك تەنها دامودەزگاکان و شێوازەکانی کارکردن.

## پەراوێز

(1) *Membership* بەئینگلیزی مانای ئەندامێتیبوون دەگەیەنێ، واتە مرۆڤ ئەندامێك بێ لە گرووپ.

(2) *Volkisch* لە دەقەکەدا بە ئەڵمانی هاتووە، لە "گەل"ەوە وەرگیراوە.

(3) *Le serment du jeu de paume* بەسەرهاتی ئەم سوێندە دەگەڕێتەوە بۆ 20/ حوزەیران/ 1789 کاتێ نوێنەرانی ئەنجومەنە گشتیەکانی فەرەنسا لە ڤەرسای کۆبوونەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا سوێندیان خوارد کۆتایی بە کۆبوونەوەکەیان نەهێنن تا دەستورێك بۆ فەرەنسا دادەڕێژن. ئەو سوێندە بەسوێندی "گەمەی لەپی دەست" ناویدەرکردووە، چونکە کۆبوونەوەی ناوبراو لە هۆڵێکدا گرێدرا کە ئەو گەمە کۆنەی تیا سازدەدرا (و.ع).

(4) *Cujus regio hujus religio* ڕستەیەکی لاتینییە، واتە "زەویەکەی ئاینیەتی".

## سەرچاوە

ألان تورين، ماهي الديمقراطية؟ حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن القبيسى. (ط1" بيروت: دار الساقي، 1995)، ص91–102.

# "کانت" و ڕۆشنگەری

هاشم سالح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ساڵی 1804 "ئیمانوێل کانت"، مەزنترین فەیلەسوف لە مێژوی نوێی خۆرئاواو بگرە لە مێژوی مرۆڤایەتیشدا، ماڵئاوایی لە دنیا کرد.. "کانت" ساڵی 1724 هاتبووە دنیاوە، کەواتە هەشتا ساڵ ژیاوە. تەمەنێکی واش بۆ ئەو سەردەمە زۆر بووە و بەرامبەر بە سەد ساڵی سەردەمی ئێستایە.

ئەم تەمەنە درێژە بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند کە بەرهەمە فەلسەفیە مەزنەکانی لەسەرخۆ تەواو بکات. "کانت" لە ڕوی فەلسەفیەوە ئەگەر بە "نیچە و هیگڵ" بەراورد بکرێت، درەنگ وەختێك پێگەیشت و کامڵ بوو. بۆ نمونە "هیگڵ" شاکارە گەورەکەی خۆی واتە (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح)ی، لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا نوسی و هەرچی "فردریك نیچە"شە، ئەوا (گۆڕانی تراژیدیا)ی بەر لە تەمەنی سی ساڵی نوسی! لە کاتێکدا گەر بهاتبایە و "کانت" بەر لە تەمەنی پەنجا و حەوت ساڵی بمردایە کەس ناوی نەدەبیست، چونکە کتێبە بەناوبانگەکەی (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی) لەو تەمەنەدا نوسی.

زۆرێك هەن پێیان وایە "کانت" ترۆپکی ڕۆشنگەری ئەوروپایە، لەبەرئەوەی توانی ئەقڵانیەت بگەیەنێتە دوا مەنزڵی خۆی و هەروەها زاتی ئەوەشی کرد کە بەشێوەیەکی ڕادیکالانە، فەلسەفە لە تیۆلۆژیای مەسیحی جیا بکاتەوە. ئەم کارەی ترسی خستە دڵی هاوسەردەمەکانیەوە و ئۆقرەی لەبەر برین. ئەمەش مانای وایە کە فیکری ئەو بێ ئەندازە ڕادیکاڵ بووە، بەڵام هەنوکە و دوای تێپەڕبوونی دووسەدە بەسەر مردنیدا بۆ ئێمە فەیلەسوفێکی ئاسایی و بێوەی دێتە پێش چاو، کە کەس نیگەران ناکات (بێگومان ئەمە لە تێڕوانینی ڕۆشنبیرێکی ئەوروپیدا، نەك خۆرهەڵاتی یان ئیسلامی).

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دروست لە سەنگ و قورسایی ئەو و ئەو گۆڕانە گەورەیە بگەین کە لە مێژووی فیکردا دروستی کرد و لەو دابڕنە

فەلسەفیەش حاڵی بین كە لەو ڕۆژگارەدا هێنایە ئارا، پێویستە لە هەلومەرجی سەردەم و زەمانی ئەو ئاگادارببین.

"كانت" بە تەنها فەلسەفەی لە تیۆلۆژیای ئایینی و میتافیزیكای غەیبانی و ئەبستراكت جیانەكردەوە، بەڵكو فەلسەفەشی لەسەر بنەمایەكی ورد و زانستی و تۆكمە دامەزراند. شایەنی باسە كۆی فەلسەفەی "ئیمانوێل كانت"یش، جگە لە تیۆریزەكردن و خوردكردنەوەی ئەو شۆڕشە زانستیە یاخود فیزیای و ماتماتیكیەی ئاراستەی خۆرئاوا جیهانی گۆڕی (مەبەستم شۆڕشی ئیسحاق نیوتنە كە لە دوای گالیلۆ و دیكارت و كیبلەر)ەوە هات، شتێكی تر نییە.

لێرەوە ئەو دەستەواژە بەناوبانگە هات كە دەڵێت: (گەر نیوتن نەبوایە كانت نەدەبوو!).

ئەو شتەی "كانت"ی سەرسامكرد ئەوە بوو كە چۆن: زانستی نوێ بوو بە شتێكی مومكین؟ چۆن چۆنی زانستی فیزیك و ماتماتیك، گەشتنە دۆزینەوەی ئەو ڕێسایانەی ئاراستەی گەردوون دەكەن؟ چۆن مرۆڤ تەنها لە ڕێی ئەقڵی خۆیەوە توانی بگاتە ئەوەی پەی بەو نهێنیانە بەرێت كە لە دنیادا هەیە؟ ئەو پێی وابوو گەیشتنی "نیوتن" بە یاسای كێشكردن، كارێكی سەیر و تاقەت پڕوكێن بووە.

"كانت" بە تەنها فەلسەفەی زانستی پێشكەش بە ئەوروپا نەكرد، بەڵكو هاوكات فەلسەفەی مۆراڵی و تەنانەت فەلسەفەی سیاسیشی بەردەست خستن. باشترین بەڵگەش لەسەرئەوە ئەم كتێبەیە كە ئێستا لەبەردەستماندایە. ئەم كتێبە سێ دەق لەخۆدەگرێت: یەكەمیان بریتییە لە: ئاشتی هەمیشەیی نێوان نەتەوەكان و دووەمیش بەم ناونیشانەیە: چۆن لە دەهلیزەكانی فیكردا سەردەربكەین؟ سێیەم وتاریش بریتییە لە: ڕۆشنگەری چییە؟ هەرسێ دەقەكە لە دوتوێی كتێبێكدا كراونەتە فەرەنسی و خاتوو "فرانسواس برۆست" پێشەكی بۆ نوسیووە.

لێرە بە دواوە چاوێكم لەسەر ئەم كتێبە دەبێت، بۆئەوەی پانۆرامایەكی گشتی دەربارەی بابەتەكە بخەمە ڕوو.. لە كۆی هەرسێ بابەتەكەش، قسە لەسەر ئەو دەقە دەكەم كە تایبەتە بە ڕۆشنگەری. "فرانسواس برۆست" لەو پێشەكیەدا دەڵێت: (ساڵی 1784، واتە سەروەختێك كانت گەیشتە تەمەنی 60 ساڵی و نێوبانگی پەیداكرد و ڕۆشنگەری ئەڵمانی گەیشتە ترۆپك، یەكێك لە ڕۆژنامەكانی شاری بەرلین ئەم پرسیارەی ئاراستەی بیریارانی ئەڵمانیا كرد: ڕۆشنگەری چییە؟ مانای ئەم بزاوتە فیكریە چییە كە تەواوی سەدەی هەژدەی بەخۆیەوە سەرقاڵكرد، بەتایبەتی لە فەرەنسا و ئنگلستان و ئەڵمانیا و بووەمایەی هاتنەئارای عەقڵیەتێكی نوێ؟ ئەم پرسیارە وەكو ڕاپرسیەك وابوو كە ئاراستەی ڕۆشنفكرانی ئەڵمانیا كرابوو). بەر لەوەی "كانت" وەڵام بداتەوە و ڕاوبۆچونی خۆی لەسەر ئەو مەسەلەیە بخاتە ڕوو، هەندێك ڕۆشنبیر وەڵامی خۆیان دابووەوە. سەرنوسەری ئەو ڕۆژنامەیەی پرسیارەكەی كردبوو، هاوڕێی "كانت" بوو، تكای لێكردبوو وەڵام بداتەوە، لەبەرئەوەی تەواوی خوێندەوارانی وڵاتی ئەڵمانیا چاوەڕێی وەڵامی ئەویان دەكرد.. وتم ئەڵمانیا و لە كاتێكدا دەبوو بڵێم پروسیا، لەبەرئەوەی ئەوكات ئەڵمانیایەكی یەكگرتوی وەكو ئەمڕۆ نەبوو، ئەوەی هەبوو وڵاتێكی پارچە پارچە و لێك دابڕاو بوو كە بەسەر دەیان میرنشینی بچكۆلە و دوژمن بەیەك دابەش بوو بوون.

"كانت" وەڵامی ئەو ڕاپرسیە ڕۆژنامەوانیەی دایەوە و وەڵامەكەشی لە دەلاپەڕەیەك تێپەڕی نەدەكرد. ئەمە مانای وایە كە ئەم نوسینەی دەقێكی كورتە بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمە فەلسەفیە مەزنەكانیدا، بەڵام سەرەڕای كورتیشی ئێجگار گرنگە، لەبەرئەوەی گوزارشتە لە تێكەڵبوونی فەیلەسوف بە كێشە و گرفتەكانی سەردەمەكەی خۆی.

بەپێی ئەو بۆچونە تەقلیدی و باوەی هەبوو، فەیلەسوف ئەو كەسە بوو كە لە قولە بەرز و دورەكاندا دەژیا و لە جیهان و كۆمەڵگە دادەبڕاو ئەو شتانەشی دەنوسی كە كەس لێی تێناگات! بێگومان ئەمجۆرە وێناكردنە بۆ فەیلەسوف ڕاست نییە و فەیلەسوفێكی مەزنی وەكو "كانت" ئەم حوكمە نایگرێتەوە، فەیلەسوفێك كە لە ناخەوە هەستدەكات بەوەی بەرپرسیارە لەوەی ڕێبەری مرۆڤایەتی بكات بەرەو ڕوناكی و حەقیقەت.

وەك دەزانرێت دوای بڵاوبونەوەی (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی) ساڵی 1781، هەموو قسەیەكی كە ئەو دەیكرد لە تەواوی وڵاتی ئەڵەمانیا و تەنانەت ئەوروپاشدا دەنگی دەدایەوە.

"میشێل فۆكۆ" پێی وایە "كانت" بە بڵاوكردنەوەی ئەم دەقە گۆڕانێكی لە مێژووی فەلسەفەدا دروستكرد، ئەویش خۆخەریككردنی فەیلەسوفە لەگەڵ كێشە گەورەكانی كۆمەڵگە و سەردەمەكەیدا. ئەو یەكێكە لەوانەی تەواوی كتێبەكانی بە وشەی (ڕەخنە) دەست پێدەكات: (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی، ڕەخنەی ئەقڵی زانستی، ڕەخنەی بەهرەی حوكم).

ئاشكرایە ئەو وتە بەناوبانگە وتەی "كانت"ە كە دەڵێت: (ڕۆژگاری ئێمە ڕۆژگاری ڕەخنەیە و پێویستە هەموو شتێك بەر ڕەخنە بدرێت، تەنانەت قسە و باسی پیاوانی كڵێساش.. ئەوانە نابێت هەر لەسەر و ڕەخنەوە بن، چونكە ئەوە مانای بەكەمگرتنی ئەقڵ و كۆسپ خستنەبەردەم پێشكەوتن و پەردەپۆشكردنی حەقیقەت دەگەیەنێت. كەواتە ڕۆشنگەری مانای ئەوەیە مافی ئەوەمان هەبێت ڕەخنەبگرین، واتە دەست كراوە بین لەوەی زۆر ئازادانە ئەقڵی خۆمان بەگەڕ بخەین و تیۆلۆژیستەكانیش نەتوانن سنوری بۆ دابنێن، ئەو تیۆلۆژیستانەی وەكی سێبەری یەزدان لەسەر زەوی بەسەر سەرمانەوە وەستاون. لە كاتێكدا ئەوانە تەنها مرۆڤن و لە گوناه و هەڵەكردنیش بەدەرنین، ئێستایش كاتی ئەوە هاتووە ئەو دەسەڵاتەیان سنوردار بكەین كە دەرهەق بە ئەقڵ و دەرونی ئینسانەكان بەكاری دێنن، ئەویش لە ڕێگای خستنەڕوی تەفسیرێكی ئەقڵانی بۆ ئایین و پەیامە سەرمەدیەكەی).

لە ڕاستیدا فەلسەفەی ڕۆشنگەری بریتییە لە خوێندنەوەیەكی مێژوویی و ڕەخنەیی و ئەقڵانی تێكستەكانی مەسیحیەت، ئەمەش ئەو خوێندنەوەیەیە كە هەریەك لە "ڤۆلتێر و ژان ژاك ڕۆسۆ" لە فەرەنسا و "لیسینگ و كانت" لە ئەڵەمانیا پێی هەستان. ئەم خوێندنەوە نوێیە بەر ئەو خوێندنەوە كۆن و ڕەگ داكوتراوەی پیاوانی ئایینی مەسیحی كەوت و دەرەنجامی ئەم پێكدادانەش ڕۆشنگەری لێكەوتەوە.

دەبێت بەمجۆرە لەو بزاوتە فیكریە گرنگە بڕوانین كە لە سەدەی هەژدەهەم لە ئەوروپادا تەشەنەی سەند و، بووەمایەی ئەو قەڵەمبازە ژیاریەی كە بۆڕی خۆرهەڵات و جیهانی ئیسلامی پێدایەوە. بەڵام داخۆ دەبێت "كانت" چۆن چۆنی پێناسەی ڕۆشنگەری كردبێت؟

لێرەدا جێی خۆیەتی نمونە بە هەندێك پەرەگرافی کورتی ئەو دەقە بەناوبانگەی بهێنینەوە.. "کانت" هەر لە سەرەتاوە دەنوسێت و دەڵێت: (ڕۆشنگەری دەرچونی مرۆڤە لەو حاڵەتی ئیفلیجی و دەستەوستانیەی کە مرۆڤ خۆی لەمانەوە و بەردەوامێتی بەرپرسیارە. ئیفلیجیش ئەو بارودۆخەیە کە مرۆڤ ناتوانێت ئەقڵی خۆی لە دەرەوەی ڕێبەرایەتی کەسانی دیکە بخاتە گەڕ. مرۆڤی ئیفلیج خۆی لەوە بەرپرسیارە، چونکە هۆیەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ونبونی ئەقڵ، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دەستەوستانی ئەو لە بڕیارداندا و ترسنۆکی لە کارکردن بەو بڕیارانە، بەبێ ڕێبەرایەتی کەسانی تر. کەواتە دروشمی سەرەکی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەوەیە: با هێندە ئازا بیت، بتوانیت ئەقڵت بخەیتە کار).

پاشان "کانت" بۆچونی خۆی لەم بارەیەوە بەشێوەیەکی ڕونتر دەخاتە ڕوو.. لە واقیعدا هەنگاونان لە قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵیەوە بۆ قۆناغی بەرپرسیارێتی و بەرکەماڵی ئەقڵ، هەروا کارێکی ئاسان نییە. ڕەنگە بە قسە ئاسان بێت، بەڵام بە کردەوە زۆر گرانە.. کەسانێك هەن تەنانەت گەر تەمەنیان بگاتە شەست ساڵانیش، باوکانیان وەکو منداڵ سەیریان دەکەن! منداڵی ئەقڵی دڵنیایمان دەداتێ، لەبەرئەوەی مانای وایە کەسێکی تر لەبری ئێمە بڕیار دەدات و لێشی بەرپرسیار دەبێت. کەواتە با بە درێژایی ژیانمان منداڵ بین و گەورە نەبین! ئەمەش ئەو هەڵوێستی دەستەوستانی و ترسنۆکییەیە کە "کانت" سەرکۆنەی دەکات. لەم ڕوانگەیەوە تا هەنوکەش میللەت گەلێك هەن هەر منداڵن و گەورە نەبوون.

ئەگەرچی میللەتانی ئەوروپا لەو قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵیە دەربازبون و بەشێوەیەکی سەربەخۆ بیردەکەنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك ڕەقیب بێت بەسەریانەوە، بەڵام ئەم پرۆسەیە تا ئێستاش لە خۆرهەڵاتدا ڕوی نەداوە. بۆ نمونە بڕوانە حاڵی گەلانی عەرەبی و ئیسلامی کە چۆن لە کاتی داگیرکردنی وڵاتی کوەیتدا چەپڵەیان بۆ "سەدام حسێن" لێداو، لە کاتی کردەوە تیرۆرستیەکانی سەرشاری واشنتۆن و نیۆرکیش لە ئەمریکا کە سی هەزار کەسی پێکەوە تێدا کوژرا، خۆشحاڵیان نیشاندا.

تۆ بڵێی ئەم میللەتانە ڕۆشنگەر بن؟ بێگومان هەلومەرجی ئەم میللەتانە لە حاڵی میللەتی ئەڵەمانی و میللەتانی دیکەی ئەوروپی لە ڕۆژگاری "کانت"دا، ئەگەر خراپتر نەبێت چاکتر نییە. کەواتە زۆر ئاسانە بڵێین: (خەڵکینە ئەقڵ ڕون بن و بەرلەوەی هەڵسوکەوت بکەن و حوکم بەسەر هەرشتێکدا بدەن ئەقڵتان بەکاربهێنن)، بەڵام ئەمە ناکەن، ئەویش لەبەر ئەوەی مێشکیان پڕیەتی لە بیروبۆچونی هەڵە و سەدان ساڵە لە نەزانین و هەژاری و نەهامەتیدا نغرۆبوون. کەواتە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵی ڕزگاری بێت و بگاتە قۆناغی ڕۆشنگەری و کامڵ بوون، پێویستە شەڕێکی بێ ئامان دژ بە خۆیی و هەموو ئەو شتە هەڵە و نادروستانە دەست پێ بکات کە لە سەرەتای تەمەنیەوە لەسەری ڕاهاتووە.

کەواتە ڕۆشنگەری لە دوو قۆناغ پێکدێت: یەکەمیان نێگەتیڤە و دووەم پۆزەتیڤ. سەرەتا پێویستە دەست بە ڕیشەکێشکردنی هەموو ئەو بیروبۆچونە نادروستانە بکەین کە لە دڵ و دەرونتدا چێنراوە و ڕەگی داکوتیوە، ئەمەش پرۆسەیەکی قورس و دژوارە و تەنها ئەو بیریارە مەزنانە دەرهەقی دێن کە ڕێبەرایەتی میللەتەکانیان دەکەن بەرەو ڕوناکی و حەقیقەت، بەڵام میللەتان

پێویستیان بە دەیان ساڵ هەیە بۆ ئەوەی پێبگەن و ئەقڵ ڕون بن.. "کانت" تەواو لەم مەسەلەیە بەئاگابوو، بەڵگەش ئەوەیە کە دوای چەند پەرەگرافێك و لە هەمان دەقدا دەڵێت: (بۆ ئەوەی ڕۆشنگەری بڵاوبێتەوە تەنها شتێکمان پێویستە، ئەویش ئازادییە. مەبەستم لە ئازادیش مافی مرۆڤە لەوەی بە ئاشکرا ئەقڵی لە هەموو بوارەکاندا بەکاربهێنێت، بەڵام هەر کاتێك ئەم وشەیە بەکاردێنم دەبینم لە هەموو لایەك هاوار دەکەن: خەڵکینە عەقڵتان بەگەڕمەخەن! ئەفسەر لە سوپادا دەڵێت: ئەقڵ بەکار مەهێنن، بەڵکو فەرمانەکان جێبەجێکەن و دوای ئەوە ناڕەزایی نیشان بدەن! فەرمانبەری باج دەڵێت: ئەقڵتان بەکارمەهێنن و لە شت مەکۆڵنەوە، بەڵکو باجەکانتان بدەن! قەشەکانی کڵێساش دەڵێن: ئەقڵتان بەکارمەهێنن و چەندوچون مەکەن، بەڵکو بڕوا بێنن! کەواتە لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبینین کۆت و بەند و سنورداركردنی ئازادی هەیە).

بەڵام ئەم هەموو ترسە لە ئازادی بۆ؟ لەبەرئەوەی مانای یاخی بوونی بچوکە لە گەورە و جوتیارە لە دەرەبەگ و هاوڵاتیە لە حوکمڕانی ستەمکار. کەواتە گەورەکان دژی ئازادین، لەبەرئەوەی سەردەمی کۆیلایەتی بۆ ئەوان دەست دەدات و گونجاوە بۆیان. تەنانەت هەندێك میللەت ئەوەندە بە کۆیلایەتی ڕاهاتووە، تەرێز لە ئازادی دەکات! ئەوانەی بۆ ماوەی چەندین سەدە ملکەچی هەمان سستمی پەتریارکی و فیودالی و ئسولی و تیۆلۆژی و ستەمکارن، زاتی ئەوە ناکەن ئەقڵیان بەگەڕ خەن! لێرەوە "کانت" دەڵێت: (جۆش و خرۆشی میللەتانی ئەوروپا بۆ شۆڕشی فەرەنسی، زۆر لە خودی شۆڕشەکە خۆی گرنگتر بوو!). لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی جۆش و خرۆشێکی وا گوزارشت بوو لە خواست و ویستی ئەو میللەتانە، بۆ پێشکەوتن و ئامادەیی نیشاندانیش بۆ ئەوەی باجی ئەو پێشکەوتنە بدەن.

بێگومان دواتر ئەم شۆڕشە لە ڕاستە ڕێگای خۆی لادەدات و پێدەنێتە قۆناغی تیرۆرو تۆقاندن و پاشان پەڕاندنی سەری لویسی شانزە، لە ژێر مەقسەڵە بەناوبانگەکەدا.. هەموو ئەمانە "کانت" یان زۆر خەمبار کرد و بە زیادەڕۆیی دەزانی! بەڵام بڕوای بە بێگەردی ڕوداوی شۆڕش لەق نەبوو، ئەو شۆڕشەی لە هەناوی گەلانەوە هەڵدەقوڵێت. هەروەها بڕوای بە ئایندەی مرۆڤایەتی و ئەگەری بەرەو پێشەوە چونی زیاتر و زۆرتری وەك خۆی مایەوە. دەکرێت تەواوی فەلسەفەی ئەو بە هەوڵێکی بلیمەتانە ناونوس بکەین، بۆ کردنەوە ڕێگای حەقیقەت لەبەردەم ئەو ئینسانانەی ئازار دەچێژن و نەفامن.

"کانت" قوربانی بە ژیانی تایبەتی خۆیدا، لە پێناو ئەوەی خۆی بۆ ئەرکێکی سەرەکی تەرخان بکات کە ئەویش ڕزگار کردنی ڕۆحی مرۆڤایەتیە، لەو کۆت و زنجیرانەی بڕستیان لەبەربڕیووە و خەریکن دەیخنکێنن.

ئەو پێی وابوو ئازادبونی ڕۆح و سەرکەوتنی بەسەر ئەو کۆت و بەندانەی دیلیان کردووە، مەزنترین کارێکە کە هەر فەیلەسوفێك پێی هەستێت و بیکاتە دیارییەك بۆ میللەتەکەی و تەواوی مرۆڤایەتی.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط)، 2004/2/10

www.kikah.com

# ئەگەر شارستانیێتیی نەبێت، ئەی چییە؟

## وەڵامێک بۆ ڕەخنەکان

ساموێل هانتینگتۆن

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

گەرچی دواتر هانتینگتۆن بیرەکانی ناو ئەم وتارەو وتاری پیشووتریشی بەرین کردۆتەوەو کردوویەتی بە کتێبێك و لە ساڵی 1996 دا بە ناوی بەریەککەوتنی شارستانێتییەکانەوە بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام هێشتا وتارە سەرەکییەکەی ساڵی 1991 ی و ئەم وتارەشی کە لە ساڵی 1993دا بڵاوکراوەتەوە، بایەخی خۆیان هەر ماوەو کرۆکی کتێبەکە لەم دوو وتارەدا بە کورتی بەرچاو دەکەوێت. هەروەها گەرچی هەندێك لەو نمونەو ڕوداوانەی باسیان دەکات بەسەرچوون، بەڵام هێشتا گەلێك پێشبینی بەدینەهاتووی تێدا ماوەتەوە کە شایستەی تێرامان و لێوردبوونەوەن. با لەپاڵ ئەو دوو هۆیەدا، دان بەوەشدا بنێین کە ئێمەی کورد هەمیشە درەنگ سەرچاوەکانمان پێدەگات، بەردەوام لە کاتی کۆکردنەوەی کورسیەکاندا دەگەینە ئاهەنگ، وەرگێڕانی وتارەکەمان بە پێویست زانی. هەروەها بیری خوێنەریشی دەهێنینەوە کە کاتی خۆی و لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری مەدەنیەتدا، وتارە سەرەکییەکەی هانتینگتۆنمان لەمەڕ بەیەکداکێشانی شارستانێتی بڵاوکردۆتەوەو دیمانەیەکیشمان لە ڕۆژنامەی ئازادیدا بڵاوکردۆتەوە کە لەسەر هەمان بابەت لەگەڵ هانتینگتۆندا کراوە. هەروەها بە نیازیشین ئەو وتارانەو چەند وتارێکی دیکەی ڕەخنەیی و دژ و پشتیوانی تێزەکەی هانتینگتۆن، هەموویان لە دوو تویی کتێبێکدا کۆ بکەینەوەو بە چاپی بگەیەنین.

وەرگێڕ

کاتێك خەڵك بە جیدی بیر دەکەنەوە، ئەوا بەشێوەیەکی ئەبستراکت[1] بیر دەکەنەوە، بە دوای وێنە ئاسانکراوەکانی واقیعدا دەگەڕێن، ئەوانەی پێیان دەوترێت چەمکەکان، تیورییەکان، مۆدێلەکان، پارادایمەکان[2]. ولیەم جەیمس[3]

دەڵێت، بە بێ ئەم پێكهاتە فیكرییانە، تەنیا "هانیهانییەك هەیە كە گیزەگیزێكی بێزاركەری هەیە". وەكو تۆماس كۆهین لە كتێبە كلاسیكییەكەیدا "بونیادی شۆڕشی زانستیی" پیشانی داوە، پێشكەوتنی زانستی و ڕۆشنبیریی لە توێی وەلاخستنی پارادایمێكەوە دەبێت، كە چیتر لە توانایدا نەماوە ئەو ڕاستییە نوێیانە لێكبداتەوە كە دەدۆزرێنەوە، بۆ ئەوەی پارادایمێكی تر بخرێتە جێگەی كە بتوانێت بەشێوەیەكی ڕەزامەندتر ئەو ڕاستییانە ڕوون بكاتەوە، كۆهین نوسیویەتی "بۆ ئەوەی تیۆرییەك وەكو پارادایمێك قبووڵ بكرێت، پێویستە لە پارادایمەكانی ململانێكەرەكانی باشتر بێت، بەڵام لە ڕاستیدا مەرج نیە هەر هەموو ئەو ڕاستییانە لێكبداتەوە كە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە". بۆ ماوەی چل ساڵ تۆژەران و لێكۆڵەرانی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەكان بە پێی وێنەیەكی زۆر سادەكراوی مەسەلە جیهانییەكان بیریان كردۆتەوەو ڕەفتاریان كردووە، ئەویش پارادایمی جەنگی سارده[4]. جیهان دابەش كرابوو لە نێوانی گروپێكی تا ڕادەیەك دەوڵەمەندو دیموكراسییدا كە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ڕابەرایەتی دەكردن، سەرقاڵی ململانێیەكی سەرانسەریی ئایدیۆلۆجی، سیاسی، ئابوری، هەروەها جاربەجاریش كێشەی سەربازیی، دژی گروپێكی تا ڕادەیەك هەژارتری كۆمۆنیستەكاندا كە یەكێتی سۆڤێت[5] ڕابەریان بوو. بەشی زۆری ئەم ململانێیە لە جیهانی سێهەمدا[6] بەڕێوەچووە كە دەكەوێتە دەرەوەی هەردوو سەربازگەكەوە، كە پێكهاتووە لە وڵاتانێكی هەژاری بێبەریی لە سەقامگیریی سیاسی، تازە سەربەخۆ ببوون و لافی ئەوەیان لێدەدا كە بێلایەنن. پارادایمی جەنگی سارد نەیتوانی هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە كە لە سیاسەتی جیهانییدا ڕوودەدەن.

ئەگەر زاراوەكەی كۆهین بەكاربهێنین، دەڵێین زۆر شت هەبوون لە ڕێسا لایان دەدا، هەروەها چەندان جار پارادایمەكە بیریاران و پیاوانی دەوڵەتی لە پەرەسەندنە سەرەكییەكان نابینا كردووە، لە نمونەی جیابوونەوەی نێوانی چین و سۆڤێت. لەگەڵ ئەوەشدا، وەكو مۆدێلێكی سادەی سیاسەتی جیهانیی، توانیویەتی گرنگترین دیاردەكانی سیاسەتی نێودەوڵەتی لێكبداتەوە، بەجۆرێك هیچ مۆدێلێكی تر ئەوەندەی لەباردا نەبووە. ئەوە خاڵێكی دەسپێكی خۆلێلانەدراو بوو بۆ بیركردنەوە لە مەسەلە جیهانییەكان، تا وای لێهات لە سەرانسەری جیهاندا بوو بە پەسەندترین مۆدێلی جیهانی، بیركردنەوەی نزیكەی دوو نەوەی دەربارەی سیاسەتی جیهانیی رسكاندووە. ڕووداوە دراماتیكییەكانی پێنج ساڵی رابردوو، ئەم پارادایمەی كرد بە نمونەیەكی مێژوویی. بە روونیی پێویستییمان بە مۆدێلێكی نوێ هەیە كە یاریدەمان دەدات بۆ ڕێكخستن و تێگەیشتنی پەرەسەندنە سێنتەرییەكانی سیاسەتی جیهانیی. باشترین نەخشەی سادە بۆ جیهانی دوای جەنگی سارد كامەیە؟

## نەخشەی جیهانی نوێ

بەریەككەوتنی شارستانێتییەكان؟ وتەیەكە بۆ دیاریكردنی توخمەكانی پارادایمی پاش جەنگی سارد. هەروەك هەموو پارادایمێكی تر، پارادایمی شارستانێتییەكان زۆر شتی پێ لێكنادرێتەوە، رەخنەگرانیش بە سانایی توانیویانە ڕووداوی گرنگی وەكو داگیركردنی كوێت لە لایەنی عێراقەوە بە نمونە بهێننەوە كە ئەو پارادایمە حیسابی بۆ نەكردووە (گەرچی پێشبینی ئەوەی كردبوو كە دوای وەدەرنانی عێراق لە كوێت دوای ئاداری

1992 هاوپەیمانێتییەکە دەبێت بە هەڵم)، لەگەڵ ئەوەشدا، وەکو کۆهین ڕوونی کردۆتەوە، ڕووداوە ناپێوانەییەکان نابنە هۆی نوشوستیهێنانی پارادایمەکە. تەنیا خوڵقاندنی پارادایمێکی تر کە بتوانێت راستیی گرنگتر بە زاراوەی سادەو ڕەوانی هاوشێوەی پارادایمەکەی پێش خۆی لێکبداتەوە، دەتوانێت پارادایمی پێشوو ڕەت بکاتەوە (چونکە، لە ئاستێکی بەراوردکاریی پەتیکردنەوەی فیکرییدا، هەمیشە تیۆرییەکی ئاڵۆزتر دەتوانێت شتی زیاتر بگرێتەوە لە چاو تیۆرییەکی سادەتردا). ئەو مشتومڕانەی پارادایمی شارستانێتییەکان لە سەرانسەری جیهاندا وروژاندوونی، پیشانی دەدات کە بە پێوانەیەك لە پێوانەکان بە تەواویی پێکاویەتی، یان بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ واقیعدا دەکات کە خەڵکی دەیبینن، یاخود هێندە لێی نزیك دەبێتەوە بەجۆرێك ئەوانەی قبووڵی ناکەن، ناچارن هێرش بکەنە سەری.

لە کاروباری جیهانییدا، چ گروپاندنێکی وڵاتەکان لە هەموویان گرنگترەو لە هەمووشیان گونجاوترە بۆ تێگەیشتن و بە عەقڵانیکردنی سیاسەتی جیهانیی؟ چیتر وڵاتەکان سەر بە جیهانی ئازاد و بلۆکی کۆمۆنیست، یان جیهانی سێهەم، نین. ڕەنگە دابەشکردنی سادەی دوو جەمسەرییانەی وڵاتەکان بۆ دەوڵەمەند و هەژار، یاخود دیموکراس و نادیموکراس، کەمێك سودی هەبێت، بەڵام شتێکی ئەوتۆ نییە. ئێستا سیاسەتی جیهانیی لەوە ئاڵۆزترە کە بترنجێنرێتە ناو دوو خانەوە. لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە وتارە ئەسڵییەکەدا ڕوونکراونەتەوە، شارستانێتییەکان میراتگری سروشتیی سێ جیهانەکەی جەنگی ساردن. لەسەر ئاستی هەمەکی، زیاتر ڕێی تێدەچێت کە سیاسەتی جیهانیی بگلێتە کێشمەکێش و گوێزانەوەی هاوسەنگییەکانی دەسەڵاتی وڵاتانی سەر بە شارستانێتییە جیاجیاکان. هەروەها لەسەر ئاستی هەندەکی، ڕێی تێدەچێت توندو تیژترین و مەترسیدارترین و درێژخایەنترینی کێشەکان (بە هۆی شێمانەی خەستکردنەوەو تاوسەندنەوە) لە نێوانی دەوڵەتان و گرووپەکانی شارستانێتییە جیاجیاکاندا بن. هەروەك وتارەکە ئاماژەی بۆ کرد، ئەم پارادایمەی شارستانێتییەکان، زۆرێك لە پەرەسەندنە گرنگەکانی ئەم ساڵانەی دوایی کاروبارە نێودەوڵەتییەکان لێکدەداتەوە، بە لەتوپەتبوونی یەکێتی سۆڤێت و یۆگۆسلافیاشەوە، ئەو جەنگەی لە هەرێمە پێشینەکانیاندا لەگەڕدایە، سەرهەڵدانی فێندەمێنتاڵیزمی[7] ئاینیی لە سەرانسەری جیهاندا، کێشمەکێشی ناو روسیا، تورکیا، مەکسیك، لەسەر شوناسەکانیان، کرژیی کێشە ئابورییەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یابان، بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان دژی فشاری خۆراوایی لەسەر عێراق و لیبیا، هەوڵەکانی دەوڵەتە ئیسلامیی و کۆنفۆشیۆسییەکان بۆ بەدەستهێنانی چەکی ناوکیی و هۆیەکانی تەقاندنیان، ڕۆڵی بەردەوامیی چین وەکو دەسەڵاتێکی دەرەکیی گەورە، چەسپانی ڕژێمی دیموکراسیی نوێ لە هەندێك وڵاتداو لە هەندێکی تریشدا نا، هەروەها برەودان بە پێشبڕکێی خۆچەکدارکردن لە ئاسیای خۆرهەڵات.

لەچەند مانگی کەمی دوای نوسینی وتارەکەدا، ئەم ڕووداوانەی خوارەوە سەریان هەڵداوە، کە فیت بۆ پارادایمی شارستانێتییەکان دەگونجێن و لەوانەشە بتوانرایە پێشبینییان بکرێت:

ـ بەردەوامبوونی خەست و چڕی جەنگی نێوانی موسڵمانە کرواتەکان سربەکانی یۆگۆسلافیای[8] پێشوو.

. نوشوستهێنانی خۆرئاوا لە پێشکەشکردنی پشتیوانییەکی مانادار بە موسوڵمانە بۆسنەییەکاندا، یاخود تاوانبارکردنی تاوانکارییەکانی کرواتەکان، بەهەمان ئەو ڕێگایەی تاوانی سربەکانی پێ تاوانبار کرا.

ـ ئامادە نەبوونی روسیا بۆ چوونە پاڵی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاساییش بۆ ئەوەی سربەکانی کرواتیا ناچار بکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ حکومەتی کرواتیدا ئاشتیی بەرقەرار ببێت، هەروەها پێشنیارەکانی ئێران و دەوڵەتە موسڵمانەکانی تر بۆ ئەوەی 18000 سەرباز بنێرن بۆ پاراستنی موسڵمانەکانی بۆسنە.

ـ خەستبوونەوەی جەنگی نێوانی ئەرمینییەکان و ئازەرییەکان، داواکاریی تورکیا و ئێران بەوەی ئەرمینییەکان ئەو ناوچانە تەسلیم بکەنەوە کە داگیریان کردووە، هەروەها بڵاوکردنەوەی هێزە تورکیی و ئێرانییەکان بەدرێژایی سنوری ئازەربایجان، هەروەها هەڕەشەی روسیا لەوەی ئەو کارەی ئێران دەبێتە هۆی زیاتر کرژکردنی رەوشەکەو ئاستێکی مەترسیداری نێودەوڵەتییانەی دەداتێ.

ـ بەردەوامبوونی شەڕو کوشتار لە ئاسیای ناوەڕاست لە نێوانی هێزەکانی روسیاو موجاهیدە ئەفغانییەکاندا کە بە شێوەی پارتیزانیی شەڕیان دەکرد.

ـ بەرەو رووی یەك وەستانەوەی خۆرئاوا بە سەرۆکایەتی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وارین کریستۆفەر، لەگەڵ هاوپەیمانێتی دەوڵەتە ئیسلامیی و کۆنفۆشیۆسییەکان کە پێڕەوی گەرودنێتیی خۆرئاوایان ڕەتدەکردەوە، کە لە ناو کۆنگرەی مافەکانی مرۆڤدا لە ڤیيەننا روویدا.

ـ نەخشەکێشە سەربازییەکانی روسیا و پەیمانی ناتۆ بە تەریبیی یەکتریی تەرکیزیان کردەوە سەر ئەو هەڕەشەیەی لە باشورەوە دێت.

ـ دەنگدانێك کە لەسەر بنەمای شارستانییانە دامەزرابوو، کە ئۆڵۆمپیادی ساڵی 2000 ی بەخشی بە سیدنی نەك پەکین.

ـ فرۆشتنی پێکهاتەکانی رۆکێت لە لایەنی چینەوە بە پاکستان، کە ئەنجامەکەی سەپاندنی سزای ئەمریکا بوو بەسەر چیندا، هەروەها رووبەڕووبوونەوەی نێوانی چین و ئەمریکا لەسەر گریمانەی ئەوەی چین تەکنەلۆجیای ئەتۆمیی بە ئێران فرۆشتبێت.

ـ شکاندنی بڕیاری نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی لە لایەنی چینەوەو تاقیکردنەوەی چەکێکی ناوکی، سەرباری ئەو نارەزاییە زۆرەی ئەمریکا دەریبڕی. هەروەها نائامادەیی کۆریای باکور بۆ بەشداریکردن لە وتووێژی زیاتردا لەسەر بەرنامە ئەتۆمییەکەی.

ـ دەرکەوتنی ئەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا راستەوخۆ بەرامبەری عێراقیش و ئێرانیش، سیاسەتی ئیحتیواکردنی دووسەرەی بەکارهێناوە.

ـ بانگەشەکەی سەرۆکی ئێرانی بۆ بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ چین و هیندستاندا، بۆئەوەی "دوایین وتەی رووداوە جیهانییەکان هی ئێمە بێت".

ـ یاسا نوێیەکەی ئەڵمانیا کە تا رادەیەکی زۆر وەرگرتنی پەناهەندە سنوردار دەکات.

ـ ڕێکەوتنی نێوان سەرۆکی روسیا بۆریس یەڵتسن[9] و سەرۆکی ئۆکرانیا لیۆنارد کراڤچۆك

دەربارەی رەوشی ئوستولەکەی ناو دەریای رەش و چەند مەسەلەیەکی تریش.

ـ بۆردومانکردنی بەغداد لە لایەنی ئەمریکاوە و پشتیوانیکردنی تەواوی حکومەتە خۆراواییەکان لەو کارە، لەگەڵ ئیدانەکردنیدا لە لایەنی نزیکەی هەموو دەوڵەتە موسوڵمانەکانەوە، ئەمەش وەکو نمونەیەکی تری سیاسەتی "بانێکەو دوو هەوا"ی خۆرئاوا.

ـ تۆمارکردنی سودان لە لایەنی ئەمریکاوە لە لیستی دەوڵەتە تیرۆریستەکاندا، دادگایی کردنی شێخ عومەر عەبدولڕەحمان و شوێنکەوتووەکانی بە تۆمەتی "هەڵگیرساندنی جەنگی تۆقاندنی مەدەنی دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا".

ـ بەرەوپێشچوونی دیمەنی کۆتایی وەرگرتنی پۆڵەندا و هینگاریا و کۆماری چیك و سلۆڤاکیا لە ناو ناتۆدا.

ئایا تێڕوانینی "بەیەکداکێشانی شارستانێتییەکان" بە کەڵکی هەموو شتێکی دیاری ناو ئەم جیهانە دێت، کە لە ماوەی ئەم چەند مانگەی ڕابردوودا ڕوویانداوە؟ بێشك نا. بۆ نمونە دەشێت بوترێت ڕێکەوتنی نێوان ڕێکخراوی رزگاریی فەلەسەتین و حکومەتی ئیسرائیل لەمەڕ غەزە و ئەریحا نمونەیەکی دراماتیکییانەی دەرچوونە لە پاراداییمی شارستانێتییەکان، بە مانایەك لە ماناکان واشە. وەلێ ڕووداوێکی ئاوا، دروستی نزیکبوونەوەی شارستانێتی پووچەڵ ناکاتەوە: بەشێوەیەکی تایبەتی لە ڕووی مێژووییەوە گرنگە، چونکە بە ڕاشکاویی لە نێوانی گرووپەکانی دوو شارستانێتی جیاوازدا ڕوویداوە، کە زیاتر لە چوار دەهە لەگەڵ یەکترییدا جەنگاون. ئاگربەست و ڕێکەوتنە سنوردارەکان بەشێکن لە بەیەکداکێشانی نێوان شارستانێتییەکان، وەك چۆن ڕێکەوتنەکانی کۆنترۆڵکردنی چەك لە نێوانی ئەمریکاو سۆڤێتدا، بەشێك بوون لە جەنگی سارد، لە کاتێکدا کە دەتوانرێت گەمارۆی کێشەی نێوانی جولەکەو عەرەب بدرێت، وەلێ بەردەوامیی خۆی هەر هەیە.

مەسەلە نێو شارستانێتییەکان زیاتر و زیاتر جێگەی مەسەلەکانی نێوان زلهێزەکان دەگرنەوە، وەك لوتکەی بابەتەکانی ناو ئەجێندای نێودەوڵەتی. ئەم مەسەلانە بڵاوبوونەوەی چەك (بە تایبەتی چەکە کۆمەڵکوژەکان و هۆیەکانی تەقاندنیان)، مافەکانی مرۆڤ، لەگەڵ رەوکردندا. لەم مەسەلانەدا، خۆراوا لایەنێکەو زۆرینەی شارستانێتییە سەرەکییەکانی تری جیهان لایەنەکەی ترن. سەرەك کلینتۆن لە نەتەوە یەکگرتووەکان داوای کرد هەوڵێکی زیاترو چڕ تر بدرێت بۆ کەمکردنەوەی چەکە ئەتۆمییەکان و چەکە نائاساییەکانی تر، وڵاتە ئیسلامی و کۆنفۆشیۆسییەکان، بەردەوامن لە هەوڵەکانیاندا بۆ بەدەستهێنانی ئەو چەکانە. روسیاش هەڵوێستێکی دوو ڕووانەی هەیە. مەودای ئەو وڵاتانەی مافی مرۆڤ دەپارێزن، لەگەڵ دابەشبوونی نێوان شارستانێتییەکاندا دێتەوە: خۆرئاواو یابان پارێزەرانی چاکی مافی مرۆڤن، ئەمریکای لاتین، هیندستان، رووسیا، هەروەها بەشێك لە ئەفریکا هەندێك لە مافەکانی مرۆڤ دەپارێزن، چین و زۆرێك لە وڵاتە ئاسیاییەکانی تر، لەگەڵ زۆرینەی کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، خراپترین پارێزەری مافی مرۆڤن. بەرزبوونەوەی ڕێژەی رەوکردن لە سەرچاوە ناخۆراواییەکانەوە، بووەتە مایەی نیگەرانیی لە ئەورووپاو ئەمریکاش. هەندێك وڵاتی ئەورووپایی تر بە ئەڵمانیاشەوە کۆت و پێوەندی سەختیان لەسەر رەوکردن داناوە، لەکاتێکدا کە قۆرتەکانی بەردەمی هاتوچۆی خەڵك لە ئەورووپادا بە خێرایی ڕوو لە

نەمانن. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، شەپۆلی بەرفراوانی رەوکردووە نوێیەکان، بوونەتە هۆی گەرەنتی دان بەو بۆچوونەی داوای کۆنترۆڵکردنێکی قایمتر دەکات، سەرباری ئەو راستییەی کە زۆرینەی لێکۆڵینەوەکان پیشانی دەدەن کە ڕەوکردووەکان بەشدارییەکی ئەرێ دەکەن لە ئابوریی ئەمریکادا.

## ئایا ئەمریکا دەکەوێت؟

یەکێك لە وەزیفەکانی پارادایم بریتیە لە رۆشنایی خستنە سەر ئەوەی گرنگە (بۆ نمونە، شێمانەی شاراوەی تەنینەوەی بەریەککەوتنی شارستانییانەی نێوان گرووپەکانی شارستانێتییە جیاجیاکان)، وەزیفەیەکی تریشی بریتیە لەوەی دیاردە ئاشناکان بخاتە ناو تێڕوانینێکی نوێترەوە. رەنگە پارادایمی شارستانێتییەکان، لەم بارەیەوە کاریگەریی لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان هەبێت. ولاّتانی وەکو یەکێتی سۆڤێت و یۆگۆسلاڤیا کە کەوتونەتە سەر هێڵەکانی دابەشبوونی شارستانێتی ڕوو لە لێکهەڵوەشانن. بەشێوەیەکی مێژوویی یەکێتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر دوو پایەی پتەوی کەلتوری ئەوروپایی و دیموکراسیزمی سیاسیی دامەزراوە. ئەم دوانە بەلای ئەمریکاوە دوو جەوهەری بنەڕەتیی بوون و نەوە ڕەوکردووەکان وێنایان کردوون. جەوهەری باوەڕی ئەمریکایی بریتی بووە لە مافی یەکسان بۆ تاکەکان، لەمێژووشدا، ڕەوکردووەکان و گروپە بێزراوەکانیش لە تێکۆشانی خۆیاندا، بۆ مامەڵە لەگەڵکرانی یەکسان لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا، پرەنسیپەکانی ئەم باوەڕەیان بەرز کردۆتەوە. دیارترین و سەرکەوتووترین کار لەم بارەیەوە بریتی بووە لە جولاّنەوەی مافە مەدەنییەکان بە سەرکردایەتی مارتن لۆسەر کینگی بچووك. لە 1950کان و 1960ەکاندا. وەلێ هەرچۆنێك بێت دواتر، داواکارییەکە لە ماڤ یەکسانی تاکەکانەوە گۆڕا بۆ مافی تایبەتی (رەفتاری ئەرێ و پێوانەی هاوتا) بۆ ڕەشپێستەکان و گرووپەکانی تریش. ئەم بانگەشانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ ناتەبان لەگەڵ ئەو پرەنسیپە چەسپیوانەدا کە بنەماکانی یەکێتی سیاسەتی ئەمریکییان پێکهێناوە، ئەوانە بیرۆکەی کۆمەڵگای "رەنگ کوێر" رەت دەکەنەوە کە پێکهاتووە لە تاکە یەکسانەکان، لەبری ئەوە بانگەشە بۆ کۆمەڵگای"رەنگ هوشیار" دەکەن لەگەڵ بوونی هەندێك ئیمتیازی میریی بۆ هەندێك لە گرووپەکان. رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانیش، بە هوشیارییەکی تەریبەوە، دەستیان داوەتە بازاڕگەرمییکردن بۆ ئایدیۆلۆجیای "فرەکەلتوریی" و پێداگرتن لەسەر دیسان نوسینەوەی مێژووی سیاسیی، کۆمەلاّیەتی و ئەدەبیی ئەمریکا، لە گۆشەنیگای گرووپە نائەوروپییەکانەوە. ئەم جولاّنەوەیە لەوپەڕیدا هەوڵ دەدات بۆ بڵندکردنەوەی پایەی سەرکردە نەناسراوەکانی گروپە کەمینەکان بۆ ئاستێکی گرنگیی بگاتە ئاستی باوانی دامەزرێنەر. داواکاریی مافی تایبەتی بۆ گرووپە تایبەتییەکان و فرەیی کەلتوریی و پێکەوە هانی بەریەککەوتنی شارستانێتییەکان دەدەن لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا و هانی ئەوە دەدات کە ئارسەر م. شلیسینگەری بچووك پێی دەڵێت "لێکهەڵوەشاندنی ئەمریکا".

ویلایەتە یەکگرتووەکان تا بێت لە رووی ئەتنیی و رەگەزییەوە زیاتر هەمەڕەنگ دەبێت. ئۆفیسی ئامار وای دەخەملێنێت کە لەگەڵ هاتنی ساڵی 2050 دا، 23٪ ی دانیشتوانی ئەمریکا ئیسپان و 16٪ رەشپێست و 10٪ ئەمریکاییە ئاسیاییەکان

دەبێت. لە رابردوودا، ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ملیۆنان رەوکردووی لە چەندان سەرچاوەی جیاجیای وڵاتانەوە هەرس کردووە، لەبەرئەوەی ئەوانە کەلتوری باوی ئەوروپاییان هەڵگرتەوەو بەپەرۆشەوە باوەشیان کرد بە باوەڕە ئەمریکییەکەدا لەمەڕ ئازادی، یەکسانی، تاکایەتی و دیموکراسی. ئایا ماتێك 50٪ ی دانیشتوان دەبن بە ئیسپانی و غەیرە سپی، ئەم تەرزە هەر بەردەوام دەبێت ؟ ئایا دەتوانرێت رەوکردووە نوێیەکان لەناو ئەم کەلتورە باوەی کەلتوری ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەرس دەکرێن؟ ئەگەر نا، ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان بە راستی بوو بە فرە کەلتور و پێکداکێشانی شارستانێتییەکان لەناوەوە باڵی کێشا، ئایا هەر بە لیبراڵ و دیموکراس دەمێنێتەوە؟ شوناسی سیاسی ویلایەتە یەکگرتووەکان رەگی لەناو ئەو پرەنسیپانەدا داکوتاوە کە بەڵگەنامەکانی دامەزراندنی گوزارشتیان لێکردووە. ئەگەر داماڵینی خۆرئاوایێتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان روویدا، ئایا مانای داماڵینی لە ئەمریکاییبوونیش دەگەیەنێت؟ ئەگەر وابێت و ئەمریکییەکان دەسبەرداری ئەوە بوون بنوسێن بە دیموکراسییە لیبراڵ و ئایدیۆلۆجیا سیاسییە رەگوڕیشە ئەوروپییەکانییەوە، ئەو ویلایەتە یەکگرتووانەی ئێمە دەیناسین چیتر بوونی نامێنێت و شوێنی زلهێزێکی تر دەکەوێت کە لە رووی ئایدیۆلۆجییەوە پێناسە کراوەو خۆی دەبێت بە خۆڵەمێشی مێژوو.

## تۆ بیرۆکەیەکی باشترت لایە؟

رەوتی شارستانێتییانە زۆرێك لە "هانیهانیی گیزەگیزکەری"ی جیهانی دوای جەنگی سارد لێکدەداتەوەو رێکی دەخات، هەر بۆیە ئەم بایەخە زۆری پێدراوە و لە سەرانسەری جیهاندا ئەم هەموو مشتومڕەی لێکەوتۆتەوە. ئایا هیچ پارادایمێکی تر لەوە باشتری پێدەکرێت؟ ئەگەر شارستانێتییەکان نەبن، ئەی چییە؟ وەڵامەکانی ناو *(Foreign Affairs)* بۆ وتارەکەی من هیچ وێنەیەکی ئەڵتەرناتیڤ بۆ جیهان پێشکەش ناکەن، کە قایلمان بکات.

باشترین پێشنیاری ئەوان ئەڵتەرناتیڤێکی ساختە و ناواقیعییە. ئەو ئەڵتەرناتیڤە ساختەیە پارادایمێکی دەوڵەتییانەیە کە ناتەباییەکی تەواو دروستکراو و بێبایەخ لە نێوانی دەوڵەت و شارستانێتیەکاندا بینا دەکات: فوئاد عەجەمی دەڵێت "شارستانێتییەکان کۆنترۆڵی دەوڵەتان ناکەن، بەڵکو دەوڵەتان کۆنترۆڵی شارستانێتییەکان دەکەن" بەڵام ئەوە شتێکی بێمانایە بە زاراوەی کۆنترۆڵ باسی دەوڵەتان و شارستانێتییەکان بکەین. بێشك دەوڵەت هەوڵ دەدات هاوسەنگیی دەسەڵات بپارێزێت، بەڵام ئەگەر ئەمە هەموو کردەی ئەوان بوایە، ئەوا لە کۆتایی 1940 ەکاندا، وڵاتەکانی خۆرئاوای ئەوروپا لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا دژی ئەمریکا یەکیان دەگرت. دەوڵەت بە شێوەیەکی بەرایی وەڵامی هەڕەشە بەرچاوەکان دەداتەوە، ئەوکاتەش وڵاتانی خۆرئاوای ئەوروپا هەڕەشەیەکی ئایدیۆلۆجی و سیاسییان لە خۆرهەڵاتەوە بینی. وەك وتارە ئەسڵییەکەی من باسی لێوە کردووە، شارستانێتییەکان دەوڵەتێك یان زیاتر دەگرنەوە، هەروەها "دەوڵەتی نەتەوەیی وەك بەهێزترین رەگەزی کارا لە کاروباری جیهانییدا دەمێنێتەوە". وەك چۆن لە جەنگی سارددا دەوڵەتە نەتەوەییەکان سەر بە یەکێك لە سێ جیهانەکە بوون، هەرواش سەر بە شارستانێتییەکانن. لەگەڵ رەوینەوەی سێ جیهانەکەدا، دەوڵەتە نەتەوەییەکان زیاتر و زیاتر شوناس و بەرژەوەندیی خۆیان بە

زاراوەكانی شارستانێتی دەكەن، بۆیە ئێستا خەڵك و دەوڵەتانی خۆرئاوای ئەوروپا مەترسییەكی كەلتوریی دەبینن كە لە باشورەوە دێت و جێگەی هەڕەشە ئایدیۆلۆجییەكەی خۆرهەلاّت دەگرێتەوە.

ئێمە لە جیهانی ولاّتانێكدا ناژین كە خەسڵەتی "دەوڵەتە گوشەگیر"ەكانیان هەیە، (بە پێی گوزارشتەكەی عەجەمی) كە هیچ پێوەستێك لە نێوانیاندا نییە. جیهانی ئێمە جیهانی گرووپە بەناویەكداچووەكانە كە لە دەوڵەتان پێكهاتوون، كە بە پلەی جیاجیای مێژوو، كەلتور، ئایین، زمان، جێگەو دامودەزگاكان كۆیان دەكاتەوە. لە ئاستی فراواندا ئەم گرووپبوونانە شارستانێتییەكانن. نكوڵیكردن لە بوونیان بریتیە لە نكوڵیكردن لە بوونی حەقیقەتە بنەڕەتییەكانی مرۆڤ.

ئەڵتەرناتیڤی ناڕاستەقینە بریتیە لە پارادایمی یەك جیهانی كە دەڵێت ئێستا شارستانێتی جیهانی بوونی هەیە یاخود خەریكە لە سالاّنی داهاتوودا دێتە بوون. بێشك ئێستا و هەزارانساڵیش لەمەوبەر خەڵكی خەسڵەتی تایبەتی وایان هەبووە كە مرۆڤ لە چەشنەكانی تر جیادەكەنەوە. ئەو خەسڵەتانە هەمیشە لەگەڵ بوونی كەلتورە زۆر جیاوازەكاندا گونجاون. بیانوی ئەوەی ئێستاكە كەلتورێكی جیهانیی یان شارستانێتییەك دەردەكەوێت، فۆرمی جیاجیا وەردەگرێت، كە هیچیان لەبەر لێوردبوونەوەیەكی سەرپێییشدا خۆیان راناگرن.

یەكەم، بیانوی ئەوەی گوایە هەرەسهێنانی كۆمۆنیزمی سۆڤێتی مانای كۆتایی هاتنی مێژوو و سەركەوتنی جیهانییانەی بیری دیموكراسیی لیبراڵ دەگەیەنێت. ئەم بیانووە بە دەستی بە هەڵەدابردنی ئەڵتەرناتیڤی تاقانەوە دەناڵێنێت. رەگی لەناو گریمانەكەی جەنگی ساردا داكوتاوە كە گوایە تاكە ئەڵتەرناتیڤی كۆمۆنیزم بریتیە لە دیموكراسیی لیبراڵ، پووكانەوەی یەكەمیان مانای بەجیهانیبوونی ئەوەی دووەمیانە. وەڵێ گومان لەوەدا نییە كە چەندان فۆرمی ستەمكاریی و ناسیونالیزم و هەژمونی كۆمپانیاكان و كۆمۆنیزمی بازاڕ (وەكو لە چین) هەن كە هێشتا زیندوون و بە كەڵكی جیهانی ئەمڕۆ دێن. ئەوەی زیاتر گرنگە، هەموو ئەڵتەرناتیڤە ئاینییەكان هەن كە دەكەونە دەرەوەی جیهانی دەركپێكراو بە پێوانەی ئایدیۆلۆجییە جیهانگیرییەكانەوە. لە جیهانی مۆدێرندا، ئایین سێنتەرییە، لەوانەشە هێزی سێنتەریی بێت كە دنەی خەڵك بدات و بیانخاتە گەڕ.ئەوە لە خۆباییبوونێكی ساویلكانەیە وا بزانین لەبەرئەوەی كۆمۆنیزمی سۆڤێتیی هەرەسی هێناوە، ئیتر خۆرئاوا بە هەتا هەتایە براوەیە.

دووهەم، ئەو گریمانەیەش هەیە كە دەڵێت كارلێكی زیاتر، پەیوەندیی، هاتوچۆی زیاتر كەلتورێكی باو بەرهەم دەهێنێت. لەوانەیە لە هەندێك بارودۆخدا ئەمە راست بێت. بەلاّم جەنگەكان بەشێوەیەكی چەندبارە لە نێوانی ئەو كۆمەڵگایانەدا هەڵدەگیرسێت كە ئاستی بەرزی كارلێكردنیان هەیە، كارلێككردنیش بە شێوەیەكی چەندبارە پشتیوانی لە شوناسە هەبووەكان دەكات و بەرگریی، كاردانەوە، رووبەڕووبوونەوە بەرهەم دەهێنێت.

سێهەم، ئەو گریمانەیەش هەیە كە مۆدێرنەو پەرەسەندنی ئابوریی كاریگەرییەكی سازێنەریان هەیەو كەلتورێكی باوی مۆدێرن بەرهەم دەهێنن كە زۆر لەوە دەچێت كە لەم سەدەیەدا لە خۆرئاوا بوونی هەبووە. روونە، كە كۆمەڵگا مۆدێرن، شارنشین، خوێندەوار، دەوڵەمەند، خاوەن پیشەسازییەكان، سیفاتی كەلتوریی هاوشێوەیان

دەبێت کە جیایان دەکەنەوە لە کۆمەڵگا دواکەوتوو، گوندنیشین، هەژار، پێشنەکەوتووەکان. لە جیهانی هاوچەرخدا زۆرینەی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان کۆمەڵگای خۆرئاوایی بوون. بەڵام مۆدێرنەکردن مانای بە خۆرئاواییکردن نییە. یابان، سێنگاپۆرە و سعودیەی عەرەبی مۆدێرن و گەشاوەن، بەڵام بە راشکاویی ئەوانە نا ـ خۆرئاوایین. گریمانەی خۆرئاواییەکان بەوەی پێویستە ئەو گەلانەی تر کە دەبن بە مۆدێرن، وەکو ئێمە یان لێبێت، تۆزێك لە خۆبەزلزانینی خۆراواییەوە هاتووە کە خۆی لە خۆیدا بەریەککەوتنی شارستانێتییەکان روون دەکاتەوە. بەهانەی ئەوەی سلۆڤینییەکان و سربەکان، عەرەب و جولەکەکان، هیندو و موسوڵمانەکان، روس و تاجیکەکان، تامیل و سینهالیزییەکان، تیبتی و چینییەکان، یابانی و ئەمریکییەکان، هەموویان پێکەوە دەگەڕێنەوە بۆ یەك تاکە شارستانێتی جیهانی کە خۆرئاوا پێناسەی کردووە، ئەمە هەڵهاتنە لە رووی حەقیقەت.

شارستانێتییەکی گەردونیی بەرهەمی دەسەڵاتێکی جیهانیی دەبێت. دەسەڵاتی رۆمانی لە ناو سنورە دیاریکراوەکانی جیهانی دێریندا، شارستانێتییەکی جیهانیی خوڵقاند. لە سەدەی نۆزدەیەمدا، دەسەڵاتی خۆرئاوایی لە فۆرمی کۆڵۆنیالیزمی ئەوروپییدا، لەگەڵ هەژمونی ئەمریکایی لە سەدەی بیستەمدا، کەلتوری خۆرئاواییان بە ناو زۆرینەی جیهانی هاوچەرخدا بڵاوکردەوە. کۆڵۆنیالیزمی ئەوروپایی تێپەڕی، هەژمونی ئەمریکایی لە پاشەکشێدایە. ئەمەش داخورانی کەلتوری خۆرئاوایی بە دوادا دێت، چونکە دابونەریتە خۆماڵی و رەگداکوتاوە مێژووییەکان، زمانەکان، باوەڕ و دامودەزگاکان سەرلەنوێ جەخت لە خۆیان دەکەنەوە.

جێی سەرسامییە کە عەجەمی هیندستان وەکو نمونەیەك دەهێنێتەوە بۆ رامالینی دەسەڵاتی مۆدێرنەی خۆرئاوایی. دەڵێت "هیندستان نابێت بە دەوڵەتێکی هیندویی. میراتی جیهانگیرییانەی هیندستان خۆی رادەگرێت". رەنگە وابێت، بەڵام بە دڵنیایی مەیلی زاڵ دوورە لە تێڕوانینەکەی نەهرۆوە دەربارەی جیهانگیرییەکی، سوسیالیست، خۆرئاوایی، دیموکراسی پەرلەمانی، بەرەو کۆمەڵگایەك دەچێت فەندەمێنتاڵیستەکانی هیندوەکان پێکیان هێنابێت. عەجەمی لەسەری دەڕوات و دەڵێت "چینی ناوەڕاستی بەرین داکۆکیی لێدەکات (لە جیهانگیریی)، رژێمەکە بە دەستلێنەدراویی دەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی هیندستان و پایەکەی لە جیهانی مۆدێرنی نەتەوەکاندا، وەکو خۆی بمێنێتەوە". بەراست؟ چیرۆکێکی درێژی نیویۆرك تایمز (23ی سێپتەمبەری 1993) لەم بارەیەوە ئاوا دەستپێدەکات: "بە هێواشی و پلە پلە، بەڵام بە سەرسەختیی لافاوەوە، تووڕەیی روو لە زیادبوونی هیندوەکان بەرەو کەمینە موسوڵمانەکان لە ناو هەڵبژاردەی ئەندامانی چینی ناوەڕاستی تۆکمەو توندوتۆڵدا، بازرگان و ژمێریار و پارێزەر و ئەندازیارەکانی، کە ئەمەش حاڵەتێکی نادڵنیایی بەرامبەری ئایندە دەخوڵقێنێت بەرامبەری ئەوەی ئەم دوو ئایینە بتوانن پێکەوە رێ بکەن" وتارێکی رۆژنامەنوسێکی هیندیی لە تایمزدا (3ی ئۆگۆستی 1993) رۆشنایی دەخاتە سەر رۆڵی چینی ناوەڕاست: "ئەو پەرەسەندنەی زۆر مایەی نیگەرانییە بریتیە لە زیادبوونی ژمارەی گەورە فەرمانبەرانی مەدەنی، رۆشنبیران، هەروەها رۆژنامەنوسان، ئەوانەی دەستیان کردووە بە

ئاخاوتن بە زمانی فەندەمێنتاڵیزمی هیندو، نارەزایی دەردەبڕن لەوەی كەمینە ئاینییەكان، بە شێوەیەكی تایبەتی موسوڵمانەكان، ئارامیان لەبەر بڕیون". خۆشوانت سینگی نوسەر، بە پەژارەوە دەگاتە ئەو بەرەنجامەی لە كاتێكدا دەشێت هیندستان روكارە جیهانگەراكەی خۆی بهێڵێتەوە، "بەڵام چیتر ئەو هیندستانە نییە كە لەماوەی 47 ساڵی رابردوودا ناسیومانە" بەڵكو "رۆحی باو تێیدا رۆحی هیندووە توندڕەوەكان دەبێت". فەندەمێنتاڵیزم لە هیندستان وەك لە كۆمەڵگاكانی تریش، روو لە هەڵكشانەو دیاردەیەكی بەربڵاوی چینی ناوەڕاستیشە.

زمانی دەسەڵاتی خۆرئاوایی، سەرەتای كشانەوەی كەلتوری خۆرئاوایشی بە دوادا دێت. زیادبوونی بێپسانەوەی هێزی ئابوورییانەی دەوڵەتە خۆرهەڵاتی ئاسیاییەكان، وەك كیشوەر مەحبوبانی جەختی لەسەر دەكات، دەبێتە هۆی زیادبوونی هێزی سەربازی، كاریگەریی سیاسیی، هەروەها لەگەڵ جەختكردن لەسەر شوناسی كەلتوریی. هاوڕێیەكی ئەو، ئەم وریاكردنەوەیەی خوارەوەی لەمەڕ مافەكانی مرۆڤ داڕشتووە: پێویستە هەوڵەكانی پێشخستنی مافەكانی مرۆڤ لە ئاسیا، ئاگای لە دابەشبوونی گۆڕاوی هێز بێت لە جیهانی دوای جەنگی ساردا... كاریگەریی خۆرئاوایی لەسەر خۆرهەڵات و باشوری ئاسیا زۆر كورت كراوەتەوە... مەودایەكی زۆر كەمتر ماوە بۆ دانانی مەرج و سزا بۆ ناچاركردنیان تا ملكەچی مافەكانی مرۆڤبن... بۆ یەكەمینجار لە دوای بەخشینی متمانە بە جاڕنامەی مافەكانی مرۆڤ لە ساڵی 1948 دا، وڵاتانێك پلەی یەكەم داگیر دەكەن كە زۆر دێرین نین لە نەریتەكانی جولەكە ـ مەسیحیی و نەریتەكانی یاسای سروشتی: ئەم هەڵوێستە بێوێنەیە پێناسەی یاسایەكی نێودەوڵەتیی نوێ دەكات بۆ مافەكانی مرۆڤ. هەروەها دەرفەتەكانی كێشمەكێشیش چەندبارە دەكاتەوە.

سەركەوتنە ئابوورییەكان متمانەیەكی كەلتوریی زیاتریان بەخشیوە بە خود. دەوڵەتانی خۆرهەڵات و باشوری ئاسیا جیاوازییەكانیان هەرچییەك بێت، زیاتر و زیاتر هۆشیار دەبن بەرامبەری شارستانێتی تایبەتی خۆیان و هەوڵ دەدەن سەرچاوەكانی سەركەوتنی ئابوریی خۆیان ببەنەوە دابونەریت و دامودەزگا تایبەتییەكانی خۆیان. تۆنەكانی رەزامەندیی بەرامبەری خود، كە زۆر سادەو دووڕووشن، كە خەسڵەتی زۆربەی ئەو كۆمێنتە خۆرئاواییانەن لەمەڕ كۆتاییهاتنی جەنگی سارد و هەستی حاڵی حازر بە سەركەوتنی بەها خۆرئاواییەكان، رق و توڕەیی خەڵكی خۆرهەڵات و باشوری ئاسیا دەجۆشێنێت.

بێشك زمان بە نیسبەتی كەلتورەوە سێنتەرییە، عەجەمی و رۆبێرت بارتلی هەردوكیان پێكەوە بەكارهێنانی بەربڵاوی زمانی ئینگلیزیی وەكو بەڵگەیەك بەكاردەهێنن بۆ جیهانێتی كەلتوری خۆرئاوایی (سەرباری ئەوەی نمونە چیرۆكییەكەی عەجەمی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1900). وەلێ، ئایا لە بەرامبەری زمانەكانی تردا، زمانی ئینگلیزی لە گەشەكردندایە یان لە پاشەكشێدا؟ لە هیندستان و ئەفریقیاو شوێنی تریش، زمانە ناوخۆییەكان جێگەی زمانی فەرمانڕەوا كۆلۆنیاڵییەكانیان گرتۆتەوە. تەنانەت كاتێك عەجەمی و بارتلی كۆمێنتەكانی خۆیان دەنوسییەوە، نیوزویك وتارێكی بە ناونیشانی "لێرە چیتر بە ئینگلیزیی نادوێن"، لەمەڕ جێگیرانەوەی زمانی ئینگلیزیی لە زمانی فەرەنسی وەكو زمانی هاوبەش لە هۆنگ كۆنگ. لە پەرەسەندنێكی هاوتەریبدا، ئێستا

سربەکانی بە زمانی خۆیان دەڵێن سربی، نەك سربی - کرواتی، هەروەها بە پیتی سیریلیش دەنوسن کە تایبەتە بە خزمە رووسەکانیان، نەك پیتە خۆرئاواییەکانی دوژمنە کاسۆلیکەکانیان. لە هەمان کاتدا، ئازەربایجان، تورکمانستان، هەروەها ئۆزبەکستانیش لە پیتی سیریلیی ئاغا رووسەکانیانەوە گوێزایانەوە بۆ پیتی خۆرئاوایی خزمە تورکەکانیان. هەر دەربارەی زمان مەیلی بابلییبوون بەسەر جیهانیبووندا زاڵە، ئەمەش بەڵگەیەکی زیاترە بۆ سەرهەڵدانی شوناسی شارستانی.

## کەلتور شتێکە بۆی بمرین

روو بکەیتە هەرکوێ، جیهان لەگەڵ خۆیدا ناکۆکە. ئەگەر جیاوازیی شارستانێتییەکان بەرپرس نەبن لەم کێشمەکێشانە، ئەی کێیە؟ رەخنەگرەکان لە پارادایمی شارستانێتییەکان، لێکدانەوەیەکی باشتریان بەرهەم نەهێناوە بۆ ئەوەی لە جیهاندا روودەدات. بە پێچەوانەوە پارادایمی شارستانێتییەکان، وەڵامدانەوەی هەیە و لە سەرانسەری جیهاندا لە ژێیە هەستیارەکە دەدات. لە ئاسیاشدا، وەك ئەوەی جارێکیان باڵوێزێکی ئەمریکی رایگەیاند "وەکو ئاگری دارستان تەشەنە دەکات". لە ئەوروپا، سەرۆکی کۆمیۆنیتی ئەوروپایی جاك دیلۆر بە راشکاویی پشتیوانیی لە وتەکەی ئەو پارادایمە کردووە "ململانێکانی ئایندە بە چزیسکی فاکتەرە کەلتورییەکان دەتەقنەوە نەك فاکتەرە ئابوریی یان ئایدیۆلۆجییەکان" هەروەها وریاشی کردوینەتەوە لەوەی"خۆرئاوا پێویستی بە پێشخستنی تێگەیشتنێکی قووڵتر هەیە بۆ گریمانە ئاینیی و فەلسەفییەکانی ناو شارستانێتییەکانی تر، هەروەها ئەو رێگایانەی نەتەوەکانی تر بەرژەوەندی خۆیانیانی لێوە دەبینن، ئەمەش بۆ ناساندنی ئەو شتە هاوبەشەی هەمووومان پێکەوە کۆدەکاتەوە". موسوڵمانەکانیش لای خۆیانەوە پێیان وایە "بەیەکداکێشانەکە" بەڵگەیەکە بۆ جیایی و مەشروعییەتی شارستانێتییەکەی خۆیان و سەربەخۆییشی لە خۆرئاوا. شارستانێتییەکان قەوارەی مانادارن و لەگەڵ ئەو شێوازەدا رێکدەکەون کە خەڵك واقیعی پێدەبینن و تێیدا دەژین.

مێژوو کۆتایی نەهاتووە. جیهان یەك دانە نییە. شارستانێتییەکان چەشنی مرۆڤ یەکدەخەن و بەشبەشیشی دەکەن. تەنیا لە رێگای ناسین و ئیعتیراف پێکردنەوە دەتوانرێت دەست بەسەر ئەو هێزانەدا بگیرێت کە بەیەکداکێشانی نێوانی شارستانێتییەکان دروست دەکەن. لە "جیهانی شارستانێتییە جیاجیاکاندا" وەکو وتارەکەم دەرەنجامی کردبوو، پێویستە" هەر یەکێکیان فێری ئەوە ببێت لەگەڵ ئەوانیتردا بوونی هەبێت". دواجار ئەوەی بەلای خەڵکەوە گرنگە ئایدیۆلۆجیای سیاسی یان بەرژەوەندیی ئابوریی نییە. ئیمان و خێزان، خوێن و باوەڕ، ئەوانەن کە شوناسی خەڵکی دیاریی دەکەن و شەڕیان بۆ دەکەن و لە پێناویاندا دەمرن. هەر بۆیەشە بەیەکداکێشانی شارستانێتییەکان جێگەی جەنگی سارد دەگرێتەوەو دەبێت بە دیاردەی سێنتەریی و سیاسەتی جیهانیی، هەر بۆیەشە پارادایمی شارستانێتییەکان لە هەر ئەڵتەرناتیڤێکی تر باشتر خاڵی دەسپێکردن پێشکەش دەکات بۆ تێگەیشتن و بەرەو روووبوونەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی لە جیهاندا روو دەدەن.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

1–ئەبستراکت *abstract* بریتییە لە چەمکێك کە پەیوەندیی بە بابەتێکی بەرجەستەوە نەبێت، بەڵکو گوزارشت لە شتێك بکات، کە تەنیا بە شێوەیەکی هزریی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. ئەم چەمکە لەسەر بنەمای چەند پرەنسیپێکی گشتی یان تیوریی مامەڵەی پێدەکرێت، نەك وەکو نمونەی دیاریکراو.

2–پارادایم *paradigm* لە فەلسەفەی زانستدا، پارادایم بریتیە لە مۆدێلێکی چۆنێتی پەیوەندییکردنی ئایدیاکان بە یەکترییەوە، کە بەشێوەیەکی گشتی پەسەندەو چوارچێوەیەکی گشتی بۆ چەمکەکان پێکدەهێنێت و لە توێی ئەودا لێکۆڵینەوە زانستییەکان وەگەڕدەخرێن. ئەم وشەیە لە وشەی *paradeigma* ی یۆنانییەوە گەردان کراوە، کە مانای "نمونە" دەگەیەنێت.

3–ولیەم جەیمس، *William James (1842-1910)* فەیلەسوفێکی ئەمریکای باکورە، لە نیویۆرك لەدایك بووەو لە نیوهامپشایەر مردووە. برا گەورەی هینری جەیمسی ڕۆماننوسە. خێزانەکەی ڕەوکردووەیەکی ئێرلەندیی بووەو لە ئەمریکا دەوڵەمەند بوون. منداڵیی بە گەڕان و سەفەری ئەوروپا بەسەر بردووە، لە زۆر وڵاتدا و لە زۆر قوتابخانە خوێندوویەتی تا سەرەنجام لە قوتابخانەی هارڤاردی پزیشکی دەوامی کردووە، پاشان وازی لەویش هێناوەو دوای زانای زانستە سروشتییەکان لویس ئاگاسیز کەوتووە و چوون بۆ حەوزی ئەمازۆن و دواتریش سەفەری کردووە بۆ ئەڵمانیا. لە ساڵی 1872 دا دەستی کردووە بە وانە وتنەوەو لەسەر ئەم پیشەیەیان بەردەوام بووە. لە کتێبەکانی: کورتەی سایکۆلۆجیا ـ 1891، ئیرادەی باوەڕ ـ 1897، وێنە جیاجیاکانی ئەزمونی ئاینیی ـ 1902، پراگماتیزم ـ 1907.

4–جەنگی سارد *Cold War*، زاراوەیەکە بەکارهێنراوە بۆ ململانێی پاش جەنگی جیهانیی دووەم لەنێوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو سۆڤێتی جاران و هاوپەیمانەکانیاندا. لەماوەی جەنگی سارددا کە لە ناوەڕاستی چلەکانەوە هەتا کۆتایی هەشتاکان بەردەوام بوو، سیاسەتی نێودەوڵەتی لەسەر قازانج یان زیانی ئەو دووبارستەیە دامەزرابوو، هەروەها ئایدیۆلۆجیای ڕەسمیی خۆشیان لەدونیادا بڵاو دەکردەوە: دیموکراسییەت و سەرمایەداریی لە ئەمریکاو، کۆمۆنیزم و تۆتالیتاریی لە سۆڤێت. هاوپەیمانانی بلۆکی ئەمریکا لەو جەنگەدا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیای خۆرئاوا، یابان، لەگەڵ کەنەدا بوون. هاوپەیمانانی سۆڤێتیش بریتی بوون لە وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەڵات، بولگاریا، چیکۆسلۆڤاکیا، هینگاریا، پۆڵەندە، ئەڵمانیای خۆرهەڵات، لەگەڵ ڕۆمانیا. لەلایەکی تریشەوە کوبا و چین لەو جەنگەدا بەشدار نەبوون و لەگەڵ چەند دەوڵەتێکی تری جیهانی سێهەمدا بەرەی بێلایەنەکانیان *Nonaligned* دروست کردبوو.

5–یەکێتی سۆڤێت، *Union of Soviet* گەورەترین یەکگرتووی دیکتاتۆرییەتی کۆمۆنیزم بوو، دوژمنی گەورەی سیستمە خۆراواییەکان بووەو هەتا ساتە وەختی هەرەسهێنانی لە ساڵی 1991دا، بە شێوەیەکی مەترسیدار ئیدارەی جەنگی ساردی کردووەو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتی جێهێشتووە. یەکێتی سۆڤێت بەسەریەکەوە گەورەترین وڵات بوو لە جیهاندا، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی 1917 بە ڕابەرایەتی لینین، یەکێتییەکە لە دیسەمبەری 1922دا، دامەزرێنراوە.

6–جیهانی سێهەم *Third World* ناونانێکی گشتی ئەو دەوڵەتانەیە کە لە ڕووی ئابورییەوە روو لە پێشکەوتنن. ئەم زاراوەیە لە ماوەی جەنگی ساردا هاتۆتە کایەوە، ئەوکاتەی کە دووبلۆکی دژ بە یەك لە ئارادا بوون، بەمەش زاراوەکە مانای ئەوەی دەگەیاند کە لە ڕووی ئابوری و تەکنەلۆجییەوە، دەوڵەتانی جیهانی سێهەم لە

ئاستی سێهەمدا دێن دوای دوو بلۆكە بەگژیەكدا چووەكە. زاراوەكە یەكەمینجار لە لایەنی فرانز فانونی ماركسیستەوە بەكارهاتووەو زۆرجار لە لایەنی ئەو دەوڵەتانەوە كە دەیانگرێتەوە، بە زاراوەیەكی نێگەتیف دانراوەو كەم بەكاریان هێناوە. هەرچونێك بێت دوای هەرەسهێنانە ئابوریی و سیاسییەكەی یەكێتی سۆڤێت لە كۆتایی هەشتاكان و سەرەتای نەوەدەكاندا، زاراوەكە بە سودمەندیی مایەوە بۆ پێناسەكردنی ئەو دەوڵەتانە، چونكە ئەگەر وانەبێت پۆلاندیان زەحمەت دەبێت. دەوڵەتانی جیهانی سێهەم نزیكەی دوو لەسەر سێی دانیشتوانی جیهانیان گرتۆتە خۆیان، دەكەونە ئەمریكای لاتین ، ئەفریقیا، لەگەڵ ئاسیاوە. لە رووی سیاسیەوە ئەم دەوڵەتانە بە زۆریی لایەنگیری هیچ كام لەو دوو بلۆكی رابردوو نەبوون. حاڵی حازر هەندێك لەو دەوڵەتانە پەیوەندییان كردووە بە جیهانی پێشكەوتووەو هەندێكی تریان وەكو خۆیان ماونەتەوەو ژماریەكیشیان لە ئاستی خۆیان دابەزیون و پەیوەندییان كردووە بە جیهانی چوارهەمەوە.

7–فێندەمێنتاڵیزم *Fundamentalism*، جولانەوەیەكی كۆنسێرڤاتیڤانەیە . واتە كۆنگەرای دژ بەگۆڕانكاریی . لە نێوانی پرۆتستانتەكانی ئەمریكادا سەری هەڵداوە. سەرەتاكەی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدە. ئەم رەوتە جەخت دەكاتە سەر بناغە بنەڕەتییەكانی مەسیحییەت و لەم باوەڕانەی خوارەوەدا كۆیان دەكاتەوە: پارێزراویی و بێ هەڵەیی كتێبی پیرۆز ، لە دایكبوونی یەزدانییانەی عیسای مەسیح لە كچێكی پاكیزەوە، قوربانیدانی مەسیح لەسەر خاچ وەكو كەفارەتێك بۆ هەڵەكانی مرۆڤ، هەروەها زیندووبوونەوەی دووبارەی مەسیح وەكو جەستە و وەكو رۆح و مانەوەی بەزیندوویەتی لە دونیادا، هەروەها سەرلەنوێ زیندووبوونەوەی باوەڕداران لە مەلەكوتی یەزدانییدا. هەروەها ئیسلامەكانیش پێڕەوێكی ریشەگەرایان هەیە كەهاوكات و تۆزێك درەنگتر لەوەی مەسیحییەكان دەستی پێكردووەو لەبنەڕەتدا پشت دەبەستێت بە بیركردنەوەی پێشینەكانی ئیسلام كە لەپاڵ قورئان و سوننەتی پەیامبەری ئیسلامدا، رەفتاری هاوەڵانی پەیامبەر و بۆچوونی زانایانی ئیسلامیش دەگرێتەوە.

8–یۆگۆسلاڤیا *Yugoslavia* دەوڵەتێك بوو لە باشوری خۆرهەڵاتی ئەوروپادا، دەكەونە سەر نیمچەدورگەی بەڵكان. لە ساڵی 1918دا وەك وڵاتێكی شانشین دامەزرێنراوەو هەتا ساڵی 1941ی خایاندووەو لەو ساڵەدا ئەڵمانیای نازی داگیری كردووەو تا ساڵی 1945 لە ژێر دەستیدا ماوەتەوە. پاشان لە ساڵی 1945 ەوە هەتا ساڵی 1991 بە سیستمێكی فیدراڵەوە دامەزراوەتەوە و لە شەش كۆمار پێكهاتبوو: بۆسنیاو هەرزەگۆڤین (زۆرجار بە تەنیا پێی دەوترا كۆماری بۆسنە)، كرواتیا، ماسیدۆنیا، مۆنتێنێگرۆ، سربیا، سلۆڤینیا. هەروەها لەناو كۆماری سربیادا دوو هەرێمی ئۆتۆنۆم هەبوون: ڤۆجیڤۆدۆنیاو كۆسۆڤۆ. پایتەختی یۆگۆسلاڤیا بەلگراد بوو.

9–یەڵتسن *Yeltsin*، بۆریس نیكۆلایڤیچ *Boris Nikolayevich (1931)* سەركۆماری روسیا بووە، ماوەیەكی كەم پێش هەرەسهێنانی یەكێتی سۆڤێت لە ساڵی 1991 دا، هەڵبژێردراوەو هەتا ساڵی 1999 لە فەرمانڕەواییدا ماوەتەوە.

## سەرچاوە

*Foreign Affairs*

*November/December 1993*

# سەرەتاكانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازیی

-2-

## مافی سروشتی و ئایدیۆلۆجیا

ماكس هۆركهایمەر

لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

ماكیاڤیللی، بەو پێیەی یەكەم فەیلەسوفی مێژووە لە سەردەمی نوێدا، پێشەنگی كۆمەڵگای بۆرجوازییە لە قۆناغی سەركەوتن و باڵابوونیدا. پرنسیپی بیركردنەوە مێژووییەكەی بەشداری لە خێراكردن بە گەشەی ئەو كۆمەڵگایەدا دەكات، بەهاو بایەخەكەیشی ئالێرەدایە. لە رۆژگاری ماكیاڤیللیدا یەكبوونی ئیتاڵیا مەرجی پێداویستی بۆرجوازییەتێكی ئیتاڵی بوو كە توانای ركابەریی هەبێت، بەڵام هاوكات ماكیاڤیللیزم تایبەتمەندی هەموو ئەو دەوڵەتانەیشە كە كۆمەڵگاكانیان پێویستی بە حكومەتێكی ناوەندی بەهێز هەیە كە توانای نەهێشتنی سنورەكانی ئابوری سەربە سەدەكانی ناوەراست و شانبەشانی ئەوەش شوێنەوارەكانی فیودالیزم هەبێت. لە پێناو دەرفەتدانیش بە دامەزراندنی سیستەمی پەیوەندیگەلێكی ئابوری بێ كەند و كۆسپ، پەیوەندیگەلێكی تۆكمە و چوونیەكیشدا، پێویستە ئەم حكومەتە بەسەر هەموو بەرەنگارییەكدا زاڵبێت و هەموو لەمپەرەكان سەرنگون بكات و زەبر و زەنگێكی بێبەزەیی بەكاربهێنێت، هەنگاو بەسەر هەموو ئەو مەترسی و بێنەواییە مرۆڤایەتیانەدا بنێت كە قۆناغی گواستنەوە بەرهەمیان دەهێنێت، بە كورتی، پێویستە زەمینە بۆ دامەزراندنی سیستەمێكی بۆرجوازی لەسەر گەورەترین پانتایی سەربەخۆ كە لە تواناڊا بێت برەخسێنێت. ریشیلیۆ دەوڵەتی نەتەوەیی یەكگرتووی لە فەرەنسادا لە روانگەی بنەماگەلێكی ماكیاڤیللیزمانەوە دامەزراند. هاوكات ناپلیۆن كە ئەركە مێژووییەكەی بریتی بوو

لە گێڕانەوەی ئارامی و ئاسایشی بۆرجوازی دوابەدوای گەردەلولەكانی شۆڕشی فەرەنسا و كە لەگەڵ جێبەجێكردنی ئەم ئەركەشیدا دەسبەجێ بۆرجوازییەتی فەرەنسی پشتی تێكرد، لێدوانێكی بۆ ماكیاڤیللی نووسیبوو. هەروەها فیختە كە بانگەشەی بۆ ئازادی و شێوازەكانی بیركردنەوەی بۆرجوازیانە دەكرد، دانەرو نووسەری بەرگرییەكە لەمەڕ ماكیاڤیللی، هەرچی هیگڵە – كە فەلسەفەكەی ڕۆشنترین گوزارشتی ئایدیۆلۆجی گوزارشتی لە بۆرجوازییەتی ئەڵمانی پێش ساڵی 1848 دەكرد، ئەو بۆرجوازییەتەی كە لە هەموو ڕوویەكەوە لە پەرەسەندنە ئابوری و سیاسییەكەیدا كەوتبوو – دروست نەك بە تەنها لە چەند ئایدیایەكدا هاوبۆچوونی ماكیاڤیللی بوو، بەڵكو زۆر بەرز و بالاش دەینرخاند. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە، ژیانی هۆبز لەگەڵ ئەو قۆناغەدا دێتەوە كە تیایدا بناغەكانی پەرەسەندنێكی ئازاد بۆ كۆمەڵگای بۆرجوازی لە ئینگلتەرادا داندرا. دەتوانین فەلسەفەی مێژوو لای هۆبز – چ وەك دەرەنجام یاخود وەك هۆكارێك بۆ پراكسیس پێچەوانە لەگەڵ ماكیاڤیللیدا كە لایەنی كەم لە سەرەتادا هیچ كاریگەرییەكی بەرچاوی لە وڵاتەكەی خۆیدا جێنەهێشت، تەماشا بكەین.

هۆبز لە ساڵی 1558 لەدایك بووە، واتە ئەو ساڵەی كە تێكشكاندن و لەناوبردنی كەشتیگەلی ئەرمادای نەبەز *Linvincible Armada* ی بە خۆیەوە بینی. باوكی هۆبز مژدەبەرێكی ئامۆژگار "واعظ" بوو لە ئۆكسفۆرد و خاوەنی ڕۆشنبیرییەكی خاكی بوو، هەروەها هۆبزیش بە یەكێك لە گرنگترین فەیلەسوفانی مێژووی نوێ دادەنرێت.

فەلسەفەی مێژووی بەگوێرەی ماكیاڤیللی خوێند، بەڵام سەبارەت بابەتەكانی تر فرانسیس بیكۆن *Bacon* مامۆستای بوو. بە پێچەوانەی ئەو باوەڕەی كە ئەمڕۆكە زۆر بەربڵاوە، پێویستە بیكۆن بە یەكەم بیریار كە ئایدیاگەلێكی بنەڕەتیی لەمەڕ فەلسەفەی نوێ پێشكەش كرد، تەماشا بكرێت. ژیانی هۆبز بۆ ماوەی 91 ساڵ درێژ بووەتەوەو زۆربەی ئەم تەمەنەیشی سەر بە چاخی دوایین كێشمەكێشی نێوان بۆرجوازییەتی ئینگلیزی و فیودالیزمە. هۆبز توانی سەرنجی ئەوە بدات چۆن ئەو تەخت و تاجەی كە هەڕەشەی هەرەس هێنانی لەسەر بوو، هانای بردە بەر دەسەڵاتی ڕەها. بەڵام دواتر، بۆ پارێزگاریكردن لە مانەوەی خۆی، ناچاربوو ئەو دەسەڵاتە لەپێناوی بەرژەوەندییە "نەتەوایەتی"ەكاندا بەكاربهێنێت، واتە ئەو بەرژەوەندییە بۆرجوازیانەی كە لە ئینگلتەرای ئەو سەردەمەدا لە بنەڕەتدا لەگەڵ بەرژەوەندی خانەدانە خاوەن سەرمایە پرۆتستانتەكاندا كۆك بوو.

هۆبز لەوە بەتەمەن منداڵتربوو كە ماوەیەكی دوور و درێژ لە فەرمانڕەوایی ئەلیزابیسی بێتەوە یاد، بەڵام لە دوایدا فەرمانڕەوایی لاوازی جاكی یەكەم و دواتریش دارمانی تەختی پادشایەتی، وەك دەرەنجامێك كەماڵی ئینگلیزی بەهۆی سیاسەتێكەوە دووچاری بوو كە بەشێوەیەكی دیاریكراو ئارەزووی زیادكردنی قەڵەمڕەویی تایبەتی خۆی دەكرد، بە چاوی خۆی بینی. هۆبز هەواداری پادشایەتی بوو هەر بۆیە لەسەری پێویست بوو لە ساڵی 1640دا لە كاتی كۆبوونەوەی پەرلەمانی درێژخایان *Long parlement** دا لە لەندەن هەڵبێت و ماوەی یانزە ساڵ لە فەرەنسا نیشتەجێ بێت و بمێنێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوە هۆبز – ڕێك و ڕاست وەكو ماكیاڤیللی – بڕوای وایە شێوەی دەوڵەت مەسەلەیەكی لاوەكییە بە نیسبەت بوونی ڕاستەقینەو كردەیی

دەسەڵاتێکی بەهێز ئیدی ئەو دەسەڵاتە هەرچییەك بێت. ئیدی هەڵوێستی هۆبز لە ماوەی ئەو قۆناغەدا بەمجۆرە ڕاڤە دەکرێت: لە کاتی کۆچکردنیدا بەرەو فەرەنسا، دەستی کردە فێرکردن و ئامۆژگاری میری گالی دوورخراوە لە ئینگلتەرا، ئەو میرەی کە لە دوایدا بووە چارلی دووەم، ئەم میرە کۆشك و ئەنجومەنێکی شاهانەی لە سان جێرمان بۆ خۆی دامەزراندبوو، ئیدی پەیوەندی هاوڕێیەتی ئەم دوو پیاوەی بەیەکەوە کۆکردەوە، بەڵام هێندەی نەبرد ئەم پەیوەندییەیان بەهۆی دانپێدانانی هۆبز بە حکومەتە کۆمارییەکەی کرۆموێلدا هەڵوەشایەوەو، نزیکەی کۆتایی ساڵی 1651 واتە لە پاش لێبوردنەکەی پەرلەمان، وەك هاوڵاتییەکی ئابڕومەند و پایەبەرز بە نیسبەت ڕژێمە نوێیەکەوە گەڕایەوە بۆ لەندەن. دواتر وەختێك چارلی دووەم بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ ئینگلتەرا سەرلەنوێ دەستی هاوڕێیەتی بۆ درێژکردەوە گەرچی دەشیزانی هۆبز هەر بە هەواداری پادشایەتی ماوەتەوە. بەڵام تەنها لەبەرئەوە هۆبز بەو جۆرە بوو چونکە، ئەگەر دەربڕینەکەمان ڕاست بێت، کەسێکی ئاسایی بوو، بەڵام وەك فەیلەسوفێك خزمەتکاری هەر حکومەتێکی بەهێز بوو کە جڵەوی دەوڵەت بگرێتە دەست، بڕوایشی وابوو یەکەم ئەرکی بریتییە لە چەسپاندنی هێزی ئەو دەوڵەتە. زانستەکەی خۆیشی بە پادشا یاخود بە کۆمارێك نەبەخشی بەڵکو وەکو ماکیاڤیللی کردییە دیاری بەهێزترین دەسەڵاتی سیاسی[1].

سیاسەتمەداری فلۆرەنسایی (ماکیاڤیللی)، کە پێودانگگەلی ڕووت و ڕامان دەربارەی بنەماو پرنسیپەکان بەدەگمەن لەلای دەبینرێت، بەشێوازێك کە تا ئێستایش بەشێوازێکی ساویلکانە تەماشا دەکرێت، چوونیەکیی نێوان سیاسەت و فیزیك، نێوان ڕاڤەی زانستی و ڕاڤەی مێژوویی گرتەخۆی، هەرچی سیستەمی فەلسەفی لای هۆبزە بە پێچەوانەوە، یەکێکە لە دیارترین و کاریگەرترین بەڵگەنامە فیکرییەکانی سەردەمەکەی خۆی. لە بنەڕەتیشدا لەسەر بناغەی شیکردنەوەی تیۆرییانەی ئەو چوونیەکییەی نێوان بونیادی پێکهاتە سروشتی و بونیادی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەك لە نێوان ئاوێتە فیزیکییەکان و لەلایەکی دیکە ئەو ڕێگایەی کە بە هۆیەوە خەڵکی لە دەوڵەتدا یەکانگیر دەبن، دادەمەزرێت. ئەو پەند و ئامۆژگاریانەش کە هۆبز لەبارەی دەوڵەت و مێژوو هەڵیاندەهێنجێت بە بێ زانینی وێنای هۆبز بۆ سروشت تێگەیشتنی ئەستەمە: سروشتیش خۆی لە خۆیدا لە ڕێسای ئەو بیرۆکە میکانیکییە بۆ جیهانەوە کە زانستی سەرکەوتوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا وەکو چارەسەرێك بۆ هەموو مەتەڵەکان بە هۆیەوە ڕووبەڕووی گەردون دەبووەوە، هەنگاو هەڵدەگرێت.

گالیلۆ هەموو پرۆسەکانی پەرەسەندنی لە پرۆسەیەکی پەرەسەندنی میکانیکیدا کورتکردبووەوە کە ئەویش جوڵەی گەردیلەکانی مادەیە. دەکرێت ئاڵۆزترین پرۆسەکانی پەرەسەندنی شێنەیی و لەسەرخۆ، واتە گۆڕانی بارستاییە گەورەکان، بگەڕێنرێتەوە بۆ جوڵەی گەردیلەکان. بەرامبەر وێنای سەدەکانی ناوەڕاستیش بۆ چەسپاوی "السکون" وەك دۆخێکی سەرەکی و ڕاستەقینە و بەشێوەیەك لە شێوەکان کۆك و تەبا لەگەڵ هەموو شتێکدا – ئەو وێنایەی کە دەتوانین ئەمڕۆکە لە دووتوێی بەرجەستەبوونی "سروشتی"انەی جیهاندا هەست بە بوونی بکەین – گالیلۆ داکۆکی لەو بیرۆکەیە کرد کە دەڵێت جوڵەی ڕاست "الحرکة المستقیمة"

*rectiligne* و یەکسان و هاوشێوە "منتظم" *uniforme* یەکەم واتاو چەمکی فیزیکییە و پێویستە لەگەڵ هەموو پێودانگە پێویستەکاندا بەو جۆرە لە چەسپاوی و جوڵە تێبگەین کە ڕێژەیین، سەلماندنی ئەم ڕێبازە ڕووداوێکی مێژوویی خاوەن بایەخێکی سەرتاپاگیربوو. بەبڕوای ماکیاڤیللی ئەوەی کە پێویستە ڕاڤە بکرێت جوڵە نییە وەك جوڵە، بەڵکو خێرابوون "التسارع" و خاوبوونەوە "الابطاء" یاخود گۆڕینی ئاراستەیە. بەمجۆرە خودای ئەرستۆ، ئەو بزوێنەرەی کە بە کاریگەری گەردون نابزوێت و کە هۆکاری پاڵی یەکەمە و هاوکات چاودێری جوڵە دەکات و دەیپارێزێت، چیدی لایەنی کەم لە فەلسەفەی سروشتدا، زیادە و پێویست بە بوونی ناکات.

هۆبز، ئەم وێنا نوێیەی کە لە ماوەی سەردەمی ڕێنیسانسدا سەریهەڵدا، ئەوپەڕی پەرەپێداو، شێوە سیستەمییە ئامادەکەی خۆیی پێبەخشی. لەبەرئەوەی هەموو زانستێکیش لە دیدی هۆبزدا زانینی هۆکارگەلەکانە، هەر بۆیە ئەم زانستە تەنها بە تێڕوانین و تەنها وەسفکردنی ڕووداوەکان بەس ناکات. پێویستە لە نێو جوڵەی کەرتەکانیدا بە شوێن سەرجەم جوڵەی تەن و جەستەکاندا بگەڕێین. هەر لەبەر ئەم هۆکارە هۆبز بە یەکێك لە بڕوادارانی ڕێبازی گەوهەری تاکی گەردیلەیی بە مانا ورد و دروستەکەی، نایەتە ئەژمار، چونکە سەبارەت بە گەردیلە گەراکان "الذریین"ی لە وێنەی جاسیندی *Gassendi*[2*] هاوڕێی هۆبز، هەرچییەك کە توانای کەرتبوونی هەبێت بۆ کەرتگەلێکی پایانی، چەسپاو، کە شیاوی بەشبوون نەبێت و لە یەکدی جودا و سەربەخۆ بێت، ئەمانەن: گەردیلەکان، ئەم گەردیلانەش چەند تایبەتمەندییەکی لە جۆری سەنگینی و بێ پایانییان هەیە، بەڵام بە واتای تەواوی وشەی بەرهەست خاوەنی هیچ سیفەتێکی بەرهەست نین. هۆبزیش پێ لەم کەرتانەی مادە نانێت: چونکی ئەو بڕوای وایە "گەورە" و "بچوك" دوو چەمکی ڕێژەیین و تەنها لە چوارچێوەی وابەستەبوونی هەریەکێکیان بە خودی "کاراو بکەر"ی دەرککار مانایەکیان هەیە، ئەوەی کە بەلای فیزیکناسەوە بە بچوکترین کەرتەکان دێتە پێشچاو، بە هیچ جۆرێك بە مانا ڕەهاکەی بەو جۆرە نییە. بەڵام هۆبز بڕوای وایە هەموو واقعییەك، وەك واقعییەك پێگەی خۆی هەیە لە شوێندا. ناوبراو ئەمەش ناونانێت مادە "ئەمە لە ڕوانگەی ئەودا لە چەمکێکی ڕووت و گشتی بەولاوە زیاتر نییە، لەمەدا تاڕادەیەکی زۆر ئەرستۆمان وەبیر دەهێنێتەوە"، بەڵکو باس لە "جەستەگەلێك" دەکات. هەرچییەکیش کە پەیوەندی بە گەوهەر یان واقعی ناوەوە هەبێت، جەستەیە، هەموو گۆڕانکارییەکان جوڵەگەلی کەرتگەلی ئەو جەستەگەلانەن کە پێویستە هەمیشە لە دوورەوە بە دوای دابەشبوونی جوڵەکەیدا بچین و چاودێری بکەین. درێژبوونەوەو شێوە، دوو سیفەتی نەگۆڕ و چەسپاوی جەستەکانن، هەرچی ڕەنگ و بۆ یاخود دەنگیشە ئەمانە ڕێگاگەلێکی خودیی پەتین لە دەرککردن بەو سیفەتانەدا. یاسا باڵاکانی جوڵەیش یاسا باڵاکانی جیهانی سروشتین و، هیچ جیهانێکی دیکە لە گۆڕێدا نییە.

هەروەها مرۆڤیش میکانیزمێکە و لە کەرتگەلێکی جەستەیی پێکهاتووە، ئەگەر لە سەرجەم تەن یاخود جەستەکانی تریش کە لە سروشتدا هەن جیاوازبێت، ئەمە واناگەیێنێت کە هەندێك لە بەپیرەوەچوون و وەڵامدانەوەکانی جەستەی مرۆڤ ملکەچی یاساگەلێکی تری جگە لە یاساگەلە میکانیکییەکان دەبێت، بەڵکو ئەو

جیاوازییەی لە ئاڵۆزییەكی زیاتر لە ڕێكخستن و لە ئەرك و كاروبارەكاندا، سەرچاوە دەگرێت. هۆبز دڵ و دەمارەكان و جومگەكانی بە بزوێنەر *ressort* و جوڵێنەر (بۆ گواستنەوەی جوڵە) و ڕەوڕەوە كە جەستە دەبزوێنن، بەراوردكردووە. هۆبز لە مەسەلەی هەست "الاحساس"دا وەك ڕووخسارێك كە هەر خۆی بە تەنها بەسە بۆ جیاكردنەوەی مرۆڤ لە سەرجەم جەستەكانی دیكە، بەشێوەیەكی لابەلا شپرزەبووە و، بە گوێرەی قۆناغەكانی ژیانیشی بە شێوازێكی جیاواز چارەسەری كردووە و لێی كۆڵیوەتەوە بەڵام بێ ئەوەی لە ئاستیدا هەڵوێستێكی ڕۆشن دیاری بكات. هەروەها لە نێوان ئەم دوو ڕوانگەیەشدا دۆش داماوە: یان ئەوەتا هەڵچوونەكان و پڕۆسەی هۆشیاری بە گشتی، وەكی سەرجەم پڕۆسە جەستەییەكانی تر پڕۆسەیەكی مادییە، یان ئەوەتا ئەگەر و توانایەك هەیە بۆ ئەوەی بەو جۆرە تەماشای مەسەلەكە بكرێت كە هەندێك پرۆسەگەل گاهێك پرۆسەگەلێكی فیزیكی و گاهێكیش پرۆسەگەلێكی دەروونین، لەم بارەی دواییاندا مەسەلەكە وابەستە نییە بە جیاوازییەكی ڕاستەقینەوە، بەڵكو وابەستەی ئەگەر و توناگەلێكی فرەچەشنی دەستنیشانكردنە، ئیدی بە هەرحاڵ كاریگەری هەست خۆی لە خۆیدا نابێتە پاساو بۆ هیچ ڕاڤەیەكی تر بۆ چالاكی مرۆڤایەتی تەنها ڕاڤەی میكانیكی نەبێت و، پێویستە لە ڕوانگەی جوڵەی كەرتەكان و بە وێنەی تێگەیشتنمان لە جوڵەكانی ژینگە، لە جوڵەكانی مرۆڤیش تێبگەین، واتە دەبێت بە ڕێگایەكی سۆنگەیی لێی حاڵی بین.

پەیوەندی دەوڵەت بە تاكەتاكەی خەڵكییەوە وەكی پەیوەندی ئەو خەڵكە وایە بە كەرتە مادییەكانی جەستەكانی خۆیانەوە، واتە وەكی هەر سیستەمێكی فیزیكی لە پەیوەندیدا بە ڕەگەزە مادییەكانی خۆیەوە. "وەكی چۆن لە جوڵەی پارچەكانی كاتژمێر یاخود ئامێرێكی تری كەمێك ئاڵۆزتردا ئەستەمە بەبێ هەڵوەشاندن و بەبێ لەبەرچاوگرتنی مادە و شێوەو جوڵەی هەر كەرتێك، گشت بەش و هەموو پارچەكانی بەچاكی بزانرێت، بە هەمان شێوەیش هەر كەسێك بیەوێت لە مافی گشتی و ئەركەكانی خەڵكی بكۆڵێتەوە، بێگومان لەسەری پێویست نییە كە بە كردەوە دەوڵەت هەڵبوەشێنێت، بەڵكو پێویستە وەكی هەڵوەشاوە تەماشای بكات، یاخود بە دەربڕینێكی تر، پێویستە خاسیەت و تایبەتمەندییەكانی سروشتی مرۆیی زۆر بە چاكی بزانرێت و لە لایەنە چاك و لایەنە خراپەكانی بۆ یەكانگیربوون و ئاوێتەبوون بەدەوڵەت و دەبێت خەڵكی پێكڕا داخڵ بە چ پەیوەندیگەلێك بن ئەگەر بیانەوێت بە یەكبوونێك ڕابگەن، دڵنیابین[2]". هەروەها وەكی چۆن پێویستە بۆ تێگەیشتن لە شتە گەورەكان تایبەتمەندییەكانی بچوكترین كەرتەكانی مادە بپشكنرێت "وەك لە فیزیای نوێدا كە پێویستە هەمیشە زیاتر پاڵ بە لێكۆڵینەوەوە بە ئاراستەی بێپایان لە بچوكیدا بنرێت"، بە هەمان شێوە ناتوانرێت بنەچە و چوونیەكیی جەستەی گەورەی دەوڵەت ڕاڤە بكرێت تەنها لە ڕوانگەی تایبەتمەندییەكانی كەرتە پایانییەكانی ئاوێتەی سیاسییەوە نەبێت كە ئەویش خەڵكییە.

پێڕەوی تیۆریی لای هۆبز، هەڵە و چەوتیی بنەڕەتیی لە ڕاڤەی ماكیاڤیللیدا بۆ مێژوو، ڕۆشنتر دەكاتەوە. هەموو گۆڕانكارییەكان لە دەوڵەت و سیاسەت و ئاییندا، لە ئاكار و لە یاسادا، لە ڕوانگەی چەمكی تاكەكەس بە دابڕاوی لە هەموو ئەوانیتر، ڕاڤە دەكرێت. ئەو تاكەی كە هۆبز

خاسیەت و تایبەتمەندییەکانی بە نەمر و چەسپاو و چوونیەکییەکی هۆشیارانە چوونیەك لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی جەستە نائۆرگانییەکاندا وێنا دەکات. هەموو تاکێك لەو تاکگەلانە بە زەرورەتێکی ڕەها بە پیر جوڵەگەلە دەرەکییەکانەوە دەچێت. کاردانەوە مرۆڤایەتییەکانیش وەختێك کە لە ناوەوەڕا تەماشایان دەکرێت، وەکی گوزارشتگەل و هەستگەل و وروژم گەلێکی غەریزیانەی دیاریکراو دێنە پێشچاو. ئەنترۆپۆلۆژیاکەی هۆبز لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە هەموو ئەو کارتێکەرانەی کە لەسەر بناغەکانیان بەپیرەوەچوونەکانی ئێمە ڕوودەدەن، دەرەنجامگەلە زۆر پێداویستەکانی ئەو پرۆسە میکانیکییەن کە لە نێو جەستەکانمان و لە نێو دونیای دەرەوەدا دەگوزەرێن. ئەوە دڵە کە جوڵەی ئەرکەکانی جەستەی مرۆیی دەبزوێنێت و دەپارێزێت. هەرچی چالاکی دڵیشە بەهۆی ئەو وروژمە بەردەوامانەوە دەکرێت کە هەندێك مادە، کە لە کاتی هەناسە وەرگرتندا هەڵدەمژرێن، پێی دەبەخشن. دڵ لە ڕێگای جەستەوە خوێن ڕەوانە دەکات و بەمجۆرە پارێزگاری لە چالاکی ئەندامەکان دەکات. ئەوەی کە ڕۆیشتنی خوێن ئاسان دەکات دەبێتە مایەی چێژ و خۆشی و، ئەوەی کە دەبێتە لەمپەر لە ڕێگایدا ئازار و ناخۆشی دروست دەکات. بۆ نموونە تەنانەت خۆشی و شادی جوانسازییش مەرجدارە بەو شەپۆلانەی هەواوە کە لە جەستە سیستەمییەکانەوە دەردەچن و سەرچاوە دەگرن، ئینجا لە دوای تێپەڕبوونی بە تۆڕی چاوو دەماری بینین و مێشکدا، تەشەنە دەکات تا دەگاتە دڵ و ئەوجا کامەرانی یاخود چێژ و خۆشی لەدایك دەبێت. ئەو جوڵانەی کە لە سروشتی دەوروبەر یاخود کە لە نێو خودی جەستەوە دێن، ئەوانەن کە هەمیشە ئەو هۆکارانە دروست دەکەن کە لەڕووی لۆژیکییەوە چێژ و خۆشی و ئازار بەرهەم دەهێنن. لە ڕاستیدا لە چێژ و خۆشی یاخود لە ئێشو ئازارەوە، یاخود – بە دەربڕینێکی فیزیکی – بە گوێرەی پێداویستییەکی لۆژیکی، لە خێرابوونی ڕۆیشتنی خوێن یاخود لە نەڕۆیشتن و پەککەوتنییەوە کارو کردەوە خۆویستەکانی خەڵکی ڕوودەدات. بەوێکچوونێکی ورد و دروست وێکچوویش لەگەڵ میکانیکادا "جوڵەکان"ی ڕۆح دابەش دەبێت بەسەر جوڵەگەلی کێشکردن و دوورکەوتنەوەدا. خۆشەویستی و خواست و ڕەزامەندی و ویستی مانەوە دەدرێتە پاڵ یەکەم و، ئازار و ترس و سڵکردنەوەیش دەگەڕێنرێتەوە بۆ دووەم. بۆ نموونە ئەو هەستە گشتییەی کە ئازارگەلە واتایی و ئازارگەلە جەستەییەکان لە یەکدی جودا دەکاتەوە، پێی وا نییە کە لە هەردوو بارەکەدا مەسەلەکە وابەستەیە بە هەمان شت لە ڕووی چەشنەوە، چونکی لە حاڵەتی ئازارگەلە جەستەییەکاندا تەنها تاقە یەك ناوچەی دیاریکراو ئازار دەیگرێتەوە لە کاتێکدا ئازارگەلە واتاییەکان تایبەتە بە خودی جەستە لە تەواوی ئەرکەکەیدا. هەر بەگوێرەی ئەم وێنایانە، هۆبز کۆی هەڵچوونەکان بەسەر هەڵچوونگەلی کێشکردن و کۆنترۆڵکردن و هەڵچوونگەلی بەرگری یاخود داکۆکیدا، دابەش دەکات.

کەواتە ناکرێت و ناشێت لەم فەلسەفەیەدا شوێن و جێگایەك بۆ ئەو شتە هەبێت کە ئێمە پێی دەڵێین ئازادی ئیرادە، کتێبە کورت و پوختەکانیش لەمەڕ مێژوو و فەلسەفە ئەوانیش هەروا ڕاهاتوون کە هۆبز لەم ڕوانگەیەوە پۆلێن بکەن. لە ڕاستیدا ئەو جیاوازییەی کە ئەو لە نێوان ئازادی ئیرادە و ئازادی کردەوەدا دەیکات جیاوازییەکی زۆر بایەخدارترە، هۆبز لە ڕێگای ئەم جیاکارییەوە لە بنەڕەتدا

بەشداری لە پێشکەوتنی گرفتی ئازادیدا کرد. چونکی ڕێبازی ئازادی ئیرادە، کە لە سەرەتای قۆناغی قوتابخانەیی "سکۆلاستیکی"دا مەسەلەیەکی لاوەکی بوو، تەنها لەتەك بزووتنەوەی ڕیفۆرم و دژە ڕیفۆرمدا[*3]، کە بە هۆیانەوە بە ئەنقەست بەرەنگاری بڵاوبوونەوەی زانستی نوێ کرا، مانای ڕاستەقینەی خۆی وەرگرت. دەکرێت ئەم ڕێبازە لە تاقە یەك ڕستە مەسەلەدا کورت بکەینەوە کە ئەمەیە: کارو کردەوەکانی مرۆۋ بە هۆگەلێکی سروشتی ڕاڤە ناکرێت، وێڕای ئەوەش جەخت لە بوونی بەڵگەیەك لە ئێمەدا یاخود بوونی پەرۆشی و پێداگرییەك کە خاوەنی ئازادی هەڵبژاردنێکی ناجیاوازە *Liberum arbitrium indifferentiae*، دەکات: کاتێکیش ئەم پێداگرییە لەبەردەم ژمارەیەك لە کارو کردەوەی شیاو "ممکن"دا دەبێت، ئەوا بەشێوازێکی خۆبەخۆ، بەرجەستەکردنی کارێکی دیاریکراو هەڵدەبژێرێت بێ ئەوەی بە پیر هیچ یاسایەك لە یاساکانی سروشتەوە بچێت و، بێ ئەوەی هیچ شیکردنەوەیەکی دیکەش بکاتە خاڵی دەستپێکردن تەنها خودی خۆی نەبێت. ئەو کەڵکەی کە پەیوەستە بەم ڕێبازەوە تەنها کەڵکێکی ئاینیی نییە بەڵکو کەڵکێکی کۆمەڵایەتیشە. چونکی بەبێ ئازادی هەڵبژاردن، ئەستەمە بتوانرێت بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە خوداو بەرامبەر بە نەفرەتی هەمیشەیی و هەروەها سەرزەنشت لە ژیانی دونیادا، بونیاد بنرێت. ئەگەر لەسەریشمان پێویست بێت چاوەڕوانی قۆناغێکی نوێ بکەین بۆ بینینی یاسادانەرگەلێك کە ناڕەزایی بەرامبەر ئەمە دەربڕن: بەرامبەر نەریتی پاساودانی جێبەجێکردنی یاسا بەهۆی ڕێبازی ئازادی ئیرادەوە، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت پێ لەوە بنێین کە هۆبز و، دوای ئەویش چەرخی ڕۆشنگەری، بەڵگەگەلێکی بنەبڕیان لە بەرژەوەندی ئەم تیۆریایەدا پێشکەش کردبوو.

نەزانینی هۆکارە غەریزییەکانی ڕەفتارێکی دیاریکراو، هەرگیز بوار و مۆڵەتی چەسپاندنی ئەوە نادات کە ناکرێت و ناشێت بەپیرەوەچوونی مەبەست بچێتە دووتوێی پەیوەندییەکی سۆنگەییەوە. ئەگەر ئێمە، لەجیاتی هەوڵی دۆزینەوەی ڕاڤەیەك، گریمانەی تیۆریی سەربار لەمەڕ ئازادییەکی پۆزەتیڤمان داخڵ کرد، ئەو کاتە بەم کارەمان، بەو جۆرەی کە هۆبز و بیرمەندانی چەرخی ڕۆشنگەری شرۆڤەیان کردووە، بە دەستنیشانکردنێکی دەستکرد بۆ زانستەکان ڕادەگەین کە ڕێکو ڕاست ئەرکی ئەم دەستنیشانکردنە دەستکردە لەوەدا بەرجەستەیە کە، لە هەر خاڵێکدا بێت لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەدا، خۆی بە تەواو کامڵ تەماشا نەکات. وەختێك کە لەبەردەم کارو کردەوەگەلێکی مرۆڤایەتیشدا دەبین کە میکانیزمەکانیان نازانین، مافی ئەوەمان نییە زنجیرەگەلێکی سۆنگەیی جیاجیا دروست بکەین، هەروەها ناشبێت بە دانانی چەمکێك بۆ ئازادی کە بەرلەوەی بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، زانست دیاریدەکات، لەمپەر بخەینە سەر ڕێگای لێکۆڵینەوەی دواتر.

هۆبز دەڵێت: "لە دید و تێڕوانینی مندا، ئازادی چیتر نییە جگە لە نەبوونی هەر شتێك کە ڕێگا لە جوڵە بگرێت. لەبەرئەوە، ئەو ئاوەی کە لەناو دەفرێکدا بەند و قەتیسە، ئاوێکی ئازاد نییە، دەفرەکە ڕێگای ڕۆیشتنی لێدەگرێت، بە پێچەوانەی ئەمەوە ئەو کاتە ئاوەکە ئازاد دەبێت کە دەفرەکە تێکدەشکێت. هەموو یەکێکیش بەپێی کەمی و زۆری ئەو شوێن و ماوەیەی کە بۆ جوڵەکردن

هەیەتی، کەم تا زۆر ئازادە، لەبەرئەوە کەسێکی بەند لە نێو بەندیخانەیەکی گەورە و بەرفراواندا لە کەسێك کە لە نێو بەندیخانەیەکی بچوکدا بەندە، زۆر ئازادترە. هەروەها دەکرێت مرۆڤ لەلایەنێکەوە ئازادبێت بێ ئەوەی لەلایەنێکی ترەوە وابێت. بەمجۆرە، پەرژین یاخود شوراگەلێك، لەمبەر یاخود لەو بەرەوە، لە باریدایە ڕێگا لە ڕێبوار بگرێت کە کێڵگەکان یاخود دارمێوەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکە خراپ بکات. لەمپەرگەلی لەمجۆرە لەمپەرگەلی دەرەکی و ڕەهان، بەم واتایە هەموو کۆیلەکان و هەموو ئەوانەی کە ملکەچی زەبر و زەنگن کەسانێکی ئازادن بەو مەرجەی کۆت و بەند نەکرابن یاخود دەستبەسەر نەبن. لەمپەرگەلێکی دیکەش هەن تەنها تایبەتن بە ئیرادە، چونکی بەشێوەیەکی ڕەها پەکی جوڵە ناخەن بەڵکو بەڕێگایەکی ناڕاستەوخۆ، بە هۆی کارکردن لە هەڵبژاردنەکانمان، دەبنە کەند و کۆسپ لە ڕێگایدا. بەمجۆرە گەشتیاری کەشتییەك ئەگەر بیەوێت خۆی فڕێ بداتە نێو دەریاوە، هیچ شتێك نییە ڕێگای ئەم کارەی لێ بگرێت. بەڵام دیسان لێرەشدا مرۆڤ هێندەی ئازادی هەیە کە زیاد لە ڕێگایەك بۆ جوڵەکردنی بۆ دابین بکات. هەر ئەمەیشە مانای ئازادی مەدەنی (...) بەڵام لەهەر دەوڵەت و لە هەر خانەوادەیەکدا کە کۆیلەگەل هەبن، هاونیشتمانییە ئازادەکان و نەوەکانی خێزان بە نیسبەت کۆیلەوە، چ لە دەوڵەت یاخود لە خانەوادەدا، بەختی پیادەکردنی کار و کردەوە و ئیشگەلێکی ئابڕومەندانەتریان هەیە، هاوکات خاوەنی شتگەلێکیشن کە لە پێویستیەکانی خۆیان زیادە. جیاوازی نێوان هاولاتی ئازاد و کۆیلەش لەوەدایە مرۆڤی ئازاد تەنها خزمەتی دەوڵەت دەکات بەڵام کۆیلە خزمەتی هاولاتییەکیش دەکات. هەر ئازادییەکی دیکە ئازادی سەرفرازبوونە لە یاساکانی دەوڵەت و تەنها فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران هەیانە"[(3)]. هەموو ئەم ئایدیایانە ئەوە ئاشکرا دەکەن کە هۆبز باس لە ئازادی ویست و ئیرادە ناکات بەڵکو باسی لە ئازادی ڕەفتار و هەڵسوکەوتە. لەلای هۆبز ئازادییەك نییە بە واتا ئایدیالیانەکەی ئیرادە، وابەستەی ئیرادەبێت، ئازادی تەنها لە چوارچێوەی وابەستەبوونی بەو کەند و کۆسپانەوە کە توانامان لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتدا سنوردار دەکەن، بوونی هەیە. ئازادییەکە بە گوێرەی کەسەکە و بارودۆخی گشتی و ڕەوشە چینایەتییەکەی دەگۆڕێت. کار و کردەوەکانی ئێمە نەك تەنها بە لەمپەرگەلێکی دەرەکی، بەڵکو بە لەمپەرگەلێکی ناوەکیش سنوردارە: بۆ نموونە لەبەر چاوگرتنی دەرەنجامە چاوەڕوانکراوەکان وێڕای ئەو توانایەی کە گشتیاری سەر کەشتییەکە لەبارەی خۆفڕێدانە نێو دەریاکەوە هەیەتی بەڵام ئەگەر کەسێکی "تەندروست" بێت ئەو کارە ناکات و خۆی توڕ هەڵناداتە نێو دەریاکەوە، بەلای ڕێبوارێکی بێدەربەستیشەوە دروست دەروازەی ماڵێك بە شورا دەورەی درابێت یاخود لە ژێر سزای مەرگدا بەزاندنی قەدەغە بێت، هەروەك یەك وایە. لە هەردووبارەکەیشدا – کە هۆبز وەکی لەمپەرگەلی ناڕاستەوخۆ و لەمپەرگەلی ڕاستەوخۆ لە یەکدی جوێ کردونەتەوە – خودی ئیرادە خۆی ئازاد نییە بەڵکو بەهۆی ڕستێك لە هۆگەلەوە سنوردار و دیاریکراوە.

ئازادی ئیرادە، کە وەکی چەمکێکی میتافیزیکی هۆبز ڕەتیکردووەتەوە، لەباریدایە ساتەوەختێکی گەوهەریی بێت بێ هیچ جیاوازییەك سەرجەم خەڵکی لە گەورەو بچوك، دەوڵەمەند و هەژار،

نەخۆش و لەش ساغ، گەنج و پیر کۆبکاتەوە و یەکبخات، لە دیدی لاهوتیشدا کە لە ڕوانگەیدا هەموو خەڵکی لەگەڵ ڕۆڵەکانی خودادا بەرابەر و یەکسان تەماشا دەکرێن، یاخود لە ڕوانگەی فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا کە لەبەر هۆکارگەلێکی سیاسی، جەخت لەسەر یەکسانی سەرجەم خەڵکی دەکات، دەسەڵاتێکی هاوبەشە. هەرچی ئازادی کردەوەیە کە لەلایەن هۆبزەوە پێی لێنراوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە لەهەر بارێکدا بە جۆرێکی جیاوازە. چونکی کاتێك کە دەیپشکنێت ئەمە دەردەکەوێت: سەرەتا و پێش هەر شتێك جیاوازییەکانی ڕەوشی کۆمەڵایەتی. لە دوایین نموونە هێنانەوەدا، لە کاتی قسەکردن لەسەر کۆیلە و سەردارەکەی، ئەم مەسەلەیە هاتووە: "شتگەلێکی زیاد لە پێویست" — واتە شتگەلێکی کەمالی. بە گوێرەی چەمکی ئازادی ئایدیالیانەیش، هیچ جیاوازییەك نییە ئەگەر کۆیلە و سەردارەکەی ئیرادەیان هەبێت لە بەکارهێنانی ئەو شتانەدا یاخود لەوەدا کە بەهۆی ئەو شتانەوە چێژ و لەزەتێکیان دەستگیر بێت، ململانەی فەلسەفی پەتی سەبارەت زانینی ئەوەی ئایا هەردووکیان، لەمبارەدا، لە ئیرادەکانیاندا ئازادن یان نا، بە هەمان ئەندازە هەردووکیان دەگرێتەوە. ئاکامی تیۆریی ئەم ناکۆکییەش بێ هیچ جیاوازییەك لە چوارچێوەی چەمکێکی هاوبەشدا یەکیاندەخات و یان ئەوەتا شکۆیەکی هاوبەش یان ئەوەتا هەروەها شەرمێکی هاوبەشیان بەسەردا دادەبڕێت، بەڵام بەم کارەی لە واقع لادەدات، "بەرەو دوورتر لە واقع دەڕوات". هەرچی چەمکی ئازادییە لای هۆبز، بە پێچەوانەوە، بەرەو واقع دەڕوات، چونکی ئەوەی کە بەشێوەیەکی پێشینی لەلای ئەو، ئەوی فیزیکناسی میکانیکی و قوتابی ماکیاڤیللی، چەسپاوە، ئەمەیە: پێویستە کۆیلە و سەردارەکەی بە گوێرەی خوڕەوشتەکانیان ئارەزوو بکەن و بخوازن. سەردار وەختێك چێژی دەستگیر دەبێت دەتوانێت لەزەتی لێوەربگرێت، بەڵام ئەگەر کۆیلە هەمان خواست و ئارەزوو تێر بکات دەکوژرێت. ئەمەیە ئەو جیاوازییەی کە پێویستە لە کاتی قسەکردن لەسەر ئازادی لە واقعی کۆمەڵایەتیدا، ببینرێت، هەرچی چەمکەکەی تری ئازادیشە، بەهەرحاڵ، ناتوانێت شتێکی تازە و نوێ سەرباری مشتومڕەکە بکات.

لە پێناو تێگەیشتنێکی ورد و دروست لە هۆبز کاتێك دەیەوێت لەوە بکۆڵێتەوە کە چۆن خەڵکی — ئەو خەڵکەی کە پێویستە کارو کردەوەکانیان بە ڕێگایەکی سۆنگەیی ڕاڤە بکرێت لە دەوڵەتدا کۆمەڵ دەبن و کەلتوری خۆیان دادەهێنن و بە کورتی، مێژووی خۆیان دروست دەکەن، شیاوی ئاماژەپێدانە، لەلای ئەو، شیکردنەوەی بنەما ڕاستەقینەکانی دەوڵەت بەرگی بایەخ و گرنگییەکی تەواو لاوەکی دەپۆشێت. میتۆدی بیرکردنەوەکەی، کە تایبەتمەندی ژمارەیەك لە فەیلەسوفانە تا ڕۆسۆ و کانت و هەروەها ئەوانەی لە دوای ئەمانیش هاتن، ڕاستتر وایە بڵێین مەیل و ئارەزووی ڕێبازی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" دەکات: هەرگیز پێویست ناکات بە لێکۆڵینەوەی پرۆسەی ڕووداوەکانی مێژوو بۆ زانینی هۆکارە ڕاستەقینەکان کە هەمیشە و لە هەموو شوێن و جێیەك، بناغەی بوونی دەوڵەتن. هاوکات جیهانیش، لە دیدی هۆبزدا، پێویستی نییە بە گەڕان لە نێو سروشت بە شوێن بەرهەمی کردەیی شتێك لە شتەکان لە پێناو ڕاگەیشتن بە دۆزینەوەی ئەو هۆکارانەی کە لێی دەکەونەوە. فیزیکناسی بەئاگا لە خەسڵەتەکانی ئەو گەردیلە گەلەمادیانەی کە سروشتیان لێ پێکدێت، دەتوانێت بەبێ پێداویستی تەماشاکردنی

پەیوەندییەکەی لە چوارچێوەی جەستەیەکی دیاریکراودا، تەنها لە ڕوانگەی زانینی خەسڵەتگەلی کەرتەکانەوە، کە لێرەدا یاساکانی جوڵەی مادەیە، سەرلەنوێ ئەو ڕێگایە بونیادبنێتەوە کە دروست بەهۆیەوە شتەکان بە ڕێگایەکی ئایدیالیانە ڕوودەدەن. بەمجۆرە، بە تەنها سەرنجدانی تاکەکان بەجیا لە پەیوەندییەکانیان لە دەوڵەتدا بەسە، بەمپێیە وەك چۆن لەباریاندایە لە بارودۆخگەلێکی "سروشتی"دا بێ دەوڵەت هەڵسوکەوت بکەن، بۆ زانینی ئەو هۆکارانەی کە پێکهاتی دەوڵەت دیاری دەکەن. وەك چۆن فیزیك لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا کەرتەکان و هەروەها تەنگەلە بچوکەکان یاخود گەردیلەکانی لە خۆیاندا تەماشا دەکرد تا لە ڕوانگەی خەسڵەتەکانییەوە بە زانینی ئەو شتانە ڕابگات کە پێکهاتوون و دروست بوون و، وەك چۆن وا دەکات جیهان لە تەمومژ، واتە لە مادەیەکی بیرمەندی بێ پەیوەندیگەل لەدایك ببێت — هاوکات دەخوازرا بە ونکردن و شاردنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی دەستپێبکرێت تا لە دواییدا، لە ڕوانگەی تاکەکانەوە بەو پێیەی تاقە ناوەندگەلی پەیوەندییەکانن، کۆی دەوڵەت ئەنجامگیری بکرێت، بۆ تێگەیشتن لە دەوڵەتیش بەو جۆرەی کە لە ڕووی مێژووییەوە دراوە، پێشنیاری ئەوەکرا کە تەنها ئەوەندە بەسە لەو ڕێگایە وردبینەوە کە بەهۆیەوە پاڵ بە تاکەکانەوە دەنرێت، ئەو تاکانەی لە پەیوەندیگەلێکی ئاڵوگۆڕ داماڵراون و لە "باری سروشتی"دان، بەرەو دامەزراندنی پەیوەندیگەلێك و توندو تۆڵکردنی ئەو پەیوەندیگەلانە لە دەوڵەتدا بە گوێرەی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی خۆیان.

کەواتە لای هۆبز هیچ کام لە مێژووی مرۆڤایەتی و مێژووی سروشتی، بە مانا ورد و دروستەکەی زانستی سیاسەت، زانستی سیاسەت نین: بەڵکو بە پێچەوانەوە، زانستی سیاسەت لە ڕوانگەو لەسەر بناغەی هزری ڕووت دادەمەزرێنرێت. هەرچی توخم و ڕەگەزەکانیشییەتی بەم جۆرە دیاریدەکرێت: لەبەرئەوەی لەزەت و ئازار تاقە دوو هاندەری کاروکردەوەکانی مرۆڤن، هەر بۆیە چاکەی هەرە گەورە ژیانە و خراپەی خراپەکانیش مەرگ و مردنە. ژیانی مرۆڤ لە بارە سروشتییەکەیدا ئەوپەڕی هەڕەشەی لەسەر دەبێت. بێگومان هەرتاکێك، بەگوێرەی نەبوونی یاسا، لە هەموو شتێکدا خاوەنی مافێکی سروشتییە، بەڵام دەبێت بەردەوام وریا بێت تا بەهێزتر و، هەروەها لاوازتریش پەلاماری نەدات و نەیکوژێت، هەموو شتێك، خودی لاوازتریش دەتوانێت چاکە هەرە گەورەکە کە ژیانە لە بەهێزتر زەوتبکات، هۆبز وێنای ڕۆمانسیزمی بایۆلۆجی کە دەڵێت هەمیشە لە سروشتدا بوونەوەری لە ڕووی بایۆلۆجییەوە زاڵ سەردەکەوێت بەسەر بوونەوەری کەمتر و نزمتردا، بە چەوت و هەڵە دەداتە قەڵەم. تایبەتمەندییەکی باری سروشتی، حەز و ئارەزووی بێ سنوری تاکی دابڕاو و وەلێ هەروەها سڵکردنەوەشییەتی لەهەر شتێکی تری جگە لەو. تیایدا ئەمە باڵادەستە: "*bellumomnium in omnes*". ترس و سڵەمینەوە پێویستی بۆ ئارامی و ئاسایش دروست دەکات و پێویستییش بۆ ئارامی و ئاسایش ئامادەگی بۆ دەستبەرداربوون لە ئازادی کەسیی بێ سنور، بەرهەم دەهێنێت، تا لەسای ئاشتیدا چێژ لە ئازادییەکی سنوردار ببینرێت. بەمجۆرە، پەیمانی کۆمەڵایەتی زادەی ترس و ئومێدە، پێکهێنان "تسوية"ێکی نێوان دوژمنکارییە بێ سنور و ترسە بێ پایانەکەمانە.

لەبەرئەوەی هێشتا هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی حكومەتەكان لە باری سروشتدا، لەگۆڕێدا نییە، هەر بۆیە پەیمانە سەرەكییەكە لە نێوان ئەم حكومەتە و خەڵكیدا نەبەستراوە بەڵكو لە نێوان تێكڕای هاونیشتمانیانی داهاتوو لە دەوڵەتدا، بەستراوە. تاكەكان، لەسەر ڕێسا و بنەمای ئیرادەی هاوبەشیان، سەروەریی دەگوێزنەوە بۆ تاقە یەك مرۆڤ یاخود بۆ ئەنجومەنێك كە لە دوایدا بە گوێرەی ئەم پەیمانە پیادەی دەسەڵات دەكات. ئەو پادشایەی كە هەموو دەسەڵاتەكانی پەیمانبەستەكانی پێ سپێردراوە و هەواڵەی كراوە، لە میانی ئیرادەی خۆیەوە، بەرجەستەی ئیرادەی هەمووان دەكات. بەمجۆرە، لە بنەڕەتدا سەرچاوەی دەسەڵات میللەتە و پشت ئەستوریشە بە ویست و ئیرادەی تێكڕای تاكەكان، یاخود لایەنی كەم پشت بە زۆرینەی ئەنجومەنە سەرەكییەكە دەبەستێت، بەڵام بە چاوپۆشی لەم سەرەكییە، تاكەكان لەبەردەم دەوڵەتدا، واتە لەبەردەم پادشادا، هیچ ئازادییەكیان بۆ نامێنێ، دەبێت بەشێوەیەكی تەواو ملكەچی یاساكانی بن: ئیرادەی دەوڵەت لەگەڵ ئیرادەی پادشادا جووت دەبێت، ئیدی چ ئەوە لە تاقە یەك كەس "پادشایەتی" یاخود لە سەرۆكایەتی "كۆماری"ەوە هەڵبقوڵێت. هۆبز كە هەواداری دەسەڵاتی ڕەهای بێ مەرجە، بڕوای وایە هەر كۆتكردنێكی سەروەریی، ناكۆك و پێچەوانەی ڕۆحی پەیمانە سەرەكییەكەیە. هاوكات پەیمانەكە ئەركگەلێكیش بەسەر دەسەڵاتداراندا دەسەپێنێت، بەڵام هاونیشتمانیان ناتوانن پادشاكانی پێ ناچار بكەن، چونكی پادشاكان تەنها لەبەردەم خوداو ئەقڵدا بەرپرسیارن.

لەو كاتەدا كە دەسەڵات سەرپشك دەكرێت و لەلایەن هەمووانەوە بەجێ دەهێڵرێت، هیچ تاكێك ناتوانێت لەم دەسەڵاتپێدانە پاشگەزبێتەوە ئیدی چەندە ژمارەی ئەو كەسانەی تر زۆربێت كە دەتوانێت لەگەڵیاندا لە پێناوی ئەم ئامانجەدا یەكبگرێت. هۆبز، هەر بە ئیلهام وەرگرتن لە فەلسەفەی سروشت، بەمە ڕادەگات: بەراوردكردنی ئەم دەوڵەتە كە لەدایكبووی پەیمانبەستنە، بە بەڵگەنەویستە ماتماتیكییەكان كە ئەمانیش بە ڕێككەوتن چەسپێنراون. مرۆڤ تەنها بۆ یەكجار بە ویستی خۆی، ئازادی دیاریكردن و توانای زانینی واتاكانی هەیە. ئیدی هەركە پەیمانەكە بەسترا، ئەستەمە كەسێك بتوانێت هیچ گۆڕانكارییەكی بەسەردا بهێنێ، چونكی ئەو كەسەی پێچەوانەی دیاریكراو "التعریفات"ەكانی ئەندازە"الهندسة" دەكات، هەڵە دەكات و، ئەو كەسەیش كە دژایەتی یاساكانی دەوڵەت دەكات تاوانبار یاخود یاخی و سەركێشە. دواجار، دیاریكراوەكانی ئەندازەكە هاوڕاییان لەسەرە، لە پێناو دروستكردنی ئامێرگەلدا دەستنیشان كراون. بە هەمان شێوە، ڕێككەوتنیش لە پەیمانە سەرەكییەكەدا هەر لە پێناو هەمان ئامانجدایە كە ئەمەیە: دروستكردن و دامەزراندنی گەورەترین ئامێر لە نێو ئامێرەكاندا كە ئەویش دەوڵەتە. ئەرك و كاری ئەم ئامێرە زەبەلاحە نەهێشتنی مەترسییەكانی بارە سەرەكی و سەرەتاییەكەیە، مەترسی پاشاگەردانی و، لەناوبردنی هەموو ئەو دڕندانەی كە لە باریاندایە هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی كۆمەڵایەتی بكەن، لەسەروو هەمووشیانەوە ئەم دڕندەیە: "بیهیمۆس *Behemoth*" كە دڕندەی یاخیبوون و سەركێشییە. لە ڕاستیدا دەوڵەتیش لە بەهێزترین دڕندەگەلەكان بەولاوە زیاتر نییە و ئەمەیە: لیڤیاسان "*Leviathan*"[*4] "خوداوەندی وێرانكەر"، كە بە ڕێگا و شێوازی خۆی فەرمانڕەوایی دەكات و كە لە

ئاستیدا ئیرادە و ویستی هەر وێرانکەرێکی دیکە مت و بێدەنگ دەبێت.

کەواتە هۆبز دەوڵەت وەکی دەرەنجامێکی پێداویستی توانا سروشتییەکانی تاکەکان گەڵاڵە و ئاکامگیری دەکات و، بە تایبەت لێرەوە ئەرکە سیاسییە سەرەکییەکان لەسەر مافی سروشتی دادەمەزرێنێت. لە کاتێکدا مافی پۆزەتیڤ "کردەیی" لەگەڵ یاساگەلە پەیڕەوی لێکراوەکان لە دەوڵەتدا، جووت دەبێت، مافی سروشتی، لای هۆبز، لەسەر سەرجەم ئەو کردەوانەی مرۆڤ، کە لە چوارچێوەی وابەستەبوونیان بە پێودانگەلێکی ئەقڵانی، بە زەرورەت لە سروشتەکەیەوە بەرهەمدێن، جووت دەبێت. لێرەدا مەسەلەکە وابەستەیە بە هەموو ئەو کارانەی کە ئەگەر بە ڕێگایەکی ئەقڵانی هەڵسوکەوت بکەین دەبێت بیانکەین یاخود نابێت بیانکەین، واتە، بەگوێرەی دەربڕینە کەسییەکانی خۆی "کاتێك ئامانجمان پارێزگاریکردن دەبێت لە ژیان و لە ئەندامەکان بۆ زۆرترین کات و ماوە کە لە تواناد بێت"[(4)]. ئەرکی دەوڵەت لە ڕوانگەی مافی سروشتییەوە، بەهەرحاڵ، دەوڵەت لە ڕووی بنچینەو بنج و بناوانەکەیەوە قەرزارباری یاسایەکی سروشتی لەمجۆرەیە، لە زامنکردنی ئاشتی مەدەنی ناوخۆییدا دیار و دەستنیشان دەبێت.

ئوستاد و مامۆستا و خوێندکارانی زانکۆی ئۆکسفۆرد، ئەوانەی کە پرۆتیستۆی ئامۆژگاری و بیروبۆچوونەکانی هۆبزیان کرد و کتێبەکانیان سوتاند، زۆرچاك دەرکیان بەو مەترسییە کردبوو کە تیۆریاکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی و مافی سروشتی دەینوێنێ: بیرۆکەی ئەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا لە بوون و لەڕوایەتییاندا قەرزارباری ئیرادەی میللەتن و ئامانجیشیان خێرو چاکەی میللەتە، پێچەوانەی وێنای سەدەی ناوەڕاستە بۆ جیهان، ئەو وێنایەی کە دڵنیا بوو لەوەی پادشاکان و لەگەڵیشیاندا تێکڕای سیستەمی یەکێتیگەل و دەوڵەتەکان، خوڵقێنراوو دروستکراوی خودان. دەبوو هێزەکانی فیودالیزمیش ئەوە بەیانبکەن کە لەلایەن خوداو دابونەریتەکانەوە بۆ پاساودانی پێوەرگەل و دامەزراوە کۆنەپەرست و هەروەها مافە تایبەتەکان و جەور و ستەم، تەرخانکراون. ئەوەبوو داکۆکی لە "بڵندپایە" و لە "خوداوەندی" — کە لە دوایدا ڕۆمانیزم بە "ئۆرگانی" " *das organisch ... Gewachsene*" ناودێر دەکات — دەکرا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئامانجە ئەقڵانییەکەی قۆناغی یەکەمی بۆرجوازیی کە ئەمەیە: زۆرترین بەختیاری کە لە تواناد‌ابێت، بۆ زۆرترین ژمارە لە خەڵکی کە لە توانادا بێت. هۆبز و لەگەڵیشیدا نوێنەرە کلاسیکییەکانی تیۆریای پەیمان و مافی سروشتی، لە نموونەی گرۆتیۆس[5*] و بیفندۆرف[6*] و کریستیان وۆلف[7*] و ڕۆسۆ و هەروەها فیختە و، زۆرینەی گەورە فەیلەسوفانی بۆرجوازییەت تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم بە گشتی، بە پشتبەستن بە پەیمانی ئەسڵی و مافی سروشتی، داخوازییەکانی ئەو چینانەیان داڕشتبوو کە دەیانوویست لە دەست شێوە فیوداڵییەکان کە بووبوونە لەمپەرگەل، ئازادبن.

دروست پادشاکانیش، بە گوێرەی ئەم ڕێبازە، ئەرکگەلێکی دیاریکراویان هەیە، بەڵام نابێت مل بۆ هیچ داوا "دعوی"یەکی مەدەنی کەچ بکەن — چونکی ئەمە، لە ڕوانگەی هۆبزدا، لە ڕووی لۆژیکییەوە لەگەڵ پێناسەی پادشادا ناکۆکە و نایەتەوە — بەڵکو پێویستە ئەوانیش ڕێز لە ڕۆحی پەیمانەکە بنێن. پادشا تەنها بایەخ و گرنگی بە بەرقەرارکردنی ئاشتی ناوخۆیی نادات، هەروەها

تەنها بە دابینکردنی ژیانێك بۆ خەڵکەکەی، ژیانێکی کورتکراوە لە سادەترین شێوەدا، بەس ناکات، بەڵکو ئەرکی دەرکردن و جێبەجێکردنی یاساگەلێکە کە ئامانجیان گەشەکردوترین بوونە کە لە تواناداا بێت، بۆ هەموو هاونیشتمانیان[5].

هۆبز بە وردی ڕێوشوێنە حکومییە پێداویستەکان، بەو جۆرەی کە لەگەڵ ئەو قۆناغەدا دەگونجا، لە پێناو خۆشگوزەرانی هاونیشتمانیاندا دەپشکنێت. لەو سەردەم و ڕۆژگارەیشدا کە بازرگانی و پیشەسازی کەم پەرەسەندو بوون و دەبوو هانبدرێن، پێویست بوو مەودای هەڵسوکەوتی جێهێڵراو بۆ دەسەڵاتی میری "السلطة الحکومیة"، لەو مەودایەی دواتری دوای چەند سەدەیەکی بەرفراوانتر بێت. سیاسەتی بازرگانی "*mercantile*" لە گەوهەردا لەسەر پێداویستی بوونی چالاکییەکی دەوڵەت کە ئەرکی پاراستنی لقە بازرگانییە بۆرجوازییەکان لە ئەستۆی خۆی بگرێت، ڕاگیر دەبێت. هۆبز ئەو پێداویستیانەی لە مافی سروشتی و لە پەیمانی ئەسڵییەوە دەستخستبوو. بۆ نموونە، نووسیویەتی[6] و دەڵێت: "هاونیشتمانیان تەنها سی هۆکاری خۆشگوزەرانیان هەیە کە ئەمانەن: بەروبوومەکانی زەوی و زەریا، کار و، پاشەکەوتکردن، هەروەها دەبێت هیمەتی پادشا تەنها وابەستەی ئەوانە بێت. سەبارەت هۆکاری یەکەم، دەبێت یاساگەلێك دەربکرێت هانی کشتوکاڵ و ڕاو بدات و بەم کارەیش لە دەستکەوتی زەوی و زەریا زیاد بکات. هۆکاری دووەم کەڵك و سود لە سەرجەم یاساکان لە دژی سستی و خاوو خلیچکی وەردەگرێت و هانی کۆششکردن دەدات". (دەکرێت لەم بارەیەوە و هەروەها هەر لەو سەردەمەدا، ئاماژە بدەین بەو یاساگەلانەی کە لە دژی دەرۆزەکردن و پەرتەوازەبوون دەرچوون و کە بە گوێرەی ئەم یاسایانە و بەپێی مەرجگەلێکی گران و ناپەسەند بێکاران داخڵ بە مانیڤاکتۆرگەلێك دەکران، ئەمە لەلایەك، هاوکات دەکرێت لە لایەکی دیکەوە ئاماژە بۆ کۆمەك و یارمەتییە مادییەکان بکرێت، بە تایبەت بە نیسبەت دەریاوانییەوە). وێڕای دەریاوانی، هۆبز ئاماژە دەکات بۆ ئەو شتەی کە بایەخ و گرنگییەکی تایبەتی هەیە کە ئەمەیە: "هونەرگەلە ئامێرگەرییەکان، کە مەبەستم لە چالاکی تێکڕای پیشەوەرە لێهاتوو سەرکەوتووەکان و، ماتماتیکە بەو پێیەی سەرچاوەی هونەری دەریاوانی و پیشەسازییە"[7]. ڕاشکاوانەیش دەنووسێت و دەڵێت: "لەبەرئەوەی ئەو چەشنە یاساگەلانە بەکەڵکن بۆ ئەو مەبەستانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێدرا، هەر بۆیە ئەرکی پادشا دەرکردنی ئەو یاسایانەیە"[8].

ڕێبازی بۆرجوزای وابەستە بە خێر و چاکەی دەوڵەت کە ئەم خێر و چاکەیە بە خێر و چاکە هەرە گەورەکە دەداتە قەڵەم، لای هۆبز و هەروەها لای زۆرێك لە هەوادارانی سەرەتای بەگشتی، خاوەنی واتایەکە پەرەسەندنی دواتر گۆڕانی زۆری بەسەرداهێناوە. ئەو دەمە پەرۆشی و پێداگری بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی بیرۆکەی ئەوە بوو کە هاندانی چاکە و خێری دەوڵەت چاکترین تاقە هۆکاری زامنکردنی چاکە و خێری تاکەکانە، بەڵام ئەمڕۆکە بە پێچەوانەوە، ئەم وێنا ئەخلاقییە بە هەموو شێوە جۆربەجۆرەکانییەوە، مانای ئەوە دەگەیێنێت تاك لەبەردەم کۆدا هیچ بەهایەکی نییە و دەبێت دەستبەرداری هەموو شتێك بێت بۆ کۆ: دەستبەرداری کەس و ژیانی خۆی بێت. چەمك و واتای خێر و چاکەی دەوڵەت لە ڕووی ئەرك و کارەکەیەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، تەنانەت

خودی چەمکی دەوڵەتیش بەشت بووە و چیدی ڕەها بووە، لە سەردەم و ڕۆژگاری هۆبزدا داخوازییەکانی بۆرجوازییەت چ لە بواری جێبەجێکردن یاخود لە بواری یاساداناندا لە هەوڵ و تەقەللای ئەوەدا بوو بارودۆخی مادی زۆرینەی هەرەزۆری کۆمەڵگا چاکبکات، بەڵام لەدوایدا بەرژەوەندی دەوڵەت و بەرژەوەندی گشتی وەك دوو چەمکی چوونیەك تەماشاکران، زۆرجاریش دەوڵەت، لە پێناو پاساودانی دەستێوەردان و خۆتێهەڵقورتاندنەکانی، لە بەهانەگرتن بە ناسنامەکەی لە ئاست بەرژەوەندی ڕاستەقینەی تاکەکاندا، ئاستەنگ و دژواری زۆری هاتەڕێ. ئەگەر لە بنچینەشدا ئامانج و هۆکار، لەچوارچێوەی چەمکی خێر و چاکەی دەوڵەتدا، پەیوەندییەکی ساویلکە ئامێزیان بەیەکدییەوە هەبێت، ئەوا پەیتا پەیتا خێر و چاکەی دەوڵەت لە ڕووی تیۆرییەوە بووە ئامانجێك لە خۆیدا و بووە شت و گەوهەرێکی سەربەخۆی وەرگرت بۆ خۆی.

دروست کەموکوڕی لە ڕۆشنیدا، خاسیەتێکی باووبڵاوی نێو ڕێبازگەلە تازە دروستبووەکانە. چونکی دەوڵەت یەکبوونێکی نادیاری نێوان نەتەوەو دەوڵەتە، هەروەها دەوڵەتیش بە کۆمەڵبوونی چینگەلێکی جیاوازی خاوەن بەرژەوەندیگەلێکی جیاواز دادەنرێت، کەواتە دەوڵەت و کۆمەڵگا دوو چەمك بوون ئەو دەمە هێشتا لە یەکدی جویێ نەکرابوونەوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم جیاوازیانە پەرەیان دەسەند و، لەوەتی قۆناغی بازرگانی، بەو پێیەی پێچەوانەی ژیانی واقعیین بەشێوازێکی توند و لەسەرخۆ دەستیانکردە سەرهەڵدان و پەیدابوون ئەگەرچی هێشتا ژمارەیەك لە تیۆریاکان خۆیان هەڵواسیبوو بە چەمکەکانی هۆبزەوە و دەستبەرداری نەبووبوون. دەکرێت کەمکردنەوەی فەلسەفی لە حوکمی واقع، وەك لە فەلسەفەی ئەمێستایی و بە تایبەت لە ئاراستە جۆربەجۆرەکانی فینۆمینۆلۆجیادا دەگوزەرێ، بەو جۆرە تەماشا بکرێت کە پەیوەندی بەو پرس و مەسەلانەوە هەیە کە ئێمە لێرەدا لەبارەیانەوە دەدوێین.

ئەگەر چیدی نەتوانرێت بە کردەوە بەهانای یەکبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگاوە بچین و فریای بکەوین، ئەوا ئەو کاتە پێشبینی شێوەیەکی کۆمەڵایەتی گونجاو دەکرێت، بەڵام ئەمە وەکو گەوهەرێکی بێگەردی ڕوونی نالێڵ وا دەبێت. ئاڕاستەیەك هەیە بەرەو چەسپاندنی بیرۆکەیەك کە ناکرێت و ناشێت ڕاستی و دروستییەکەی لە نێو واقعی ڕاستەقینەدا بە "هەقیقەت" بسەلمێنرێت، لەگەڵ پشبەستنی زۆر بە ڕووداوە خاو "خام"ەکان *krude faktum* کە دەشێت "کەمێك" لە بیرۆکەی ڕووت دوور بکەوێتەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە بگوترێت هیچ شتێك لە دژی ئەو نادرکێنێت و ئاشکرا ناکات. بە پێچەوانەی ئەم ڕێگاو شێوازەوە، شیاوتر وا بوو ئەوە بچەسپێنرێت کە دەوڵەت و کۆمەڵگا لە یەکدی جیاوازن. کۆمەڵگا یەکپارچە نییە بەڵکو چەند بەشێکە، هەمیشە ڕۆڵی دەوڵەتیش بە شوێن ئەو گروپە کۆمەڵایەتییەدا دێت کە دەوڵەت لە ڕووی بابەتییەوە لە ڕەوش و بارێکی دیاریکراودا بەرجەستەی دەکات.

ڕووخسارێکی دیکەش هەیە ساویلکەیی هۆبز بەیاندەکات، کە ئەمەیە: چونکی ئەو پێی وایە دروست سیستەم و ڕژێمی ڕەها، مەرجی خۆشگوزەرانی هەمووانە و لە کاتێکدا کە بە ڕۆشنی گوزارشت لەوە دەکات تەنها بەوە ڕاناوەستێ کە ڕاستەوخۆ بیرۆکەکەی لە ڕوانگەی پرنسیپەکەیەوە دادەمەزرێنێت، بەڵکو هەروەها پێویستبوونی

خۆیشی بۆ دەرهێنانی لە مافی سروشتی و، بەتایبەت لەو ئەرکگەلانەوە کە لە دووتوێی پەیمانی کۆمەلایەتیدان، دەردەبڕێت. مافی سروشتی لە ڕوانگەی هۆبزدا لە ڕووی گەوهەرەوە ئەلتەرناتیڤی یاسای خوداوەندیی سەدەکانی ناوەڕاستە. بەشێك لە فەلسەفەی نوێ هەتا سەدەی هەژدەیەم بە بەردەوامی دەگەڕایەوە بۆ سروشت و بۆ ئەقڵ بۆئەوەی سیمای پیرۆزیی بە بەری بارودۆخە نوێیەکەدا دابڕێت. فەیلەسوفەکان نەك تەنها لە پێناوی جەماوەرەکەیاندا بەڵکو لە پێناوی خۆشیاندا پەنایان دەبردە بەر پیرۆزکردن، چونکی پیرۆزکردن وەکی بیرکردنەوەیەکی هۆشیارانە لە مانا و واتاکەی دەرنەدەکەوت بەڵکو زادەی میکانیزمێکی سایکۆلۆجییە لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە کاردەکات. گرەوی کێشمەکێشی فەلسەفی لە هۆبزەوە بۆ چاخی ڕۆشنگەری لە دەوری زانینی ئەوە تەوەری دەگرت داخۆ دامەزراوە سیاسییەکان دەستکردی خودان یان دەستکردی ئەقڵی سروشتین. تەنانەت ئەگەر دروستترین گریمانەکان لەو ڕۆژگارەیشدا بێگومان ئەم گریمانەیەی دواییان بێت، بەلام هەموویان وەهمی بوون بەو پێیەی هۆکارە ڕاستەقینەکانی دروستبوون و سەرهەڵدانی دەوڵەت پەردەپۆش دەکەن. ئەو ڕاڤەیەی پشتئەستورە بە مافی سروشتی و پەیمانی کۆمەلایەتی، بەشێوەیەکی نادیار، پێشبینی ئەوەی لەخۆ گرتووە کە دەوڵەت زادەی بەرژەوەندییە زیندووەکانی خەڵکییە، بەلام ئەفسانەی پەیمان ڕێگای بینینی ئەوە نادات کە ئەو بەرژەوەندیانە کۆك و تەبانین و دەکرێت دابەشبن و بگۆڕێن و بەم پێیە دەکرێت دەوڵەت ببێتە گوزارشتێکی ڕووت لە بەرژەوەندییەکی تایبەتی دوای ئەوەی گوزارشتێکی بابەتی بوو لە بەرژەوەندییەکی گشتی. ڕێبازی ماکیاڤیللی وابەستە بە گۆڕان و داڕوخانی شێوەکانی دەوڵەت، کە نەك تەنها شۆڕش وەکی تاوانێك تێدەگات بەڵکو هەروەها وەکی پێداویستییەکی مێژوویش لێی حاڵی دەبێت، لە ڕێبازەکەی هۆبز و جێگر "خلیفة"ە توندەکانی کە دەوڵەت لەسەر مافی سروشتی دادەمەزرێنێت، چاکتر و گونجاوتر لە واقیع تێدەگات. ڕێبازی هۆبز هیچ شتێك لە بارەی ئەو گۆڕانکارییانەوە نازانێت کە لە هەناوی ژیانی کۆمەلایەتیدا ڕوودەدەن، بەلام لە بەرامبەر ئەوەدا باوەڕ و ئیمان — کە لەو ماوەیەدا زیاتر بنجی داکوتا — بە نەمریی سیستەمی کۆمەلایەتی لەلایەن تیۆریستانی ئەقڵگەرای دەوڵەتەوە جاڕدراو لە سەدەی هەژدەیەمدا، دەسەلمێنێت.

هۆبز لەم ڕوانگەیەوە، لە ئاستی سەلیقەی گەورە سیاسەتمەداری چاخی ڕێنیسانسدا نییە، بەلام لە دوایدا گەڕایەوە بۆ ڕامانە کەرتکراوەکانی چاخی ڕێنیسانس سەبارەت پەیوەندییەکانی نێوان سیاسەت و سروشت شانبەشانی نمایشکردنی بەشێوازێکی میتۆدیانە. ئەوجا ئەگەر هۆبز بەشێوەیەکی توند و تیژتر لە ماکیاڤیللی، لەهەمبەر نائەخلاقییەتی لەمەڕ داماڵینی پەیوەندییە ڕاستەقینەکانی نێوان بیرۆکە و واقیع، مایەی قین و سەرزەنشت نەبووبێت، دەکرێت ئەمە تاڕادەیەك بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوەی کە کتێبەکانی ماکیاڤیللی بەو شێوازە ناسیستماتیکییەی کە هەیانە، لە کتێبە پتر ئەبستراکتەکانی هۆبز سادە و ڕەوانتر بوون. هەرگیز هۆبز لە ماکیاڤیللی ئیتالی کەم ژیرتر نەمایەوە، بەڵکو بەوەی کە پەنایبردە بەر پاساودانی لە قولایدا، لەو توندوتیژتری کرد. ڕاستییەکی دیکەش هەیە لەباریدایە ڕاڤەی ئەو پارێزگاری "حصانة"ە بکات کە هۆبز هەیەتی: چونکی ئەم

کتێبەی سپینۆزا: "پەیامێك لەمەڕ لاهوت و سیاسەت"، کە پاش ماوەیەکی کەم پایەکانی جیهانی لەقاند، لە دەوری هەمان ئەو مەسەلەگەلانە تەوەری دەگرت و بەشێوازێکی وەکی شێوازی هۆبز چارەسەری دەکرد. لەپاش ماوەیەکی کەم لە دەرچوونی، هۆبزی بەساڵاچوو کتێبەکەی سپینۆزای خوێندەوەو، بە گوزارەگەلێکی نادیار و ناڕۆشن "ڕەنگە لە ترسی ئەو کوورە "محرقە"یە بوو بێت کە هێشتا لە ئینگلتەرا کڵپەی دەسەند" ئەوەی درکاند کە کتێبەکەی سپینۆزا بە زمانێکی ئازاو بوێرانەتر لە زمانی ئەو گوزارشت لە هەمان ئایدیا و بیروبۆچوونەکانی ئەو دەکات.

هۆبز لە بنەما و پرنسیپە فەلسەفییە گشتییەکانی خۆیەوە ئاکامگەلێکی سیاسی و کەلتوری هەڵدەهێنجێت کە پێکڕا لەگەڵ بیروڕا مێژوویی فەلسەفییەکانی کۆمەڵێك نووسەری دیکەدا دەگونجێت و، تێکڕا ئەو شتەیان دروستکردووە کە دەکرێت بە ئاقاری ماتەریالی لە فەلسەفەی مێژوو لای بۆرجوازییەتی سەرکەوتوو، ناودێری بکەین. هەریەك لە ماکیاڤیللی و سپینۆزا و پیربایڵ و ماندفیل و هەندێك لە بیریارانی ڕادیکاڵی قۆناغی ڕۆشنگەری لە فەرەنسا لە نموونەی دۆلباخ و هلفتیۆس و کۆندۆرسێ نوێنەرایەتی ئەم ئاراستەیە دەکەن.

میتۆدی بیرکردنەوەی ئەوان بەمجۆرەیە: لە دەرەوەی سروشت و لە درێژبوونەوە لە بۆشایی ئاسمان "الفضاء"دا هیچ واقعێك لە ئارادا نییە. خودی مرۆڤەکان خۆیان کەرتێکن لە سروشت و وەکی سەرجەم بوونەوەرەکانی دیکە ملکەچی یاسا گشتییەکانین. مێژوو چیدی نییە جگە لە گێڕانەوەی ڕستێك ڕووداوی تایبەتمەند بە سروشتی مرۆڤایەتی، کتومت وەك چۆن پاشماوەکەی تری مێژووی سروشتی وەسفی ڕووداوگەلێك دەکات کە لە مەیدانگەلێکی تری سروشتدا ڕوودەدەن. هەمیشە زانینی ڕاستەقینە دەگەڕێتەوە بۆ واقیعی سروشتی، واقیعی سروشتیش وەکی یەك لە سروشتی نائۆرگانی و ڕووەکی و زیندەوەری و مرۆڤایەتی، لای تاکەکان و لەو کۆمەڵگایەدا کە لەوان پێکدێت، بەرجەستە دەبێت. تەنانەت دەوڵەت و کۆمەڵگایش – کە هێشتا دوو چەمکی لەیەکدی جیانەکراوەن – سەر بە واقیعن، چونکی دوو شێوەن لە شێوەکانی ڕێکخستنی تاکەکان. دەبێت وەکی هەر ئامێرێکی تری بزواویش – لەبەرئەوەی بەرجەستەی پەیوەندیگەلی نێوان کەرتگەلێکی واقیعی دەکەن – بە واقیعی دابنرێن و تەماشا بکرێن. مەسەلەی پەیوەندی نێوان ڕۆح و جەستەیش دیسان هەر ڕێگای دروستبوونی چەمکگەلێك کە لەسەر سروشت جوت نابن، نادات، چونکی دروست بە کردەوە نە ڕۆحگەلێکی سەرفرازی هامڕای جەستە یاخود سەربەخۆ لە جەستەو نە تارمایی و خێو و نە فریشتە و شەیتانگەلێك هەن سەروو سروشتی بن. هەموو کردەوە مرۆڤایەتییەکان، ئیدی چ کردەوە گەلی هۆشیارانە یاخود ناهۆشیارانەی ئیرادی یاخود نائیرادی بن، ملکەچی پێداویستیی یاساکانی سروشتن.

بەڵام ئەگەر مەسەلەکە بەو جۆرە بێت، دەکرێت ئەو کاتە بپرسین چۆن وێنا و بۆچوونە ئاکاری و میتافیزیکی و ئایینییەکان پەیدا بوون و سەریانهەڵدا، چۆن خەڵکی بە درێژایی سەدەگەلێك ملکەچی باوەڕ بە بوونی بابەتگەلێکی ناسروشتی بڵند و بالابوون. سەرچاوەی ئەم چەوتیگەلە سەرنجڕاکێشانە و ئامانج لێیان چییە؟ ئەمەیە بناغە گەوهەرییەکانی گرفتی ئایدیۆلۆجیا بەرباس

دەخات، کە تەنها قۆناغی دوای هیگڵ دەتوانێت بە میتۆدگەلێکی گونجاو بچێتە نێو بنج و بناوانەکەیەوە. وەڵامی هۆبز و جێگرەکانی – کە وەڵامێک بوو هەروەها ماکیاڤیللیش نیگاری هێڵە پانەکانی کێشابوو – ئێجگار سادە و ئاسانە و بەمجۆرەیە: هەموو ئەو وێنایانەی کە لە تیۆریای ڕاست و دروستی سروشتی مرۆڤایەتی و سروشتی دەرەکی لادەدەن، خەڵکانێک لە پێناوی زاڵبوون بەسەر خەڵکانێکی تردا دروستیان کردووە. لە نێو بنچینەی ئەم ئایدیایانەدا فێڵ و تەڵەکەبازی دەبینین. هەرچی هۆکارەکانیشێتی لەلایەک ویستی زاڵبونە و لەلایەکی دیکەش فەرامۆشکردنی ئەویترە، هەرچی ئامانجەکانیشیانە بۆ پارێزگاریکردنە لە هێزی ئەو کەسانەی کە پەخشو بڵاویان دەکەنەوە. کڵێساو کەشیشەکان، بەوپێیەی بەرجەستەیەکی ئەو فۆرمە کۆمەڵایەتییەن کە تیۆریا تازەو نوێیەکان پەلاماریان دەدەن و هێرشیان دەکەنە سەر، وادیارە ئەمان بەرپرسیارن لەو هەڵە و چەوتییانە لە مێژووی ڕۆحییدا. ئەم ڕێبازە لەوەتی سەرهەڵدانییەوە بە ئاواتی "گونجان و لەباربوونێکی سەرتاپاگیر"ەوە بوو: چونکی نەک بە تەنها دەبێت بۆ ئەو چینە کۆمەڵایەتیانە لەبار بێت کە بە درێژایی مێژووی ڕابردوو شێوە کارتێکردنێکی چالاک کاریان لە حکومەتەکان کرد، بەڵکو ماکیاڤیللی و هۆبز سپینۆزا هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە جێبەجێ نەکردنی ئەم ڕێبازە مانای ئەستەمبوونی هەر دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەو، بەم پێیە ئەستەمبوونی دەوڵەتی تازەیشە: پێویستە دەوڵەتی تازەیش هۆکارەکانی هێزی ئایدیۆلۆجی لە نێو دەستی دەسەڵاتە کۆنەکان دەرکێشێت و ئەگەرچی ئەوە بەدیاریکردنی بەکارهێنانیشی بێت بەشێوەیەکی چالاک و ژیرانە پراکتیزەی بکات.

دابڕینی بەهایەکی مێژوویی فەلسەفی گشتی لەلایەن ئەو بیرمەندانەوە بەسەر وێنایاندا بۆ پێداویستیی ئایدیۆلۆجیا، بێ هیچ دوودڵی و گومانێک ڕاڤەی هۆکاری ڕەتکردنەوەیان دەکات لەلایەن ئەدەبی سیاسی دوای خۆیانەوە. لە لیڤیاساندا ئەمە دەخوێنینەوە: "ئەگەر ئەو تیۆریایەی کە دەڵێت گۆشەکانی سێگۆشە یەکسانە بە دوو گۆشەی چوارگۆشەیەک پێچەوانەی مافی زاڵبوون و باڵادەستیی لای کەسێک لە کەسان بووایە، یاخود بە دەربڕینێکی ڕاستتر و وردتر، پێچەوانەی بەرژەوەندی ئەوانە بووایە کە زاڵ و باڵادەستن، ڕەنگە ڕەتنەکرایەتەوە، بەڵام ئەز کەمترین گومانم لەوە نییە کە هەموو کتێبەکانی ئەندازە "الهندسة" تووڕ هەڵدرابوونە نێو ئاگرەوە لەبەرئەوە پەیوەندیداران بەو جۆرەیان کردووە"[9].

هۆبز شیکردنەوە گەلێکی دوور و درێژ لە مەڕ کەڵکی ئایین بۆ ئەکلیرۆس بەردەست دەخات، تەنانەت ئەبستراکترین ڕێبازە فەلسەفییە سکۆلاستیکییەکانیش ملکەچی پەیوەندییە بەرژەوەندیگەرییە ڕاستەقینەکان دەبن. نموونەی ئەوەش لە گفتوگۆی یەکەم لە بیهیمۆسدا[10] دەبینین. گفتوگۆکاران ناویان (أ) و (ب)یە، أ لە دوای مشتومڕێکی درێژخایان سەبارەت بە سکۆلاستیکیزم، مانای پەسەندکردن و گرتنەخۆی فەلسەفەی ئەرستۆتاڵیسی شیدەکاتەوە. هەروەها فەلسەفەی ئەرستۆتاڵیسییش "کرابووە توخمێک لە نێو ئاییندا چونکی ڕێگا و بواری داکۆکی لە بڕێک بەشگەلی نابەجێ لە عەقیدە لەهەمبەر سروشتی جەستەی مەسیح و ڕەوشی فریشتەو قەدیسەکان لە بەهەشتدا، دەدات و، پارێزگاری لەم بەشگەلانە دەکات تاببنە بەشێک لە عەقیدە چونکی هەندێکیان دەبنە مایەی کەڵک و سود بۆ ئەکلیرۆس و،

هەندێکی تریان هەروەها مەرجی ڕێزلێنان لە نزمترین پلەداریان دەسەپێنن. چونکی پاش ئەوەی میللەتیان خستە خەیاڵی ئەوەی سادەترین کەسیان توانای بەرجەستەکردنی جەستەی مەسیحی هەیە، دەپرسم کێ دەتوانێت و لە باریدایە ڕێز لەوان نەنێت یاخود لە دەستبڵاویدا لە ئاست ئەوان و کڵێسادا ڕژدو پیسکەبێت، بە تایبەت لە کاتی نەخۆشی و ناساغیدا یاخود کاتێك کە پێی وا دەبێت ئەوان بەرجەستەی فریادڕەس دەکەن یاخود ڕزگارکەر دەهێنن". ب دەپرسێت و دەڵێت: "بەڵام ئەو کەڵك و سودە چییە کە دەشێت فێڵ و تەڵەکەبازییەکانیان لە ڕێبازەکەی ئەرستۆی وەربگرێت؟" أ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "ئەوان پتر لە ڕێبازەکەی، ناڕۆشنی و دردۆنگییەکەی بەکاردەهێنن. هیچ کتێبێك نییە لە مەڕ فەلسەفەی کۆن کە بتوانرێت بە لێهاتوویی کتێبەکانی ئەرستۆ لە شپرزەکردنی خەڵکی بە واژەگەل و لە بەرپاکردنی ئاگری ناکۆکییەکاندا کە بەزەرورەت لە ڕێ و ڕەسمەکانی کڵێسای ڕۆما کۆتایی پێدەهات، بەراوردبکرێت. ئەوان وێڕای هەموو شتێك چەند چەمکێك لە ڕێبازە ئەرستۆتاڵیسییەکە بەکاردێنن، بۆ نموونە وەکی گەوهەرە لەیەکدی جوداکان". ب: "مەبەست لە گەوهەرە لەیەکدیجوداکان چییە؟" أ: "هەموو ئەوانەی کە هەن". ب: "من دەرکی گەوهەری شتێك ناکەم کە بە کردەوە بوونی نەبێت، بەڵام تۆ بڵێی کاریان پێی چی بێت؟" أ: "شتگەلێکی زۆر بە نیسبەت ئەو مەسەلانەی کە وابەستەن بە سروشتی خوداو چارەنووسی ڕۆح لە دوای مردن و، لە ئاسمان و، لە دۆزەخ و لە خاوێنگە. تۆ بۆ خۆشت وەکی هەمووان دەزانیت چۆن چۆنی گوێڕایەڵیی خەڵکی دەستەبەر دەکەن و لە ڕێگای ئەم هۆکارانەوە پارەوپولی بێ شوماریان لێوە دەستدەخەن. هەرچی ئەرستۆیە بە پێچەوانەوە، ڕۆح بە هۆکاری یەکەمی جوڵەی جەستەکان و بەم پێیە جوڵەی خودی ڕۆح دادەنێت. ڕۆحی بە ئامانج و مەبەستی قەدەرییەت و ئازادی هەڵبژاردن بەکارهێنا. هەرچی سەبارەت ئەو قازانجەیشە کە بەو هۆیەوە دەستیدەخەن و، چۆن چۆنی دەستیدەخەن، من هیچ ناڵێم".

دواتر گفتوگۆکە باس لە کاری هەندێك لە بۆچوون و ئامۆژگارییەکانی تری ئەرستۆو، جیاوازی نێوان فەلسەفەکەی و فەلسەفەی سکۆلاستیکی دەکات، ئینجا لەناکاو ئاقارێکی نوێ وەردەگرێت(10): ب "ئەمێستا دەرکم بەو ڕێگایە کرد کە بەهۆیەوە لۆژیك و فیزیك و، میتافیزیکای ئەرستۆتاڵیسی بەکاردەهێنن، بەڵام هێشتا لەوە حاڵی نەبووم کە چۆن چۆنی بۆچوون و ئامۆژگارییە سیاسییەکانی بەکاردەهێنن." أ: "هەروەها منیش: پێموایە، وێڕای ئەو زیانە گەورەیەی کە لە ناکاوێك لێمانکەوت، ئەوان کەڵکێکی زۆریان دەستگیر نەبوو. چونکی ئەو خەڵکانەی کە لە گەوجێتی کەشیشەکان وەڕست بوون و خوازیاری پشکنینی هەقیقەتی ئەو ڕێبازە بوون کە بەسەریاندا سەپێنراون، لە ڕێگای خوێندنی یۆنانی و لاتینییەوە خۆیان خەریکی گەڕان کرد بە دوای واتای کتێبە پیرۆزەکاندا بەو جۆرەی کە لە زمانە زانستییەکاندا هەیە، ئیدی بەم چەشنە ئاشنای پرنسیپە دیموکراتییەکانی لای ئەرستۆ و شیشرۆن بوون و، پاش ئەوەی سەراسیمەی ڕەوانبێژییان بوون شەیدای سیاسەتیان بوون و ئەمەش بووە مایەی ئەو یاخیبوونەی کە ئێستا باسی دەکەین". ئەو ئەقڵانییەتە کە بیرمەندە ڕادیکاڵە فەرەنسییەکان لە سەدەی هەژدەیەمدا دەیانویست لە ڕوانگەیەکی پڕوپاگەندە خوازانەوە بیکەنە داینەمۆیەك بۆ

ڕووداوەکان بۆ بەرژەوەندی بۆرژوای لاوی وڵاتەکەی خۆیان، هۆبز "کە بۆرجوازییەت لە وڵاتەکەیدا زامنی بەشدارییەکی گرنگی لە دەسەڵاتی گشتیدا کردبوو" بڕوای وابوو ئەو (ئەقڵانییەت)ە، هۆکاری ڕاستەوخۆی، بەڵام مەترسیداری، ئەو ڕووداوە مێژووییانەیە کە هەتا ڕۆژگاری خۆی ڕوویاندا. ئەقڵانییەتێکە لە فاکتەرگەلێکی ماددییەوە بەرهەمدێت و زەمینە بۆ شۆڕش دەسازێنێ.

هۆبز، بە پێچەوانەی ئەو فەیلەسوفە فەرەنسیانەوە کە خەمی سەرەکیان ململانێ بوو لە دژی دوایین شوێنەوارەکانی فیودالیزم، تا ڕادەیەك مژدەدەری جاڕدەری سەرەتای سیستەمی کۆمەڵایەتی نوێیە و، ئەوجا لە دوای ئەم حوکمە لەسەر ئەقڵانییەت ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر ئەو ئاکامانەی کە دەکرێت لە هەمبەر دەوڵەتی تازە هەڵبهێنجرێن. لەبەرئەوەی کە خەڵکی، بەهۆی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی سروشتی "غەریزی"انەوە، بەوپەڕی ئاسانی جڵە و بۆ وێناگەلێکی ئاکاری و ئایینی شل دەکەن، یاخود لەبەرئەوەی ئەو کارتێکردنە ئایدیۆلۆجیانەی کە لەم چەشنەن — وەکی ڕابوردوو بۆمانی بەیاندەکات— چەکێکی گرنگن بە دەستی دەسەڵاتدارانەوە، هەر بۆیە پێویستە دەوڵەتی نوێ لە هێزەکانی ڕابوردووی دابماڵێت و خۆی شێوە بەکارهێنانێکی تەواو هۆشیارانە بەکاریبهێنێت.

لە بنەڕەتدا، ئەوە زانکۆکان بوون لە چاخی ناوەنددا، کە ڕێگایان بۆ گەیشتن بەم چالاکییە ئایدیۆلۆجییە خۆشکرد: ئەمە بیروڕا و بۆچوونی هۆبزە. ئەو زانایانەی کە لە نێو ئەم زانکۆیانەدا پێگەیشتن پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە بەهرە و توانا فیکرییەکان تا بەو جۆرە ناوبانگ دەربکەن و بناسرێن کە تاقە گروپن توانای بەردەستخستنی حوکمگەلێك لەمەڕ مەسەلە چارەنووسسازەکانی مرۆڤایەتیان هەیە. لە نێو زانکۆکاندا مەشق و ڕاهێنانیان دەکرد "هێزی خۆیان پێشچاو دەخست تا ئەوە پیشانی گوێگرانیان بدەن کە پێی سەراسیمە دەبن و، تا هێزی تێگەیشتنی ڕاستەقینە بپێچن بە (قولاپگەلێکی واژەییەوە): مەبەستم لەو لێهاتووییانەیە کە بێ مانان و تەنها بۆ سەرسامکردنی خەڵکانگەلی نەزان و نادان بەکاردەهێنرێن. ژمارەی ئەو خوێنەرانەی کە توانای تێگەیشتنیان هەبوو بە جۆرێك کەم بوون کە دکتۆرە هەڵکەوتووە نوێیەکان هیچ بایەخ و گرنگییەکیان بەوەی کە دەکرا ئەو خوێنەرانە بیر لێ بکەنەوە، نەدەدا. دەبوو ئەو مامۆستایانە پێ لە هەموو ئەو بەشانەی عەقیدە بنێن کە پاپاکان بەهۆیەوە ناوبەناو ئیمانیان فەرز دەکرد و دەسەپاند، (...) هەروەها لە زانکۆکانەوە هەموو کەشیشەکان دەرچوون و بەنێو شار و گوندەکاندا پەخش و بڵاوبوونەوە بۆ تۆقاندنی میللەت و پاراستن و هێشتنەوەی لە دۆخی گوێڕایەڵیی بێ مەرج بۆ یاسای پاپاییدا"[11].

پێویستە ئەم هۆکارە کە بە درێژایی مێژوو بایەخ و گرنگی سەلماوە، ئەمێستا بۆ خزمەتی مەسەلەیەکی تازەو باش بەکاربهێنرێت کە ئەمەیە: مەسەلەی دەوڵەتی بۆرجوازی. لە ڕوانگەی هۆبزدا، ئاشتی ناوخۆیی تەنها بەهۆی ئەو ئایدیایانەوە کە لە نێو زەین و بیری خەڵکیدا دەچەسپێنرێن، دیار و دەستنیشان دەبێت. کەواتە پێویستە زانکۆکان دروست بکرێن بەو پێیەی شەتڵگە سەرەکییەکانی ئایدیا باو وبڵاوەکانن، دەبێت بە جۆرێك دروست بکرێن کە ڕێکخستنی کاری زانستییان لەگەڵ پێویستییەکانی دەوڵەتدا بگونجێت. ئەوەی کە لە

سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ بەرژەوەندی کڵێسای کرد، دەبێت ئێستاکە لەپێناو دەوڵەتی نەتەوەیی خاوەن سەروەریی و دامەزراو لەسەر مافی سروشتی و کە بەم پێیە باشترین جۆری حکومەتەکانیشە، بیکات. هۆبز بوار بۆ کەمترین شك و گومان لەم مەسەلەیە ناهێڵێتەوە: "وەهمی پوچی بە توندی وابەستە بە سەقامگیری دەوڵەتەوە لە نێو دڵ و دەروونی خەڵکە نادان و نەزانەکەدا دەچەسپێ و بەشێکی ئەم کارە بەهۆی پەند و ئامۆژگاری و بەشەکەی تریشی بەهۆی هەڵەوەڕیی ڕۆژانەی خەڵکانێکەوە جێبەجێ دەبێت کە کاتێکی ئەوتۆیان هەیە بۆ خوێندنەوەی کتێب چونکی لەوە بەولاوە هیچ کارێکی تریان نییە بیکەن، ئەم خەڵکانە بیروڕاکانی خۆیان لەو مامۆستایانەوە وەردەگرن کە لە نێو زانکۆ گشتییەکاندا لاوان پێدەگەیەنن. ڕاستتروایە، لەلایەکی دیکەوە، لەو پێناوەدا بە زانکۆکان دەستپێبکرێت ئەگەر هەر خواستێك بۆ سەپاندنی ڕێبازگەلی ڕزگاربوون هەبوو. بەڵکو دەبێت لێرەدا بنەما ڕاستەقینە سەلمێنراوەکان بەجۆرێك درێژبکرێنەوە و فراوان بکرێن کە هەروەها بۆ زانستی سیاسییە، ئیدی بەم جۆرە ئەو لاوانەی کە تیایدا پەروەردە و فێردەبن دەتوانن ئەو بنەمایانە بگوێزنەوە بۆ جەماوەری خەڵکی لە کۆڕ و ئەنجومەنە تایبەت و گشتییەکاندا. ئەم کارەیش بە ئەندازەیەك لە هیمەت و سەرکەوتن ئەنجام دەدەن کە خودی خۆیان قەناعەتیان بە هەقیقەتی ئەو شتەی کە ڕایدەگەیێنن و خەڵکی پێ پەروەردە دەکەن زۆر زیاتر دەبێت[12].

پێدەچێت ئەو سیماو مۆرکە ئاسانکراوە توندو ڕەقەی کە خاسیەتێکی جیاکەرەوەی شێوازی گوزارشتە لەم ئایدیایانە، ئەو کاتە ڕۆشنتر بێت کاتێك کە هۆبز دەست دەکاتە تاوتوێکردنی ناوەڕۆکی ئەو پەروەردەیەی کە پێویستە دامەزراوە گشتییەکان لە بواری زانستی ئاکار و لێکدانەوەی ئاییندا پێشکەشی بکەن. ئەگەر پەروەردە توانیبیشێتی بە هەموو دڵنیاییەکەوە ڕاشکاوانە پێشنیاری ئەوە بکات ئەو ئارامی و ئاسایشەی دەوڵەت کە بانگەشەی بۆ دەکات تاقە بناغەی یاسایی واقعییە لە نێو هەموو ئەرکەکانی مرۆڤدا، ئەمە چونکی بەرژەوەندییەکانی ئەو دەوڵەتە لە ڕۆژگاری ئەودا زیاتر لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینە پەیماندەرەکانی نێو میللەتی ئینگلیزدا تەبابوو. دەکرا، لە سای نەبوونی جیاکردنەوە لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا لەو کاتەدا، لەو چوار چێوەیەدا زامنی بڕواکردن بە بیرۆکەی وابەستەبەوەی هەر ئاکارێك لەگەڵ یاساکانی دەوڵەتدا وەك یەکیان لێ دێت، بکرێت، کە هێشتا لە مافی سروشتی وەك چاکەیەکی وابەستە بە بەرژەوەندییە مەدەنییەکانەوە، نەهاتووە. ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیە نەبووایە، ئەودەمە هۆبز جارێکی دی ئەو هەڵەیەی ماکیاڤیللی کە پێی وایە هۆکارەکانی قەڵەمڕەویی ئایدیۆلۆجی بە میرات بۆماوە لە سەدەکانی پێشووەوە تەنها ئەو کاتە دەتوانرێت چالاکانە بەکارببرێن ئەگەر لەسەر دەورەدانی ئامانجی خۆی بە ناڕۆشنییەکی نامۆ بەردەوامبێت، بەرچاو نەدەکەوتەوە. دەوڵەت لای هۆبز زامنکردنی زیاترین خۆشگوزەرانییە کە لە توانادابێت، بۆ زۆرترین ژمارە لە هاوڵاتیان کە لە توانادا بێت. بەڵام لە حاڵەتی تێرنەکردنی ئەم مەرجەدا لەلایەن دەوڵەتەوە و، وەختێك کە ئەوپەڕی پێویستی بە هۆکارەکانی هێزی دەبێت، ئەوکاتە پێویستە ڕێبازەکەی هۆبز ڕاشکاوانە پەیوەندییەکانی نێوان دەسەلاتی دەوڵەت و بەها ئایدیالەکان کە خراپترین دەرەنجامیان

لێدەکەوێتەوە، بەیان بکات. بە دڵنیاییەوە خودی خۆی داوای کردووە کە وەکی مەرجێکی سەرکەوتنی فێرکردن و پەروەردەکردنی گشتی، مامۆستایان بڕواو قەناعەتیان بە ڕاستیی ئەو بیروڕایانەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن و خەڵکی پێ پەروەردە دەکەن، هەبێت. بەڵام بەکارهێنانی هەقیقەت وەکی هۆیەکی قەڵەمڕەویی و دەسەڵات، لە مێژوودا سیما و ڕووخسارێکی تایبەتمەندی هەیە. دروست واپێدەچێت هەقیقەت وابەستەی چینە ڕوو لەسەر و سەرکەوتووەکان بێت. بەڵام گۆڕاوو ناپاکە. لەگەڵ سەقامگیربوونی ئەو چینانەدا، لەو ئایدیایانە جوێ دەبێتەوە کە ڕەوایەتی خۆیان لە میانی ئەو پرۆسە لەسەر خۆیەی سەقامگیربووندا دەبیننەوە. هەرچی دەقی ئەو فۆرمانەیشە کە بە قەناعەتەوە جاڕدراون و بڵاوکراونەتەوە دەکرێت وەکی خۆی بێ هیچ گۆڕانێك بمێنێتەوە و وەکی دروشمی "ئازادی، بەرابەری، برایەتی" بە دەروازەی بەندیخانەکانی کۆماری فەرەنساوە، هەقیقەت لێی دوورناکەوێتەوە.

بیرۆکەی ئەوەی دەسەڵاتدار "حاکم" تاقە کەسە لە سیاسەتدا کە ناتوانێت لەگەڵ هەقیقەتدا هەڵبکات و بە ئاشتی بژی، بیرۆکەیەکە هۆبز هەر لە سەرەتاوە پێی لێدەنێت. وەختێك کە دەشڵێت پێویستە دەوڵەت کڵێسا و ئایین بخاتە پێناوی خزمەتی خۆیەوە، ئەمە لای ئەو مانای بەکارهێنانی دەوڵەتیانەی وەهمەکانە، چونکی لای ئەو واژەی زانین تەنها و تەنها لەسەر ناوەڕۆکی هەردوو زانستی سروشت و سیاسەت جوت دەبێت. "ئارەزووی ئەو وێنایە ناکەم کە ئایین دەکاتە زانست، لە کاتێکدا کە پێویستە یاسا بێت. چونکی ئەگەرچی ئایین لە هەموو دەوڵەتاندا هەر هەمان ئایین نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە نێو هەموو نەتەوەیەکدا هەر شیاوی تاوتوێکردن و قسە لەسەر کردن نییە"[13]. پێویستە دەوڵەت کۆی ئەو وەهمانەی کە بۆ ئامانجەکانی بەکەڵکن بە ئایین ناودێر بکات و، پەرستن و پەخشکردنی پەسەند بکات و بە گوێرەی پێڕەوی کڵێسای ئەنگلیکانی سەرپاکی لەشکرێك لە کەشیشگەل لە ئەستۆی خۆی بگرێت. لە سەرەتادا کەشیشەکان ئایینیان بە دەستی ئەنقەست و بۆ ئامانجی تایبەتی خۆیان داهێناو پەروەردەکرد، ئەمێستایش پێویستە دەوڵەت ئەم کارە بکات: "ترس و ڕامکردن لە هێزگەلی نادیار و شاراوە، ئیدی چ هێزگەلی خولقێنراو بن یاخود لە دابونەریتەکانەوە وەرگیرابن، وەختێك کە بەبڕیارێك لەلایەن دەوڵەتەوە دادەمەزرێت پێی دەگوترێت ئایین و، باوەڕێکی پوچیشی پێ دەگوترێت کاتێك کە بە بڕیارێك لەلایەن ئەو دانەمەزرێت"[14]. کەواتە پێویستە ترس، بەو پێیەی خاسیەتێکی سەرەکییە لە سروشتی مرۆڤایەتیدا، بە هۆی ئایینەوە بخرێتە پێناو خزمەتی دەوڵەتەوە: پێویستە لە بنەڕەتدا بۆ زامنکردنی گوێڕایەڵیی لەبەردەم یاسادا و بۆ چاودێری ڕەوشتبەرزی بۆرجوازیی بەشێوەیەکی گشتی، بەکاربهێنرێت. "هەموو ئەوەی کە مافی خۆمانە لە هەردوو بواری ئیمان و ئاکاردا لە ژیانی ڕۆحی داوا بکەین – من پێی لێدەنێم – کە لە دووتوێی کتێبی پیرۆزدا بە سادەترین شێوە کە لە تواناادا بێت، پێشچاو خراوە و، ئەمەیە: ئەی منداڵەکان گوێڕایەڵی دایك و باوکتان بن، ئەی خزمەتکاران گوێڕایەڵی سەردارەکانتان بن! ئەی پیاوان ملکەچی دەسەڵاتی باڵا، ملکەچی خودی پادشا یاخود ئەو کەسە بن کە لەلایەن ئەو نێردراوە! بە هەموو ئازای گیانتانەوە خوداتان خۆش بووێت و وەك چۆن خۆتان خۆشدەوێت خزم و کەسی خۆتانیش خۆش بووێت! ئەمانە

واژەگەلێکن لە کتێبی پیرۆز و هەرگیزاو هەرگیز پێویستیان بە لێدوان و قسە لەسەر کردن نییە. بەڵام ئەوەی کە نە منداڵان و نە زۆرینەی خەڵکی تێیدەگەن، ئەوەیە بۆچی پێویستە لەسەریان وا بکەن. ئەوان پێیان وانییە کە ئارامی و ئاسایشی دەوڵەت و، بەم پێیە ئارامی و ئاسایشی تایبەتی خۆیان، بەندن بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیانەوە"[15].

مەسیح کە بە گوێرەی سەردەمی کۆن فریادڕەسی بەڵێنپێدراوە، هۆبز وەکی بەشێك لە عەقیدە، بەو پێیەی کە مەرجێکی بەسە بۆ ڕزگاربوونی ڕۆح، دەیهێڵێتەوە، چونکی مرۆڤ بەمشێوەیە ئارەزووی پێ لێنان بەوەدا دەکات کە خۆبەستنەوە بە وەسیەتنامەکانەوە دەرفەتی دەستخستنی ڕزگاربوونی تاهەتایی دەڕەخسێنێت. هۆبز لە کۆتایی بەشی یەکەمی گرنگی بیهیمۆسدا[16] دەڵێت: پێم وابێت پێویستە خەڵکی بە خۆشویستنی گوێڕایەڵیی قایل بکەین، پێویستە لەو پێناوەشدا مژدەدەرو پەیامبەرەکان پرنسیپ و بنەما باشەکان لە زانکۆکان لە قۆناغی لاوێتیدا هەڵبهێنجن. ئەگەر زانکۆکان بەم ئاقارەدا چاکسازی نەکرێن و ئەگەر ئەکلیرۆس دەرك بەوە نەکات کە جگە لەو دەسەڵاتەی کە دەسەڵاتی مەدەنی باڵا پێیاندەبەخشێت هیچ دەسەڵاتێکی دیکەیان نییە، نابینە خاوەنی ئاشتییەکی هەمیشەیی. ئیدی بەم جۆرە ئایین "ترس لە هێزگەلە نادیار و شاراوەکان"، بە ڕێگایەکی هۆشیارانە دەخرێتە پێناو خزمەتی دەستگرتن بەسەر کۆمەڵگادا.

شێوەی بیرکردنەوەی هۆبز، بە گوێرەی هەڵوێستە مێژووییەکەی وەکی فەیلەسوفێکی بۆرجوازییەتی سەرکەوتوو، دروست بە تەنها ئاراستەی چەسپاندنی وێناو تیۆریا کۆمەڵایەتییەکان لەخۆناگرێت، بەڵکو — وابەستە لەگەڵ ئەویشدا — ئاقاری داخڵبوون تیایدا ڕەخنەییشە.

هۆبز ئەم ڕستەیەی نووسی: "هەموو هاوڵاتییەکی ئاسایی — چونکی ئایدیاکان ئازادن — ئازادی تەواوی هەیە کە باوەڕی هەبێت یاخود باوەڕێکی قوڵی بەو ڕووداوانە کە وەکی موعجیزە گەلێك پێشدەستخراون، نەبێت. بەهۆی ئەو چالاکانەش کە باوەڕی میللی بەسەر ئەو کەسانەیدا دادەبڕێت کە موعجیزە دەچەسپێنن و پابەندی دەبن، ئەو هاوڵاتییە ئاساییە دەتوانێت ئەنجامگیری ئەوە بکات کە داخۆ دەبێت ئەو ڕووداوگەلانە بە موعجیزە گەل یاخود درۆ و دەلەسە تەماشا بکرێن"[17].

ئەم ڕێگاو شێوازە لە ڕوانیندا، مشتومڕێکی مێژوویی شیاوی تەقینەوەی گرتۆتەخۆ، دروست کاتێکیش کە ئایدیاکان دەستبەرداری ڕەهەندە "تایبەتمەند" سەرەتاییەکەیان دەبن و دەست لە باوەڕ بوون بە موعجیزەکان هەڵدەگرن و، چالاکییەکی کۆمەڵایەتی، بەو پێیەی ڕەخنەیەکی سەرتاپاگیری ئایدیا باو وبڵاوەکانە، پەیدا دەکەن، هەر دەتەقێتەوە.

ئەو گرفتە سەرەکییەی کە لێرەدا فەلسەفەی مێژوو لای هۆبز دەیوروژێنێت، وەکی پێشتر ئاماژەمان پێدا، گرفتی ئایدیۆلۆجیایە. بێگومان ئەم چەمکە کە لە واقیعدا ناوەڕۆکێکی بە بڕشتتری لەخۆگرتووە، لای هۆبز بوونی ئاشکرانەبوو بەڵکو شاراوە بوو. ئەم چەمکە لای هۆبز واتایەکی کورتی هەیە، کۆی ئەو ئایدیایانەیە کە لە قۆناغێکی دیاریکراو لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا باووبڵاوە و بۆ پارێزگاری لە شێوەی ئەو کۆمەڵگایە بە کەڵکە. دەکرێت ڕوانگەی هۆبز و لەگەڵیشیدا ڕوانگەی

سپینۆزا و چاخی ڕۆشنگەری بەشێوەیەکی گشتی، بەم جۆرە دابڕێژرێت: تەنها ئەو کاتە دەتوانین لە ئاقاری مێژوو تێبگەین ئەگەر ئاراستەبوونی خەڵکی لە ڕێگای هۆگەلێکی ئایدیۆلۆجییەوە، بەو ئاراستەیە تەماشا بکەین کە یەکێك لە گرنگترین فاکتەرەکان لە ئاراستەی مێژوودا پێکدێنێت. خانەدان و کەشیشەکان لە کۆمەڵگای دواکەوتووی سەدەکانی ناوەڕاستدا یەکەمین کەس بوون کە ئایدیۆلۆجیایان بۆ پارێزگاری لە پێکهاتە "تشکیلة"یەکی کۆمەڵایەتی کە بەردەوامبوونی هۆی سەرەکی هەژموونیان بوو، بەهۆی ئەقڵەوە دژایەتی ئایدیۆلۆجیا دەکات، بەکارهێنا. ئەقڵیش کە زۆرجار هۆبز بە ئەقڵی "ڕاست و بەجێ"ی ناو دەبات – هاوتای زانست و مافی سروشتییە، کۆی ئەو مەسەلانەیە کە لەسەر تاقیکردنەوەیەکی کردەیی دامەزراون[18].

کەواتە ئەقڵ و ئەقڵانییەت لای هۆبز لە زانین و زانیاریگەڵێکدا بەرجەستەن کە هەموو ساتەوەختێك شیاوی ئەوەن لەسەر ڕێسای ئەزمون یاخود بەڵگەکارییە لۆژیکییەکان گەشەبکەن: بەڵام پێویستە توخم و ڕەگەزەکانی ئەم زانیاریگەلە بۆ دواجار و بە تەواوی دابمەزرێنرێت: هەر لەگەڵ هاتنە ئارایدا ئیدی هەر هۆیەك بۆ گۆڕینی لە گۆڕێدا نامێنێ. بەم جۆرە نەك هەر بە تەنها چەمکێکی خاوەن قەڵەمڕەوییەکی ڕەها بۆ سروشت لە ئارادا دەبێت بەڵکو هەروەها چەمکێك بۆ ئاکار و بەرژەوەندی ڕاستەقینەی خەڵکی لە گۆڕێدا دەبێت کە بۆ هەموو کات و شوێنێك شیاو دەبێت و بیرکردنەوەی تێکڕای گوتەزاکانی سەر بە بیرۆکەی کۆمەڵگە و دەوڵەتیش لەسەر ئەو بناغەیە دەبێت کە تا هەتاییە مادامەکی خودی ئەو بیرۆکەیە پێ لە ڕاستی و دروستییەکەی نراوە. لە بنەڕەتیشدا مێژوو وەکی پرۆسەی ئەو پەرەسەندنە کە خەڵکی بەرەو بە تەواوی بەخاوەنبوونی ئەقڵ دەبات دێتە پێشچاو، ئیدی هەر لەگەڵ جێبەجێکردنی ئەو پرۆسەیەدا بە ئاسانی چاکترین سیستەمی کۆمەڵایەتی کە وەکی دوایین دۆخێك ئارەزووی دەکەین، بەرجەستە دەبێت. لەبەرئەوەی ئەم دوایین دۆخەیش بەندە بە پرەنسیپەکانی مافی سروشتییەوە کە ئەمەیە –ڕاگەیشتن بە چاکەی گشتی لە ڕێگای جەختکردنی ئازادانە لە خۆپەرستیی تاکەکەسیی– و لەبەرئەوەی ئەو پرەنسیپانە گەوهەری کۆمەڵگای بۆرجوازی پێکدێنێت، هەر بۆیە ناوەڕۆکی ئەم گریمانەیە لە بنەڕەتدا لە ڕووی بابەتییەوە بەو جۆرە لە مێژوو تێدەگات کە پێشڕەویکردنە بەرەو پێشەوە بە ئاراستەی نموونە بەرز و باڵاکانی کۆمەڵگای بۆرجوازی لە چوارچێوەی سیستەمی موڵکایەتی و ئازادی کێبڕکێدا. پێوەری ئەم پێشکەوتنەیش لە ئایدیاکانی خودی بیریاران خۆیان پێکدێت، کە ئایدیاگەلێکی بەند و مەرجدارە بە سەردەم و ڕۆژگارەکەیەوە. بەڵام لەسەر ئەو بناغەیە کە تا هەتایین دەخرێنە بەر باس و پێشچاو دەخرێن. هەر لەم بوارەدا ئەم جیاوازییە لە نێوان هۆبز و ئەقڵانییەتی سەدەی هەژدەیەمدا تۆمار دەکەین: هۆبز بە شێوەیەکی ساویلکانە پێی لەوە ناوە کە ئەقڵ تاڕادەیەك هەر لە سەرەتای مێژووەوە پێدراو بووە و، ئەگەرچی هەر بە شاراوەییش ماوەتەوە بەڵام دەکرێت ئەم شاراوە بوویییە بە تەنها بگەڕێنرێتەوە بۆ پیلان و فێڵگەلێك، بە تایبەت ئەو پشێوییەی کە کڵێسا پەخشوبڵاوی کردەوە، هەرچی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدایە "بێجگە لە ڕۆسۆ" مەسەلەکە بە پێچەوانەی ئەمەوە بوو، تەنها لەسەر ڕێسای ئەزمونی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە

ڕێکوپێك "منظم" دەتوانرێت ئەقڵ دەستەبەر و پەیدا "اکتساب" بکرێت، هەروەها ئەم پەیداکردنە، هەڵبەت بە نیسبەت ئەوانەوە، تێپەڕاندنی ئەو ئاستەنگ و دژوارییانەی کە دەسەڵاتداران دروستی دەکەن، لە خۆگرتووە.

کەواتە زانین لە ڕوانگەی هۆبزدا، وەکی لە مێژووی تەوراتیدا، هەر لە سەرەتاوە لەئارادایە و ئەوە هەڵەی مرۆڤەکان خۆیانە ئەگەر ئەو زانینە و چالاکییەکەی لەمپەر ئامێزبێت، لە کاتێکدا بیرمەندانی چاخی ڕۆشنگەری واقیعی ئەوەی کە ئایدیۆلۆجیا هەر لە سەرەتاوە لە ئارادایە و تەنها لە چوارچێوەی ئاراستەی پرۆسەی مێژوویيدا دەتوانرێت لابرێت و بگۆردرێت، وەکی یاسایەکی سروشتی تەماشا دەکەن.

هەموو ئەم وێنایانە لەو بیرۆکەیەدا بەشدارن کە ئەقڵ هەمیشە وەکی خۆی دەمێنێتەوەو، هەقیقەتیش، وێڕای ئەو ڕواڵەت و ڕوخسارە جۆربەجۆرانەی کە دەکرێت بیانپۆشێت و بیانکاتە بەرگێك بۆ خۆی، دواجار لە هەر جێیەك و لەهەر ساتەوەختێکدا هەر بەردەست و نزیکە دەست دەبێت. هەقیقەت بابەتێکە خەڵکی دەتوانن نزیکی ببنەوە یاخود لێی دووربکەونەوە، بەڵام هەر وەکی خۆی دەمێنێتەوە و وابەستە بە مێژوو و بە چارەنووسی زەمەنیی مرۆڤەکانەوە نابێت. ئیدی بەم جۆرە ئەم تیۆریایە — کە سیما و مۆرکە گرفت ئامێزەکەی تەنها لەتەك فەلسەفەکەی هیگڵدا بە ڕۆشنی دەردەکەوێت — لەگەڵ ئەو ئایینەدا کە وەکی ئایدیۆلۆجیایەك دژایەتی دەکات وەك یەکی لێدێت و، ئەمیش لافی ئەوە لێدەدات کە هەقیقەتێکی ڕەها و تەواو بەردەست دەخات. هەردوکیشیان تەواو دڵنیان لەوەی ئەو ساتەوەختەی کە تیایدا دەرکەوتوون ساتەوەختی

خاوەنداریی هەقیقەتە. فەلسەفەی نوێ ڕێبازەکەی خۆی کە وابەستەیە بە سروشت و بە کۆمەڵگاوە بە ڕێبازێکی پایانی "نهائی" دادەنێت و کە هێشتا مێژوویش تەختە ڕەشێکە کە ڕەنگی سپی تەنها لەگەڵ ڕەنگی ڕەشدا دێت. هەرچی تێکڕای بیروڕاو هەڵوێستەکانی سەدەکانی ڕابوردویشە کە ناکۆکن لەگەڵیدا تەنها بە مانای چەواشەکردن، یاخود لە باشترین حاڵەتدا بەمانای چەوت و چەوێڵ، پێی لێدەنێت، ئەو ئایدیایانەی کە ڕابوردوو بەرهەمی هێنان لە باری هۆشیارییەکی چەوت یاخود لە بەدحاڵیبوونەوە دێن. هەڵبەت لای ژمارەیەك لە بیریارانی سەدەی ناوەڕاست و تەنانەت سەدە زۆر کۆنەکانیش ڕووخسارگەلێك هەن ئەمێستا وەبیر دەهێننەوەو، لە پاش ئاوەژوکردنی ڕیزبەندیی بەهاکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەستدەکرێتە ستایشی دیموکراتیس یاخود ئیپیکۆرو کەسانی تر و، ئیدی بە پێشەنگ، مژدەدەر، تەماشا دەکرێن و، دەرکەوتنی ناکاوی بلیمەتییان تیادا بەدی دەکرێت، بەڵام ئەم تەرزە لە ڕێزلێنان، متمانەی باوەڕ بەخۆبوون لەو هەقیقەتە سەروو زەمەنییە وێڕای کات و شوێن بەزەبر دابین کراوە و پاشان وێکچوونی نوێ لەگەڵ هزری ئایینی ڕەخنەکراودا زیاتر دادەماڵێت: چەمکگەلێکی نامۆ لە چوارچێوەو سیاقەکانیان دەردەکێشرێن، بەراورد بە بیروڕا کەسییەکان دەکرێن ئینجا تەنها بەڕەتکردنەوە یاخود پەسەندکردنیان بەس دەکرێت، بێئەوەی کەسی بکەر لە ئاستی تێگەیشتن لە ڕۆڵە مێژووییەکەیدا بێت. وەکی چۆن ئیمانداری پێ هەڵگرتوو لە هەقیقەتی سروشتی نەمرەوە، بێ هیچ شێوەیەکی دی لە شێوەکانی بەڵگەکاری، تەنها ئەو هەقیقەتە نەمرە نەبێت، بیدعەکارانی لە قەدیسەکان جوێ دەکردەوە، هەروەها فەلسەفەی ماتەریالیی

بۆرجوازیی دامەزراو لەسەر "ئەقڵ"ی تایبەتی خۆی، گێل و جادوگەران لە دانایان و شەهیدان جیادەکاتەوە.

بۆ حوکمدان لەسەر خۆپیشاندانە ڕۆشنبیرییەکان لە ڕابوردوودا تەنها بە بەڵێ یان نەخێر بەس دەکرێت و لەجیاتی تێگەیشتن بەراوردکاری دەکرێت، هیگڵ بۆ وەسفکردنی ئەم هەڵوێستە ئەم دەستەواژانەی دۆزیبوویەوە: "سەرلەبەری مێژووی فەلسەفە گۆڕەپانی شەڕێکە تەنها و تەنها کەڵەکەی ئێسك و پروسکی مردووان دایدەپۆشێت (...)"، "مەملەکەتی مردووانە، مردووانێك تاکگەلێك نین بە تەنها لە ڕووی جەستەییەوە مردبن، بەڵکو سیستەمگەلێکی بەزیون، لە ڕووی ڕۆحییەوە مردون، هەرکەسە پاش ئەوەی ئەوی تری کوشتووە، ناشتویەتی. لەبری "شوێن من بکەوە" ڕاستتروایە دەبێت بگوترێت: "خۆت شوێنی خۆت بکەوە" واتە لەسەر دڵنیایی خۆت بمێنەرەوە، پابەند بە ڕوانگەی کەسیی خۆتەوەبە. پابەندبوون بە ڕوانگەی ئەوی ترەوە لە پای چی؟.. بەڵام بە گوێرەی ئەزمونی ڕابوردوو، پێدەچێت و ڕاستتر وایە واژەگەلێکی دی لە کتێبی پیرۆز بەسەر ئەم چەشنە فەلسەفەیەدا جێبەجێ دەبێت، ئەم واژانەی پۆڵس پەیامبەر: "تەماشاکە، ئەوە پێیەکانی ئەو کەسانەیە کە لەبەردەم دەروازەکەدا هەڵتدەگرن". بڕوانە، هاتنی ئەو فەلسەفەیەی کە فەلسەفەکەی تۆ بە درۆ و دووردەخاتەوە لەو کاتە کە بەهاتن بۆ لای کەسانی تر خایاندی زیاتر ناخایەنێت (...).

ڕووداوەکانی مێژووی فەلسەفە تەنها سەرکێشی گەلێك نین – هەروەها مێژووی گشتی تەنها مێژوویەکی ڕۆمانتیکی نییە – تەنها بڕێك لە ڕووداوی ناکاو و، هەڵمەتگەلی ئەسپسوارگەلی گەڕۆك نییە هەریەك لە پێناو خۆیدا شەڕ بکا و بێ ئامانج هەڵبنوتێن و، کارەکانیان، بێ ئەوەی هیچ شوێنەوار و کاریگەرییەکی جێهێشتبێت، لەناوچووبێت. هەروەها ئەوەش تەواو ڕاست و بەجێ نییە کەسێك لە بوارێکدا ناوبانگی دەرکردبێت و یەکێکی تر لە بوارێکی دیکەدا (...)[19]" "هەرچی سەبارەت تاکگەلەکانە، هەر تاکێك ئیدی هەرچۆنێك بێت، ڕۆڵەی سەردەمەکەی خۆیەتی، وەکی چۆن فەلسەفەیش بەندی ئایدیاکانی سەردەمەکەی خۆیەتی. ئەستەمە وا خەیاڵبکرێت کە فەلسەفەیەك لە فەلسەفەکان دەتوانێت لە جیهانەکەی خۆی دوورتر بڕوات. ئەمە وەکی ئەوە وایە کە بگوترێت کەسێك بازی بەسەر سەردەمەکەی خۆیدا داوەو لە ڕۆدس پەڕیوەتەوە[20].

"هیگڵ بڕوای وایە ئێمە تەنها ئەو کاتە دەتوانین دەرك بە واتای ئەو ئایدیاگەلانە کە لە مێژوودا دەردەکەون بکەین، کە لە چوارچێوەی دیاریکردنەکانی سەردەمەکەیدا تێیبگەین، یان بە دەربڕینێکی دیکە: "تەنها ئەو کاتە دەتوانین لێی حاڵی بین کە لە چوارچێوەی پەیوەندیدا بە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە تەماشای بکەین. "ئایین و، یاساکان و، ڕەفتار و، بارودۆخی زانست و هونەرەکان و پەیوەندییە یاساییەکان و تێکڕای بەهرەکانی تری میللەتێك لە میللەتان لە نموونەی ئەو پیشەسازییەی کە بۆ تێرکردن و پڕکردنەوەی پێویستییە سروشتی جەستەییەکانی دایدەمەزرێنێت و، کۆی ئەو شتانەی کە دەوری چارەنووسی دەدەن و ئەو ڕەوشتانەی کە تیایدایەتی و هاوسێکانی لە کاتی شەڕ و لە کاتی ئاشتیدا، هەموو ئەمانە لە ناخەوە وابەستەن و لە پەیوەندییەکی توند و تۆڵدان (...) ئەوەی

کە گرنگە دیاریکردنی جۆری ئەو پەیوەندییەیە کە بە کردەوە هەیە"[21].

هەر لە هۆبزەوە بۆ سەردەمی ڕۆشنگەری "هەروەها هیگڵ ناوی مۆنتیسکیۆش دەبات" زۆرجار بوونی ئەو چەشنە پەیوەندییە سەلمێنراوە، بەڵام تێگەیشتن لێی بە شێوازێکی دەرەکی پەتی بووە. سەرجەم دیاردە و ڕووخسارەکانی ژیانی یەک گەل دەبەسترێت بە یەکێکی ترەوە. ئینجا بێئەوەی لە ڕێگای بونیادی کۆمەڵگای مەبەستەوە هەوڵی ڕاڤەکردنی میتۆدیانەی ناوەڕۆکی وێنا ئایینی و میتافیزیکی و ئاکارییەکان بدرێت، دەدرێتە پاڵ "ڕۆحی میللەت"، بە هەرحاڵ دروست ئائەمەیە گرفتی ئایدیۆلۆجیا. ڕاستە هۆشیاری ساختە یاخود درۆزنە هۆشیاری "الوعی الزائف" تەنها زانستی ڕاستەقینە دەتوانێت پەردە لە ڕووی هەڵبماڵێت، بەڵام سەبارەت بە زانینی مێژوو، هەر تەنها مامەڵەکردن لەتەك نوێندراو "تمثلات"ە ئاینیی یاخود میتافیزیکییەکان، کە چیدی لەگەڵ دۆخی زانستدا جوت نابێت، مامەڵەکردنیان بەو جۆرەی کە تەنها چەوتیگەلێکن، بە هەمان ئەو ڕێگایەی کە گریمانەیەکی ناڕاست لە زانستە سروشتی و فیزیکییەکان لەسەر ئەو بناغەیەی کە هەڵەی زانایەکە لە زانایان ڕەتدەکرێتەوە، بەس نییە. گەڕاندنەوەی ئایین بۆ تەنها خولقاندنێکی خودیی لەلایەن کەشیشانەوە، لەبەر تاقە هۆکارێکی سادە و ساکار هەڵەیە کە ئەمەیە: چونکی ئەو سیفەتانەی کە هۆبز گریمانی ئەوە دەکات پاڵنەری پشتکردەوە – بە تایبەت غەریزەی قازانج –ی کەشیش و خانەدانەکانە، چیدی نییە جگە لە توخمگەلێکی دەروونی کە تەنها لەتەك کۆمەڵگای بۆرجوازیدا پەرەدەسێنێت. هۆبز کە شاهیدی ئەوە بوو، دەتوانێت لە هەموو دەرەنجامەکان ڕابمێنێ و وردبێتەوە، بەڵام، بۆ نموونە، بە هیچ کلۆجێك لە تایبەتمەندییەکانی سەرەتاکانی سەدەکانی ناوەڕاست نەبوو.

ئەو وێنا توند و ڕەوان "بلیغ"انەی کە باڵ بەسەر سەردەمێك لە سەردەمەکاندا دەکێشێت و بەسەریدا زاڵ دەبێت، لە بنەڕەتدا لە ویست و ئیرادەی کەنەفتی هەندێك تاکگەل قوڵترە. ئەوانە لەوەتی لەدایکبوونیانەوە چوونەتە نێو بونیادێکی کۆمەڵایەتی پێشوەخت دیاریکراو بەو ڕێگایەی کە بە هۆیەوە خەڵکی بوونی خۆیانی تیادا دابین دەکەن. وەکی چۆن ڕاوچی سەرەتایی نەك هەر تەنها شێوەی ژیانی مادی خۆی بەڵکو هەروەها ئاسۆی فیکریشی بەم جۆرە دەبینی: بەندن بەو پرۆسە سادە و ساکارەوە کە ژیانی دابین دەکات، هەروەها شێوەی بوونی دامەزراو لەسەر ئەو پلەیە لە پەرەسەندنی سەرەتایی نەك هەر تەنها ژیانی بەرهەستی تاکەکان بەڵکو هەروەها ئەوەیش کە دەربارەی جیهانی دەرەکی، ناوەڕۆك و بونیادی نواندنیان بۆ جیهان، دەیزانن، دیارو دەست نیشان دەکات (. . .) هاوکات لە چوارچێوەی شێوە کۆمەڵایەتییە هەرە جیاوازەکانیشدا، بوونی ڕۆحیی خەڵکی لەگەڵ ئەو پرۆسە زیندووەی جەستەی کۆمەڵایەتیدا کە ئینتمایان بۆی هەیە و کە چالاکییان دیاری دەکات، دەئاڵۆزکێ. واقع شتێکی تەواو یەکانگیر نییە هەروەها "بە گوێرەی وێنای ئەقڵانی" هەستیش ئاوێنەیەکی ڕۆشن نییە کە لەباریدایە بە تفێکی نەزان یاخود تاوانگەرانە بشڵەقێت، یاخود لە باریدایە لەلایەن نهێنی زانانەوە پاك و خاوێن بکرێتەوە، کۆی واقع لەگەڵ پرۆسەی ژیانی خەڵکیدا کە ناکرێت و ناشێت لە چوار چێوەیدا نە سروشت و نە کۆمەڵگاو، تەنانەت نە پەیوەندییەکانیشیان بەردەوام بە نەگۆڕاو بمێننەوە،

جوت دەبێت. هەروەها ناتوانین لە ناوەڕۆکی پێکهاتی فیکریی مرۆڤ و شێوازی بوونی تێبگەین ئەگەر ئاشنای ئەو قۆناغە کە تیایدا دەژین نەبین و، پتر لەوەش (. . .) بە چاوپۆشی لە مرۆڤە سەرەتاییەکان — ئەگەر ئەو پێگە تایبەتەی ئەو گروپەی کە لە بەڕێوەچوونی پرۆسەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا پەیوەندیان پێوەی هەیە بە هەند وەرنەگرین. چیدی، لەوەتی ڕۆژگاری ڕاوچییە سەرەتاییەکانەوە، ئەرك و کار "وظیفة"ە کۆمەڵایەتییە پێداویستەکان بۆ پارێزگاریکردن لە بوون "الوجود" و درێژە پێدانی، لە نێو خودی تاکەکان خۆیاندا کۆنییە، بەڵام چیدی لە نێوان گروپگەلێکی جیاوازی نێو کۆمەڵگادا دابەش بووە. بەم جۆرە هەر ژیانێکی فیکرییش بە زەرورەت جیادەبوو و لە نێویدا گەشەکردنی تاکۆکیگەلێکی بەخۆوە بینی بوو. مێژوویەکی هەماهەنگی ئایدیاکان کە لە هونەر و فەلسەفە و زانست بکۆڵێتەوە و ماوەو مەوداگەلێکی زەمەنیی دورودرێژ بگرێتەوە و تەنها بە پەرەسەندنگەلێکی فیکریی پەتی بەس بکات، لە داڕشتن "انشاء"ێك بەولاوە زیاتر نابێت.

هۆبز و بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەری بۆ یەکەمین جار لە مێژووی فەلسەفەی نوێدا گرفتی ئایدیۆلۆجیایان پێشچاو خست. واتە گرفتی ئەو ئایدیایانەی کە بە ئایدیاگەلێکی ساختە ناسراون و کە لە واقیعی کۆمەڵایەتیدا باوو باڵادەستن. بەڵام لەبری تێگەیشتن لە ئایدیۆلۆجیا لە چوارچێوەی وابەستەبوونی بە واقیعەوە، تەنها بەمانەوە و قەتیسمان لە ئاستی سایکۆلۆجیای تاکەکەسیدا بەس کرا، دەستنیشانکردنە سایکۆلۆجییەکانی جیهانی بۆرجوازیی — لە نموونەی بەرژەوەندی تایبەتی، بەهرەمەندی، غەریزەی قازانج و، سودگیری"استغلال" و کەڵك و سود ئەوانەن کە دواجار وەکی ناوەڕۆك و ئامانجی خواپەرستیی سەربەسەدەکانی ناوەڕاست دەردەکەون. بەهەرحاڵ ئەو خواپەرستییە بێ هیچ جیاکارییەك زانین و ئایدیۆلۆجیا یەکدەخات و، ڕاستتر بڵێین شێوەی ئەو ئەقڵە فیودالییەیە — کە تەنها بەوپێیەی کە کۆی میکانیزمی کۆمەڵایەتییە دەتوانرێت هەڵبهێنجرێت. ئەم فەلسەفە چەسپاوە لە گەوهەردا خۆی بە لێکدژییەکی سادە و ساکاری نێوان "ئەقڵ" و ئایدیۆلۆجیاوە هەڵدەواسێت بێئەوەی لەسەر بناغەی ڕۆڵە مێژووییەکانیان تێیانبگات. دەبوو ئەقلانییەت، بۆ دەرککردنی ئەو پەیوەندییە، خاوەنی هەستێکی ڕەخنەیی خودیی بێت تاهەتایی ڕوانگە تایبەتەکەی خۆی بەرباس و خواس بخات. دەبوو وەکی مەرجێکی پێداویستی دەرکەوتنی بیریارانی ڕۆشنگەری، ئاشنای ئەو پەرەسەندنە مادی و فیکرییەی قۆناغی پێشوتر بین و، تا جیناسەکەی هیگڵ بخوازین،[22] ڕۆشنگەری لەباریدا بوو "ڕۆشنکەرەوەی خۆی" بێت و، سیمای گۆڕاوی گوتەزاکان لە ڕووی مەبدەئەوەو، دەستنیشانکردنە مێژووییەکانی بەشێوەیەکی گشتی لە باریاندا بوو ڕۆشن ببنەوە، هەروەها ئەو چەمکە توندەی ئەقڵ کە ئەو قۆناغە بەرهەمی هێناو کە وەکی سەدەی ناوەڕاست کەللەڕەقانە باوەڕی بە خودی خۆی هێنا، لە باریدا بوو لەبەریەکهەڵبوەشێتەوە. ئەو ڕێبازەی کە لایەنگری لە سنورداربوونی ناوەڕۆکە فیکرییەکان لە ڕووی مێژووییەوە دەکات نابێتە هۆی ڕێژەگەرایی مێژوویی. کە دەشگوترێت حوکمێك لە حوکمەکان مەرجدارە مانای ئەوە نییە کە حوکمێکی ئایدیۆلۆجییە. سنورێك کە بتوانین بەبێ ناکۆکی بە ئایدیۆلۆجی ناودێر بکەین وابەستەی حاڵەتی

ئەمێستای زانینەکانمانە[23]. هەڵەی هۆبز و جێگرەکانی لەوەدانییە کە زانستی سەردەمەکەی خۆیانیان بە جدی وەرگرتبوو، هەروەها لەوەشدا نییە کە ڕێبازە ناکۆکەکان بەم زانستەیان ڕەتکردبووەوە و پێیان وابوو وەهمێکە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاری خۆی دەکات، بەڵکو ڕاستتر بڵێین هەڵەی ئەوان لەوەدایە کۆی زانینەکانی خۆیانیان بڵند کردبوو بۆ ئاستی ئەقڵی نەمر، ئەمە لەبری ئەوەی وەکی ساتەوەختێك لە چوارچێوەی کۆی ڕەوتی پرۆسەی کۆمەڵایەتیدا تەماشای بکەن، ساتەوەختێك کە، لە قۆناغی دواتری ئاراستەی مێژوودا، نەك هەر بابەتێکی شیاوە بۆ شیکردنەوە، بەڵکو هەروەها بابەتێکە لە کاتی پێویستیدا شیاوی پێداچوونەوەو گۆڕینیشە.

لەلایەك متمانەکردن بە هزرێکی زیندوو و توندو، لە لایەکی دیکەوە پەی بردن بەوەی زانینەکانمان هەم لە ڕووی ناوەڕۆك یاخود لە ڕووی بونیادەکەیەوە مەرجدارە، دوو هەڵوێست نین یەکتری ڕەتبکەنەوە بەڵکو بەزەرورەت هاوڕای یەکدین. هەرگیز ناشێت ئەقڵ متمانە بە نەمریی خۆی بکات، زانینی لەبارو گونجاوی سەردەمێکی دیاریکراویش لە داهاتوودا بەو جۆرە نابێت، پتر لەوەش، سنوردار و دیاریکردنی پاشکۆیەتی بۆ سەردەم هەروەها لەسەر ئەو ڕەوتی پرۆسەی دەرککردنەیش کە دەستنیشانی دەکات جوت دەبێت "کە لێکدژییەکی ئاشکرایە کە خودی هەقیقەتی ئەم چەسپاندنە ڕەتناکاتەوە، چونکی تایبەتمەندییەکی گەوهەری زانینی ڕەسەن ئەوەیە کە هەرگیز بەسەرخۆیدا داناخرێت": ڕەنگە واتای قوڵی هەر فەلسەفەیەکی دیالەکتیکانەیش لێرەدا بێت. لە ئینسایکلۆپیدیادا ئەمە هاتووە: "خراپترین چاکەکان خاکێتی ئەو هزرەیە کە پایانیی دەکاتە شتێکی ئێجگار چەسپاو، ڕەها، ئەوە ڕوواڵەتیترین زانینە ئەو زانینەی کە خۆی هەڵدەواسێت بە شتێکەوە کە بناغەکەی لە خۆیدا نییە (. . .) ئەو خاکێتییەی کە ئێمە لەبارەی دەدوێین لەسەر بەرزکردنەوەو هەڵگرتنی ئەم ساختە و، پایانییە، لە ڕووی ڕاستەقینەدا، دادەمەزرێت، لەبەرئەم هۆیە ئەو خودی خۆی ساختەیە"[24]. هەروەها هیگڵ لە شوێنێکی دیکەدا ئەمە پێشچاو دەخات، "لە ڕاستیدا دیالەکتیك ئەوەیە کە بە تێگەیشتن، بە جیاوازبوون دەگەیێنێت، سروشتە پایانییەکەی و ڕووواڵەتی ساختە کە سەربەخۆیی ئەنجامەکانێتی ئەوەیە کە دەیگەڕێنێتەوە بەرەو یەکبوون[25]". بەڵام دیالەکتیك لای هیگڵ لە بیرۆکەی ڕەهادا تەواو کامڵە و، بەشێك لە بەشەکانی مێژووی بنجداکوتراوی مرۆڤ نییە. هیگڵیش خۆی لە خۆیدا لەو وەهمی ئەقڵانییەتەی کە وێڕای ئەوە بە توندی دژایەتی کردووە قوتاری نەبووە: دیالەکتیکی تەنها بەسەر ڕابوردوودا پراکتیزە کردووە و، کە مەسەلەکە وابەستەی هەڵوێستی تایبەتی خۆی بووبێت لە بواری ئایدیاکاندا، یەکڕاست دیالەکتیکی بە تەواوی زانیوە. هەروەها بیری ئەویش جاویدانی لە ماوەیەکی مێژوویی دادەمەزرێنێت، بەڵام لەبەرئەوەی واقیعی بەلاوە وەکی ڕووواڵەتبوون "تمظهر"ێکی بیرۆکە هاتۆتە پێشچاو، هەربۆیە لەسەری پێویست بووە نەك هەر فەلسەفەکەی بەڵکو لە تەك ئەویشدا ئەو ڕێسا مێژووییە کە لەسەری دادەمەزرێت و کە ئەمەیە: دەوڵەتی پروسیایی پێش شۆڕش، بە مانای ورد و دروستی بە یەزدانکردن و پەرستن، بکاتە یەزدان و بیپەرستێت. ئەم خاکێتی و ملشۆڕکردنە لەبەردەم بوونەوەر "موجود"دا "خاکێتی" ساختەی نێو خودی بیرو هزری بوو.

## پەراوێزەکان

*Long parlement ناوی ئەو دوایین پەرلەمانەیە کە چارلی یەکەم لە ساڵی 1640دا بانگەوازی بۆ کرد و لە ساڵی 1953دا کرۆمویڵ هەڵوەشاندەوە (و.ع).

1-بەشێوەیەکی سەرەکی ئاماژە بۆ ئەم کتێبانە دەکەین: دەربارەی هاوڵاتی (1642) du citoyen، لیڤیاسان یاخود مادە و شێوە و دەسەڵاتی دەوڵەتێکی ئەکلیرۆسیی و مەدەنی (1651)، لەمەڕ مرۆڤ (1658). هەرچی ئەم کتێبەشییەتی "بیهیمۆس، یان پەرلەمانی درێژخایان"، ئێجگار گرنگ و پڕبایەخە و لە شێوەی گفتوگۆدا باس لە مێژووی شۆڕشی کرۆموێلیزم لە ساڵی 1640 تا گەڕانەوەی پادشایەتی دەکات. ئەم کتێبە لە پاش کۆچی دوایی هۆبز چاپ کراوە: ئەگەرچی هۆبز لەگەڵ چارلی دووەمدا ئاشت بوو بووەوە و هێرش و پەلامارگەلێکی لە دژی کرۆمویڵ و بێلایەنەکان بۆ ئەم کتێبە زیاد و سەربارکردبوو، بەڵام لەبەر زیادبوونی قەڵەمڕەویی نەیارانی لە وڵاتدا نەیتوانی بڵاوکەرەوەیەك بدۆزێتەوە تا کتێبەکەی بۆ چاپ بکات. پێشتریش کە هێشتا خۆی لە ژیاندا مابوو چەند نووسین و کتێبێکی هەم لەلایەن کاتۆلیك و هەم لەلایەن پرۆتستانتەوە قەدەغەکران. لە دوای مەرگی هۆبزیش بەسێ ساڵ زانکۆی ئۆکسفۆرد فەرمانێکی لە دژی ڕێبازی زیانبەخشی لای ئەو کەسانەی کە وافێردەکەن هەموو دەسەڵاتێکی مەدەنی لە بنچینەدا لە میللەتەوە سەرچاوە دەگرێت، دەرکرد "بڕوانە Ferdinand Tonnies, Thomas Hobbes Leben und lcher. Stuttgart 1925. p.65"

ئەوە بوو خوێندکاران هەردوو کتێبەکەی هۆبز کە ئەمانەن: (دەربارەی هاوڵاتی) و (لیڤیاسان) بە ڕۆژی نیوەڕۆ بە بەرچاوی خەڵکییەوە سوتاند. چاخی کۆنەپەرستی بنەماڵەی ستیوارت بە توندی بەرهەڵستی هەموو بەرژەوەندییەکانی بۆرجوازییەتی ئینگلیزی دەکرد.

2*Gassendi جاسیندی (1592-1655) فەیلەسوف و ماتماتیکناسێکی فەرەنسییە، نەیارێکی سەرسەختی فەلسەفەکەی ئەرستۆ و دیکارت و هەواداری ئاکارێکی ئیپیکۆریی بووە کە لەسەر چێژی بێگەردی دابمەزرێت.

*2-The English works of Thomas Hobbes, Vol. II, Scientia, Aalen 1962, philosophical Rudiments conceruing government and Society. P. XIV.*

3*بزوتنەوەی ڕیفۆرم و دژە ڕیفۆرم/ بزوتنەوەی ڕیفۆرمی کاتۆلیکییەکە لە سەدەی شانزە و حەڤدەدا بە دوای بزوتنەوەی ڕیفۆڕمی پرۆتستانتیدا هات (و.ع).

*3-Ibid, Vol. II p 120-121.*

4* Leviathan دڕندەیەکی ترسناکی نێو ئەفسانەی فینیقییە. هەروەها ناونیشانی ئەو کتێبەی هۆبزیشە کە لە ساڵی 1651دا نووسی و تیایدا پرنسیپەکانی خۆی لەمەڕ هەستیی و مادی و کەڵکگەرایی و حوکمی ڕەها پێشچاوخست (و.ع).

*4-Ibid, Vol. II p 9.*

5*گرۆتیۆس/ هۆگۆ دی گرۆتی ناسراو بە "گرۆتیۆس" "1583-1645" یاسادانەر و دیپلۆماتێکی هۆڵەندییە دانەری "بنچینەکانی یاسای دەوڵەتیی گشتی"یە لە ساڵی 1625دا.

6*بیفندۆرف/ سامۆئێل بارون بیفندۆرف (1632-1694) یاساناس و مێژوونووسێکی ئەڵمانییە دانەری "یاسای سروشت و مرۆڤ"ە.

7*کریستیان وۆڵف/ کریستیان بارون ڤۆن وۆڵف (1679-1754) خوێندکاری لیبنتزە.

*5-Ibid, Vol. II p 167.*

*6-Ibid, Vol. II p 177.*

*7-Ibid, Vol. II p 177.*

*8-Ibid, Vol. II p 178.*

9-وەرگیراوە لە Ferdinand Tonnies، سەرچاوەی پێشوو ل 178. بڕوانە The English works of Thomas Hobbes ،

هەروەها لیڤیاسان، بەشی یەکەمی نەسکی *XI* ل 91. وەرگێڕانی فەرەنسی، بڵاوکراوی *sirey* ساڵی 1971، ل 101.

*10- The English works of Thomas Hobbes, Vol. VI., Behemoth part, I, p. 215-216.*

*10-Behemoth, Vol. VI, p. 217.*

*11-Behemoth, Vol. VI, p. 214.*

*12-philosophical rudiments concerning government and society,Vol, II, p. 172.*

*13-Behemoth, Vol. VI, p. 217.*

*14-Ibid, Vol. VI, p. 233.*

15-سەرچاوەی پێشوو ل 231. هەروەها هیگڵ باس لە خواپەرستییەکی "دروست"یش دەکات ئەو خواپەرستییەی کە ئاماژە بۆ ڕێزلێنان لە هەقیقەت و یاساکانی دەوڵەت دەکات. بڕوانە پرنسیپەکانی فەلسەفەی هەق، گالیمار، زنجیرەی ئایدیاکان *Idees*، 1968.

*16-Behemoth, Vol. VI, p. 59.*

*17-Tonnies op. cit, p. 263.*

18-سەبارەت بە ئەقڵانییەتی ئینگلیزی و فەرەنسی، چەمکی "*raison*" "ئەقڵ، دەرك، جیاكاری..." ئاماژە بۆ ئەو زانینە دروست و پلەیە دەکات کە مرۆڤ لەو زانینەدا پێی ڕاگەیشتووە. لەبەرئەوەی فەلسەفەی ئەڵمانیش لەتەك كریستیان وۆڵفدا، واژەی "*raison*" "بە فەرەنسی" بەو جۆرە وەرگرتووە کە تەنها و تەنها ئەمە دەگەیێنێت: بەهرەیەکی دەروونی، هەربۆیە بووەتە هۆی ناڕۆشنییەکی کارەساتبار کە تەنانەت لای کانتیش بە تەواوی لەناونەبراوە. "م. هـ.".

19-هیگڵ، کۆرسگەلێك لەمەڕ فەلسەفەی مێژوو، وەرگێڕانی فەرەنسی ئەمەیە: *J. Gebelin Vrin, Paris 1954. p.p. 86-87.*

20-هیگڵ، پرنسیپەکانی فەلسەفەی هەق، سەرچاوەی پێشوو، پێشەکی لاپەڕە 43.

21-هیگڵ، کۆرسگەلێك لەمەڕ فەلسەفەی مێژوو، وەرگێڕانی *J. Gebelin Vrin, Paris 1946. p.51.*

22-هیگڵ، فینۆمینۆلۆجیای ڕۆح، وەرگێڕانی ج. هیبۆلیت *Aubier, 1947 t.II, p. 115.*

23-پێلێنان لەوەی تیۆریایەك لە تیۆریاکان لە ڕووی مێژووییەوە مەرجدارە هەرگیز بەڵگەی ئەوە نییە کە ئایدیۆلۆجییە. لەو پێناوەشدا کارێکی زۆر پێویستە کە ئەرك و کارە کۆمەڵایەتییەکەی ئاشکرا بکرێت و بخرێتە ڕوو – ئەمەش کارێکە زۆر ئاڵۆز و گرێچنترە. (م.هـ).

24-هیگڵ، ئینسایکلۆپیدیا، وەرگێڕانی *H. Gibelin* بڵاوکراوی *Vrin* (1952) بڕگەی 386، سەرنجی لاپەڕە 129.

25-سەرچاوەی پێشوو، بڕگەی 214، سەرنجی لاپەڕە 129.

## سەرچاوە

بدايات فلسفة التأريخ البورجوازية

تأليف: ماكس هوركهايمر، ترجمة: محمد على اليوسفي

دار التنوير للطباعة و النشر

الطبعة العربية الأولى 1981

# خوێنەری باش و نووسەری باش

ڤلادیمیر نابۆکۆڤ
لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

ئەشێ ناونیشانی وەکو "چۆن دەبیتە خوێنەرێکی باش" یا "میهرەبانی لەگەڵ نووسەراندا" بکرێتە چەندین ناونیشانی جیاجیا دەربارەی نووسەرانی جیاواز، چونکە پرۆژەی من ئەوەیە کە بە عیشقەوە و بە وردەکارییەکی عاشقانە و وردبینانەوە، سەبارەت چەند شاکارێکی ئەوروپایی بنووسم.

سەد ساڵ لەمەوبەر، فلۆبیر لە نامەیەکیدا بۆ خۆشەویستەکەی نووسیویەتی: "مرۆڤ ئەگەر بە لایەنی کەمەوە بە باشی چەند کتێبێك بناسێ، چ تۆژەرەوەیەکی دیاری لێدەردەچێت".

لە کاتی خوێندنەوەدا، پێویستە ئینسان بە عیشقەوە بایەخ بە وردەکارییەکان بدات. بێگومان ئەکرێ دوای کۆکردنەوەی زەڕە "هەتاوی"یەکانی کتێبەکە بە خۆشەویستییەوە، مانگەشەوی کۆی کتێبەکەش بدرەوشێتەوە. ئەگەر ئینسان بە چەند بڕیار و چەمکێکی پێشینەوە، دەست بداتە کتێبێك، ئەوا ڕێی هەڵەی گرتۆتە بەر و بەر لەوەی لە کتێبەکە بگات، لێی دوورکەوتۆتەوە. هیچ شتێك لەوە تەمەڵاویتر و ناڕەواتر نییە کە کەسێك بۆ نموونە بەرلەوەی "مادام بوڤاری" بخوێنێتەوە، ئەو تەسەورەی دەربارەی ڕۆمانەکە هەبێ کە کتێبەکە هێرشێکە دژ بە بۆرژوازی. ئەبێ هەمیشە ئەو ڕاستییە لە پێش چاو بگرین کە کاری هونەریی خوڵقاندنی جیهانێکی تازەیە. کەواتە یەکەمین شت ئەوەیە کە ئەبێ زۆر بە وردییەوە ئەم جیهانە تازەیە بخوێنینەوە. بە جۆرێك لێی نزیك بینەوە، وەك ئەوەی کە هەر ئێستاکێ خوڵقابێ و، پەیوەندی بەو جیهانانەوە نییە کە لەوەوپێش ناسیومانن. وەختێ بە وردییەوە لەم جیهانە تازەیە بەئاگا بووین، تەنها ئەودەمە ئەتوانین پەی بە پەیوەندیی ئەم جیهانە بە جیهانەکانی تر و بوارەکانی ترەوە بەرین.

پرسیارێکی دی ئەوەیە، ئایا ئەکرێ لە ڕێی ڕۆمانێکەوە زانیاری دەربارەی کات و شوێن بەدەستبهێنین؟ بەڵام بڵێی کەسێك هەبێ ئەوەندە ساویلکە بێت، لەو باوەڕەدا بێ کە ئەتوانێ لە ڕێی

ئەو کتێبە زۆر فرۆشانەی کە یانەکانی کتێب بە هەراوهوریاوە لە ڕیزی کتێبە مێژووییەکاندا پۆلبەندییان دەکەن، شتێك دەربارەی ڕابردوو فێربێت؟ ئەی باشە ئەرکی شاکارە ئەدەبییەکان چییە؟ ئایا ئەتوانین بۆ زانینی مێژووی ئینگلستان "بەریتانیا" لە سەردەمی زەمینداری و بارۆنەکاندا پشت بە وێنەکانی جەین ئۆستین ببەستین لە ڕۆمانەکەیدا، لە کاتێکدا ئەو بە تەنها ئاشنای ژووری دانیشتنی قەشەیەك بوو؟ ئایا ئەکرێ ڕۆمانی "بلەیك هاوس" ئەم ڕۆمانسە خەیاڵبزوێنە، کە ڕووداوەکانی لە لەندەنی خەیاڵبزوێندا ڕوودەدات، وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی سەد ساڵ لەوەوبەری لەندەن لە قەڵەم بدەین؟ هەرگیز ناتوانین ئەمە بکەین. وەك چۆن لەم کۆمەڵە موحازەرەیەشدا[1] کە دەربارەی کۆمەڵێك ڕۆمانی گەورەیە ئەوەمان ڕەچاو کردووە. ڕاستی ئەوەیە کە ڕۆمانە گەورەکان، چیرۆکە گەورەکانی پەریانن– و ڕۆمانەکانی ئەم وانانەش چیرۆکی بەرزی پەریانن.

کات و شوێن و، ڕەنگی وەرزەکان و، جووڵەی ماسولکەکان و زەین.. هەموو ئەمانە لە چاوی نووسەرە داهێنەرەکانەوە (بە پێی بۆچوونی ئێمە و وا بزانم بۆچوونەکەشمان دروستە) کۆمەڵێك تەسەوری باو و تەقلیدی نین تا لە توانادا بێ لە کتێبخانە گشتییەکانەوە وەچنگ بهێنرێن. بەڵکو کۆمەڵێك کتوپڕیی تایبەت بە تاکە کەسن کە هونەرمەندانی بەتوانا دەزانن چۆن بە شێوازی تایبەتیی خۆیان بیخەنە ڕوو. نووسەرە لاوەکییەکان، ئەوەی دەیکەن بریتییە لە ڕەنگکردن و باقوبریقدانی هەندێ شتی ئاسایی: ئەم جۆرە نووسەرانە هەرگیز ئەزیەتی دووبارە خوڵقاندنی جیهان بە خۆیان ڕەوا نابینن، بەڵکو هەوڵ ئەدەن ئەوەندەی لە توانایاندایە کۆمەڵێك شتی دیار و گریمانەی تەقلیدیی چیرۆك بەکاربهێنن. ئەو پێکهاتانەی کە ئەم نووسەرە لاوەکیانە لە ڕێی ئەو کۆمەڵە شتەوە پیشانی ئەدەن، ئەشێ بە شێوەیەکی گونجاو و سەرنجڕاکێشانە کاریگەریی خۆیان هەبێ، چونکە خوێنەرە لاوەکیەکانیش حەز ئەکەن بیروڕای خۆیان لە بەرگ و قاڵبێکی پەسەندا ببیننەوە. بەڵام نووسەری ڕاستەقینە، ئەو مرۆڤەی کە هەسارەکان دەخاتە سووڕانەوە و لە خەوندا مرۆڤێك دەخوڵقێنێ و بە جۆش و خرۆشەوە ئەچێتە قووڵایی دونیای خەونەکەیەوە، لای ئەم جۆرە نووسەرە هیچ بەهایەکی دیاریکراو لە ئارادا نییە. بەڵکو ئەبێ خۆی بیانخوڵقێنێت. هونەری نووسین کارێکی بێهوودەیە گەر هەر لە سەرەتاوەو لە میانی چیرۆکەکەوە هونەری بینینی جیهان بە زەینی خوێنەر نەبەخشێ. ئەشێ کەرەسەی خاوی ئەم جیهانە بە ئەندازەیەکی تەواو ڕاستەقینە بێت (گەر بکرێ پێی بڵێین ڕاستەقینە) بەڵام هەمیشە پچڕ پچڕە، پەرش و بڵاوە و، نووسەر بەم پەرش و بڵاوییە ئەڵێ "بڕۆ" و، بەم جۆرە ڕێگە بە جیهان ئەدات تا تلبخوات و ئامێتە بێت و ئەودەمەیە کە ئەبینین ئەتۆمەکانی جیهان دووبارە یەکەیەکە پێکەوە دەلکێنەوە و ئەم گۆڕانەش بە تەنها بەشە ڕواڵەتی و بینراوەکانی ناگرێتەوە.

نووسەر یەکەمین مرۆڤە کە نەخشەی جیهان ئەکێشێتەوە و یەکەیەکە ناو لە شتەکان دەنێتەوە. میوەکانی ئەو درەختەی دەخورێن. ئەو بوونەوەرە خاڵخاڵەی کە بەبەردەمدا ڕادەکات، ئەکرێ ڕامبکرێ. ناوی ئەو دەریاچەیەی نێو ئەو درەختانە دەریاچەی شیری، یا هونەریانەتر بڵێین دەریاچەی کەفاوە. ئەو تەمە شاخێکە و.. ئەو شاخە ئەبێ ڕزگار بکرێ.. هونەرمەندی بەتوانا بە شیوێکی پڕ کەند و لەندا بەرەو لوتکە ڕێ ئەبڕێ و ئایا لەوێ

کێ دەبینێ؟ خوێنەرێك کە هەناسەبڕکێیەتی و خۆشحاڵە، ناکاو لەوێدا باوەش بە یەکتردا ئەکەن و، گەر کتێبەکە تا ئەبەد بمێنێتەوە، ئەوانیش تا ئەبەد پێکەوە ئەمێننەوە.

عەسری ڕۆژێك لە شارێکی دوور، کە زنجیرەیەك موحازەرەم تیا دەوتەوە، تاقیکردنەوەیەکی کورتم ئەنجام دا، کە بریتی بوو لە پێناسە بۆ خوێنەر، دەبووایە قوتابیەکان چوار پێناسەیان هەڵبژاردایە کە بەهەر چواریان پێناسەیەکی تێروتەسەل بۆ خوێنەرێکی باش بە دەستەوە ئەدەن. نازانم لیستی ئەو پرسیارانەم لە کوێدا داناوە، بەڵام ئەوەندەی بیرم بێ پێناسەکان ئەمانە بوون:

چوار وەڵام لەمانە هەڵبژێرە بە شێوەیەك کە وەڵامەکان خسوسیاتی خوێنەرێکی باش بە دەستەوە بدەن:

1–خوێنەر ئەبێ ئەندامی یانەیەکی کتێب خوێندنەوە بێت.

2–خوێنەر ئەبێ خۆی لە پاڵەوانی چیرۆکەکەدا ببینێتەوە.

3–خوێنەر ئەبێ لە چیرۆکەکەدا بایەخ بە لایەنی کۆمەڵایەتی، ئابووری بدات.

4–ئەبێ خوێنەر ئەو چیرۆکەی پێ باشتر بێت کە کردار و گفتوگۆی زیاتر تێدایە.

5–ئەبێ خوێنەر ئەو فلیمەی بینیبێت کە لە کتێبەکەوە ئامادە کراوە.

6–ئەبێ خوێنەر کەسێك بێت کە توانای نووسین تیایدا نەشونما دەکات.

7–ئەبێ خوێنەر خەیاڵێکی باشی هەبێت.

8–ئەبێ خوێنەر یادێکی باشی هەبێت.

9–ئەبێ خوێنەر فەرهەنگی وشە بەکاربهێنێت.

10–ئەبێ خوێنەر تا ڕادەیەك دەرکێکی هونەرمەندانەی هەبێت.

قوتابیەکان زیاتر پێیان لە خاڵەکانی، عاتیفی، کردار و گفتوگۆ، لایەنی کۆمەڵایەتی–ئابووری یا مێژوویی داگرتبوو. بەڵام بێگومان خوێنەری باش کەسێکە کە خاوەنی خەیاڵ و یادی باشە و فەرهەنگی وشە بەکاردەهێنێ و، کەمێك دەرکی هونەرمەندانەشی هەیە، من هەموو دەرفەتێك دەقۆزمەوە بۆئەوەی ئەو دەرکە لە خۆمدا پەروەردە بکەم و ئامۆژگاریی ئەوانی تریش ئەکەم کە هەمان شت بکەن.

بە ڕێکەوت من وشەی خوێنەر زۆر بە سادەییەوە بەکاردەهێنم.مرۆڤ ناتوانێ کتێب بخوێنێتەوە، بەڵکو ئەتوانێ خوێنەرەوە[2] بێ. خوێنەری باش، خوێنەری سەرکەوتوو، خوێنەری چالاك و خوڵقێنەر، خوێنەرەوەیە. پێشتان ئەڵێم بۆچی؟ کاتێ بۆ یەکەم جار کتێبێك دەخوێنینەوە، بزواندنی چاومان لە ڕاستەوە بۆ چەپ و، دێڕ دوای دێڕ و، لاپەڕە دوای لاپەڕە، ئەم چالاکییە جەستەییە ئاڵۆزە لەگەڵ کتێبدا و دەرکی بابەتی کتێبەکە لە ڕووی کات و شوێنییەوە ئەبێتە لەمپەر لە نێوان ئێمە و هەڵسەنگاندنی هونەرمەندانەیدا. ئێمە کاتێك تەماشای تابلۆیەك ئەکەین، تەنانەت گەر وەکو کتێبیش ئاڵۆز و قووڵ بێ، ناچار نین بە جۆرێکی تایبەت چاومان بجوڵێنین. لە ڕاستیدا توخمی کات لە یەکەمین تەماسماندا لەگەڵ تابلۆکەدا نایەتە گۆڕێ. لە کاتی خوێندنەوەی کتێبێکدا ئەبێ ئەوەندە دەرفەتمان هەبێ تا لەگەڵیدا ئاشنا دەبین، چونکە هیچ ئەندامێکی وەها لە جەستەماندا شك نابەین (وەکو چاو لە کاتی تەماشاکردنی تابلۆدا) تا تەواوی وێنەکانی کتێبەکە دەرك بکات و لە هەمان کاتدا لە وردەکارییەکانیشی چێژ وەربگرێ.

بەڵام کاتێ بۆ دووەم جار، یا سێیەم جار و، یان چوارەم جار کتێبێك دەخوێنینەوە، ئینجا ئەو کارە

ئەکەین کە لەگەڵ تابلۆکەدا کردوومانە. لەگەڵ ئەمەشدا نابێ وەکو یەك تەماشای چاو و زەین "ذهن" بکەین. کتێب –هەرچییەك بێت– چیرۆك بێ یا باسێکی زانستی (کە سنووری نێوانیان وەکو تەسەور ئەکرێ یەکجار زۆر نییە)، بەر لە هەموو شتێك بەرەو زەین ئەڕوات، زەین، مێشك، لە سەروو بڕبڕاگەی پشتەوە کە "مێروولە" ئەکات، تاقە ئامرازێکە (یان ئەبێ وابێ) کە لە کاتی خوێندنەوەی کتێبدا بەکەڵك دێت.

لەم بارەدا ئەبێ بپرسین ئاخۆ کاتێ خوێنەرێکی ڕووتترش کە ڕوبەڕووی کتێبێکی "هەتاوی" ئەبێتەوە، زەین چۆن کاردەکات. بەر لە هەموو شتێك ڕووترشییەکەی لەنێودەچێت و، خوێنەر، باش یا خراپ، پێ دەنێتە مەیدانەکەوە. تەقەلاکردن بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی باش، تەقەلایەکی دژوارە لە زۆربەی کاتەکاندا، بەڵام هەر ئەوەندە دەستی پێکرد، پاداشتی جۆراوجۆر و زۆری دەبێ. چونکە هونەرمەندی لێهاتوو بۆ خوڵقاندنی کتێبەکەی خەیاڵی قووڵی خۆی خستۆتە گەڕ. کەواتە شتێکی ئاسایی و ڕەوایە کە خوێنەریش خەیاڵی خۆی بخاتە گەڕ.بە لایەنی کەمەوە ئەبێ دوو جۆر خەیاڵ لای خوێنەر هەبێ. کەواتە با بزانین کام یەك لەم دوو جۆر خەیاڵە بۆ خوێندنەوەی کتێبێك شیاوترە.

یەکەمیان ئەو خەیاڵەیە کە بچووکە و پشت بە هەست و سۆز ئەبەستێ و مۆرکێکی شەخسیی هەیە. (ئەم جۆرە خوێندنەوەیە جۆری تریشی هەیە) ئەمەش کاتێ ڕوودەدات کە ئێمە لە کتێبەکەدا هەڵوێستێکی تایبەتی دەبینینەوە کە زیاتر لە بەشەکانی تری کتێبەکە ئەمانورووژێنێ ،چونکە ڕووداوێکمان بیردەهێنێتەوە کە بەسەر خۆماندا یا کەسێکدا هاتووە کە ئەیناسین، یا بۆ نموونە خوێنەرێك کتێبێکی زۆر لا گرنگ ئەبێ، تەنها لەبەرئەوەی ئەو وڵاتە، یا دیمەنە، یا شێوە ژیانەی لا زیندوو ئەکاتەوە کە ئەم بە حەسرەتەوە یادی ئەکاتەوە. یا ئەوەتا خوێنەر خۆی لە کەسێتییەکی کتێبەکەدا ئەبینێتەوە، بۆیە ئەو کتێبەی لا زۆر گرنگ ئەبێ، کە ئەم جۆرە خوێنەرە خراپترینیانە. ئەم جۆرە خەیاڵە ئەوە نییە کە من بۆ خوێنەری پەسەند ئەکەم.

کەواتە خوێنەر ئەبێ پەنا بۆ کام وەسیلانە بەرێت؟ لە وەسیلەکانی خەیاڵی ناتایبەتی و عیشقی هونەرمەندانە. بە ڕای من ئەبێ هاوسەنگییەکی هونەرمەندانە لە نێوان زەینی خوێنەر و زەینی نووسەردا هەبێ. ئەبێ مەودایەك لە نێوان ئێمە و کارەکەدا هەبێ و لەو مەودایە چێژ وەربگرین و لە هەمان کاتدا لە چنین و هۆنینەوەی ناوەوەی شاکارەکەش تەواو چێژ وەربگرین، چێژێکی ئامێتە بە فرمێسك و موچڕك. بێگومان لەم جۆرە حاڵەتانەدا مانەوە لە دەرەوەی دەقەکەدا دژوارە. هەرچییەك ماندووت بکات زەینییە، بۆ نموونە؛ ئێستا ئێوە کە لێرەدا دانیشتوون ئەشێ تەنها خەونێك بێ لای من، یا من مۆتەکەیەك بم لای ئێوە، بەڵام مەبەستی من ئەوەیە کە خوێنەر ئەبێ بزانێ کەی و لە کوێدا خەیاڵی خۆی جڵەو دەکات و، ئەبێ ئەم کارەش بە تەقەللاوە بۆ ناسینی وردی جیهانێکی تایبەتی ئەنجام بدات کە نووسەر خوڵقاندوویەتی.

ئەبێ شتەکان ببینین و ببیستین. ئەبێ ژوورەکان، جلوبەرگەکان و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کەسانی نووسەرەکە بەرجەستە بکەین ڕەنگی چاوی فنی پرایس لە "پارکی مانسفێڵد" و کەلوپەلی ژوورە بچووك و ساردەکەی، ئەمانە هەموو گرنگن.

هەر یەکێك لە ئێمە خاوەنی سروشتێکی جیاوازە و، ئەتوانم لێرەدا ئەوەتان پێ بڵێم کە

باشترین سروشت بۆ خوێنەر ئاوێتەکردنی سروشتی هونەرمەندانە و سروشتی زانستیانەیە، ئەگەر خوێنەر سروشتێکی وەهای نەبێت، ئەبێ لە خۆیدا دروستی بکات. هونەرمەند خۆی لە خۆیدا بە جۆش و خرۆشێکی سەیرەوە مامەڵە لەگەڵ کتێبدا دەکات، هەر بۆیە خوێنساردیی سروشتی زانستیانە لە کاتی هەڵسەنگاندندا ئەو جۆش و خرۆشە نائەقڵانییە ڕاست دەکاتەوە. ئەگەر کەسێك بیەوێ ببێ بە خوێنەر، بەڵام گیانی خاڵی بێ لە جۆش و خرۆش و سەبری نەبێ (واتە جۆش و خرۆشی هونەرمەندێك و سەبر و ئارامی زانایەك) زەحمەتە چێژ لە ئەدەبی باش وەربگرێت.

ئەدەب ئەو ڕۆژە لەدایك نەبوو کە وەختێ کوڕێکی منداڵ هاواری ئەکرد گورگ.. گورگ، لە دۆڵێکی نیاندەرتاڵییەوە بەرەو دەرەوە ڕایکرد و گورگێکی بۆری گەورەش دوای کەوتبوو و ڕاوی دەنا، بەڵکو ئەدەب ئەو ڕۆژە لەدایك بوو کە کوڕێکی منداڵ هاواری ئەکرد گورگ هات، گورگ هات و بەڵام ئاسەواری هیچ گورگێکیش نەبوو. ئەوەش شتێکی زۆر دەگمەنە کە ئەم کوڕە منداڵە لە ئەنجامی ئەوەی ئەوەندە درۆی کرد تا لە ئاکامدا گورگێکی ڕاستەقینە خواردی. بەڵام خاڵی گرنگ لێرەدایە، لە نێوان گورگی دۆڵەکە و گورگی چیرۆکەکەدا پەیوەندییەکی کاڵ هەیە. ئەو هێڵەی ئەو دووانە پێکەوە گرێ ئەدات، ئەو پەیوەندییە کاڵە هونەری ئەدەبە.

ئەدەب واتە داهێنانی شتی نوێ، چیرۆك چیرۆکە، ئەگەر بە چیرۆکێك بڵێین چیرۆکی ڕاستەقینە، هەم سووکایەتیمان بە هونەر کردووە و هەم بە حەقیقەت. هەر نووسەرێکی گەورە، فێڵبازێکی گەورەیە، بەڵام ئەو فێڵبازە مەزنە (واتە سروشتیش) هەر وایە. سروشت هەمیشە فێڵ دەکات. هەر لە فێڵی لەیەکچوونی هەندێ شتەوە کە فێڵێکی سادەیە تا وەهمی گەورە و ئاڵۆزیی ڕەنگی باڵی پەپوولەکان یا پەڕی باڵندەکان، لە سروشتدا سیستمێکی سەیر و سەمەرە لە سیحر و فریو هەیە.چیرۆکنووس شوێن پێی سروشت هەڵدەگرێت.

با هەمدیسان بگەڕێینەوە بۆ کوڕە منداڵەکەی لە جەنگەڵستانێکدا هاواری ئەکرد گورگ گورگ. ئەتوانین بڵێین کە سیحری هونەر لە سای ئەو گورگەدا بوو کە ئەو خوڵقاندبووی. ئەو خەونەی ئەو بە گورگەوە بینی و پاشان چیرۆکی فڕوفێڵەکانی ئەو، بوونە چیرۆکێکی باش. وەختێ کە دونیاشی جێهێشت، ئەو چیرۆکەی کە دەربارەی ئەو دەیانگێڕایەوە. لە تاریکیی دەوراندەوری ئاگردانەکاندا بوو بە دەرسێکی باش. بەڵام ئەو سیحربازە بچووکەکە بوو. خوڵقێنەر بوو.

ئەکرێ لە سێ ڕووەوە لە نووسەر بتۆژینەوە: وەکو چیرۆکبێژێك، وەکو مامۆستایەك، وەکو سیحربازێك، نووسەری گەورە ئاوێتەیەکە لەم سیانە: چیرۆکبێژ، مامۆستا، سیحرباز– بەڵام سیحربازەکە دەروونی ئەوە کە زاڵ دەبێ و نووسەرێکی گرنگی لێ دەخوڵقێنێ.

ئێمە بۆ کات بەسەربردن، بۆ سادەترین شێوەکانی وورووژانی زەینی، بۆ بەشداریکردنی عاتیفیانە، بۆ لەزەتی سەفەری شوێنێکی دوور لە کات و شوێنی خۆمان پەنا بۆ چیرۆکبێژ دەبەین. هەیە کە زەینی تا ڕادەیەك جیاوازە و لە ئاستێکی باڵادا نییە و لە نووسەردا تەنها بە دوا "مامۆستا"دا دەگەڕێ، بەڵام ئەوەی ئەو بەدوویدا وێڵە نووسەر نییە، جاڕچییە، یا موفتیی ئەخلاقە، یا پەیامبەرە. ئەکرێ جگە لە دەرسی ئەخلاقی بۆ زانیاری و هەندێ ڕاستیی تریش بچینە لای مامۆستا. بە

داخەوە خەڵکانێکم دیوە کە مەبەستیان لە خوێندنەوەی ڕۆمانی ڕۆماننووسە فەرەنسایی و ڕووسەکان ئەوە بووە کە دەربارەی ژیان لە پاریسی دڵڕفێن یا ڕووسیای غەمزەدەدا زانیارییان چنگ بکەوێ. بەهەرحاڵ لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەوەیە کە نووسەری گەورە سیحربازێکی گەورەیە و لێرەوەیە کە ئەگەینە خرۆشێنەرترین لایەنی کارەکە. واتە کاتێ کە هەوڵ ئەدەین لە سیحری تاکەکەسیی ئەو داهێنەرە و، شێواز و، وێنەسازی و، گریمانەی ڕۆمانەکانی یا شیعرەکانی بکۆڵینەوە.

ئەم سێ لایەنەی یەك نووسەری گەورە –سیحر، چیرۆك، دەرس– هەر ئەوەندە ئاوێتەی یەکتر بوون، یەکەیەکی درەوشاوەی تایبەت پێکدەهێنن، لەبەرئەوەی کە سیحری هونەر ئەشێ لە ئێسکی چیرۆکەکەدا، لە مۆخی ئێسکی هزری هەنووکەدا بێت. هەندێ شاکار هەن کە هزرێکی وشك و ڕوون و ڕێکخراویان هەیە و موچڕکێکی هونەرمەندانەمان پیا دێنن کە لە ئاستی کارێکی وەکو ڕۆمانی (پارك مانسفێلد) یا هەر ڕووداوێکی دەوڵەمەندی پڕ وێنەی هەستیی دیکنزیدایە.

بە ڕای من، ڕێسای باش بۆ هەڵسەنگاندنی ڕۆمانێك، تا سەردەمێکی درێژ، پێکهاتەی شیعری و ئامادەگیی گیانی پێشبینانەی زانستە تیایدا. بۆئەوەی سیحری کتێبێکیش کاری خۆی بکات، ئەبێ خوێنەری ژیر ئەو کتێبە نە ئەوەندە بە دڵ و، نە ئەوەندەش بە مێشکی بخوێنێتەوە، بەڵکو بە بڕبڕاگەی پشتی. وەکو ئەڵێن لەوێدایە کە ئەو "مێروولەکردنە" ڕوودەدات، گەرچی لە کاتی خوێندنەوەدا ئەبێ کەمێك مەودا وەربگرین، کەمێك دووری لە نێوان خۆمان و دەقەکەدا هەبێ. پاشان بە لەزەتێکەوە کە هەم هەستییە و هەم ئەقڵی، تەماشای هونەرمەندەکە بکەین کە قەڵا کارتۆنییەکەی دەخولقێنێ و، دەبینین قەڵا کارتۆنییەکەی ئەبێتە قەڵایەکی جوانی لە پۆڵا و شووشە دروستکراو.

## پەراوێز

1–ئەم نووسینە یەکێکە لەو زنجیرە موحازەرانەی کە ڤلادیمیر نابۆکۆڤ (1899–1977)ی نووسەری(لۆلیتا)و ڕەخنەنووسی گەورەی ڕووس لە کاتی مامۆستاییدا لە کۆلێجە جیاجیاکاندا وتویەتییەوە.

2–خوێنەرەوە: بەو مانایەی کە هەر کتێبێك بۆ چەند جارێك بخوێنێتەوە.

## سەرچاوە

کتێبی "مسخ و دربارەی مسخ، ترجمە/ فرزانە طاهری، انتشارات نیلوفر، چاپ اول، پاییز 1368–تهران.

# ڕۆڵی وەرگر لە پرۆسێسی داهێناندا

کەریم ئەبوحەلاوە
لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

هەنگاوهەڵهێنانمان لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەو گۆشەنیگایەوەیە کە پرۆسێسی داهێنان یەکەیەکی ئاوێتەیەو ئەم توخمە بنچینەییانە دەگرێتەخۆی: داهێنەر– دەق– وەرگر (**دەق لێرەدا بابەتی داهێنانەو دەشێت چەند توخمێك بگرێتەوە: کتێب، تابلۆ، پارچە ئاواز، فیلم، بابەتی بیستەکی..هتد**). هەوڵدانەکەشمان، کە ئامانجیەتی مەسەلەی وەرگرتن وەك مەسەلەیەکی سەربەخۆ شیبکاتەوە، بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەکە، پێویستی بە لێك جیاکردنەوە لە ڕوی تیۆریی توخمەکانی پرۆسێسی داهێنان هەیە، چونکە ئەزموونی کاری داهێنان هاوکات ئەزموونی نووسینو وەرگرتنە.

ئەگەرچی داهێنەرەکان لە مێژوودا جێی بایەخپێدانی پلە یەك بوونو بەشی زۆری کاتی ئاخاوتن دەربارەی داهێنانیان بۆ تەرخانکراوە، بەلام کاتێك بایەخدان بە دەقەکان زۆرتربووو شێوازەکانی تاوتوێکردنی دەق هەمەڕەنگ بوو، جا ئەوە لە ڕوی زمانەوەوانیەوە بووبێ یان لۆژیکی، شێوازی، دەروونی، فرمانی، بنەمایی..هتد، گەشەکردنی گرنگ ڕویدا. لەبەرئەوەی ئەو شێوازە جیاوازانە، هاوشانی ئەو گەشەکردنەی بەسەر ئامرازە مەعریفیو هونەرییەکاندا هاتوون، بەشداربوون لە توخنکەوتنی دەقەکاندا. ئەمەش بۆتە هۆی خستنەڕوی ڕەهەند، ئاستو دەلالەتە جۆربەجۆرەکانی دەق، جا ئەو دەقە ئەدەبی بووبێت یان فیکری یان تابلۆیەکی ئەدەبی یاخود بابەتێکی بیستەکیو چاوەکی.

بایەخدان بە دەقو دەلالەتو ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانی، کێشەی وەرگرتنی وروژاند، بەتایبەتی لە بوارەکانی هونەرو ئەدەبدا، چونکە ئەگەرچی زۆربەی لێکۆڵینەوە کلاسیکییەکان، پشتئەستوور بە تیۆرە تەقلیدییەکانی جوانزانیو لێك جیاکردنەوەی وێنەو بابەت، کاری داهێنانو کاری وەرگرتنیان لێك جیادەکردەوە، بەلام مەسەلەی وەرگرتنی هونەرو ئەدەب بەتوندی وەك چەقەمەسەلەیەك خۆی خستەڕوو. ئەمەش لە ژێر کاریگەریی ئەو پێشکەوتنە خێرایەی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەخۆیانەوە دی، بەتایبەتی لە بوارەکانی دەروونزانی، زمانەوانی، کۆمەڵناسی، ئیپستمۆلۆژیا، ڕەخنەی ئەدەبیو ئەوانی

دیکەدا. ئەو دەروازەکردنەوە نوێیانەی بواری میتۆدەکان و ئامڕازەکانی توێژینەوەش، زەمینەیەك بوو گەشەکردنی گەلێك چەمك و ئامرازی مەعریفی وەها کە یاریدەدەربوون بۆ شیکردنەوەی مەسەلەی وەرگرتن و ڕۆشناییخستنە سەر ڕۆڵی وەرگر لە نوێکردنەوەی پڕۆسێسی داهێناندا.

ئیمڕۆ زۆربەی لێکۆڵەرەکان کۆکن لەسەر گرنگیی وەرگرو داندەنێن بە بایەخی لێکۆڵینەوە دەربارەی خوێنەر، بینەرو گوێگرداو ئاشنابوون بە پێداویستی و بایەخدانەکانیان بە گرنگ دەزانن. لێرەدا دەپرسین: وەرگر کێیە؟ ئایا بەشێکی پڕۆسێسی داهێنان پێکدێنێ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستی بەوەیە بپرسین: ئەو هۆیانە چین کە پاڵ بە داهێنەرەوە دەنێن بنووسێت؟ داهێنەر بۆ کێ و بۆچی دەنووسێت؟. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە پڕۆسێسی داهێنان ئەوە دەردەخات، کاتێك داهێنەر دەنووسێ/ بەرهەمدێنێ، هەمیشە ڕەچاوی ئەوە دەکات بۆ ئەوانی دیکە دەنووسێت، جا ئەوانی دیکە دەستەبژێر بێت یان توێژێك، چینێك، نەتەوەیەك، مرۆڤایەتی، تاکگەلی وێناکراو[1]، هەروەها داهێنەر لە دەستپێکی بابەتەکەیەوە وەرگر لە مێشکیدایە، ئەو وەرگرەی هۆشمەندیی داهێنەر لە ڕێگەی هەڵویست و تێڕوانینی بۆ دنیا وێنایدەکات و گوتارەکەی خۆی ئاڕاستەدەکات (**تۆلستۆی ڕۆمانووس سەبارەت بە ئەزموونی داهێنانی خۆی دەڵێت: من لە ئەزموونی نووسینی خۆمەوە دەزانم کە شڵەژانی ئەو دەقەی دەینووسم و چۆنیەتی دەقەکە گرێدراوی وێناکردنی پێشوەختمە بۆ ئەو خوێنەرەی بۆی دەنووسم**). بۆیە پێمانوانییە وەرگر تەنیا تاکگەل یاخود کۆمەڵە تاکێك بێت، بەڵکو کیانێکی چۆنایەتی/ نموونەیەکە دەشێت بەم یان بەو ڕێژەیە هاوجووتی وەرگری بەکردەوە بێت یاخود جیاوازبێت لەگەڵیدا.

ڕۆڵی وەرگری واقیعی ئەو کاتە دەستپێدەکات کە بابەتی داهێنانەکە هاتبێتەئاراوەو ئەوە وەرگرە کە ژیان دەگێڕێتەوە بۆ بابەتی داهێنانەکە. ئەمەش کاتێك کە تواناکانی ئەو بابەتە/دەقە لە بواری بوونی ماتەوە دەگوێزرێنەوە بۆ بوون بەواتای واقیعی، یان ئەرستۆ وتەنی بوونی بەکردەوە.

بێگومان شێوازە هەمەجۆرەکانی دەربڕین (کتێبەکان، تابلۆکان و مۆسیقا)، بەبێ بوونی خوێنەرو بینەرو گوێگر هیچ مانایەکیان نییە. دەشێت ئەمەش بەڵگەنەویستە بێت، چونکە لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەشێوەیەکی دووبارەو ئاسایی کاری خوێندنەوەو گوێگرتن و بینین ئەنجامدەدەین[2]. ئەگەرچی ئەمە بەو مانایە نییە کە وەرگرتن لای خەڵك وەك یەکە، لەبەرئەوەی جیاوازییەك لەئارادایە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندییەکانی وەرگرو خەسڵەتە ئەقڵی و دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی. بەوپێیەی خەڵکی بەهۆی جیاوازییە تاکەکەسییەکانەوە لە ڕوی توانا ئەقڵی و دەروونیەکانەوە پێك ناچن، هەروەها لە ڕوی بایەخدانەکان و ئاستی خوێندن و پێگەی کۆمەڵایەتیەوە جیاوازن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی شتە بەدەستهاتوەکان. ئەوەی سەبارەت بەم جیاوازیانە بەلامانەوە گرنگە، ئەوەیە داخۆ تاکو چەند کاریگەرییان لەسەر پڕۆسێسی وەرگرتن و ئاستە جیاوازەکانی هەبێ.

## چۆن لە وەرگرتن دەکۆڵینەوە؟

وەرگرتن دیاردەیەکی هاوشانی دیاردەی داهێنانەو بوونی گرێدراوی کارلێککردنی نێوان خودو بابەتە. دەشێت سەیربێت قسە دەربارەی بەهرەی وەرگرتن بکەین، بەو پێیەی ئاخاوتن دەربارەی بەهرەی داهێنان لەلای لێکۆڵەران زیاتر باو و ڕەوایە. بێگومان وەرگرتن تەنیا

پێکگەیشتنی داهێنەرو وەرگر نییە لە ڕێی بابەتی داهێنانەکەوە، بەڵکو (ئەناتۆل فرانس) وتەنی دیالۆگێکی هاوتایە لە نێوان نووسەرو خوێنەردا. وەرگرتن لە بوارەکانی فیکرو ئەدەبو هونەردا تەنیا گفتوگۆ یان ناکۆکیی فیکری نییە، بەڵکو دۆزینەوەیەکی نوێیە لەناو ئەو ژیانەدا کە داهێنەر دەریدەبڕێت. هاوکات پەروەردەکردنی خودو چێژوەرگرتنێتی[3].

پشتئەستوور بەوانەی پێشەوە، ئایا دەتوانین بڵێین وەرگرتن داهێنانە؟ ئەی داهێنان چییە؟

دوور لە پێناسە هەمەجۆرەکان سەبارەت بە داهێنان، بەکورتی دەتوانین بڵێین: داهێنان پێشکەشکردنی سوودبەخشو خۆشیبەخشە، واتە دامەزراندن/خوڵقاندنی بەهایەکی جوانکاری یان مەعریفیی نوێیە. کەواتە سەیرنییە پاش ئەمە بڵێین وەرگرتن شێوەیەکی داهێنانە؟ دوو بیروڕای چەوت بۆ تێگەیشتنی پڕۆسێسی وەرگرتن لەئارادایە: یەکەم پێیوایە وەرگر لە بنەڕەتدا شتێکی نوێ دروستناکات، بەڵکو لە باشترین دۆخدا دەخوێنێتەوە، تێدەگات، بەپیرەودەچێت یاخود ڕەتدەکاتەوەو ئەندێشەو هەستی دەبزوێن، بەڵام هیچ شتێکی نوێ داناهێنێ[4]. لە کاتێکدا دوەم پێیوایە وەرگرتن مەسەلەیەکی تەواو سەربەخۆیە لە بیرۆکەی داهێنەرو ناوەڕۆکی بەرجەستەکراوی ناو دەقەکەی، لەبەرئەوەی دەق بەپێی ئەم مانایە پاش بەرهەمهێنانی لە داهێنەرەکەی جیادەبێتەوە. بۆیە ئەمانە پێیانوایە وەرگرتنی دەق پڕۆسێسێکی داهێنەرانەی نوێیە، چونکە ئەو خوێندنەوەیەی ئەوان پێشنیاریدەکەن پێویستی بەو سروشە هەیە کە تەنیا لای دەستەبژێرێکی خەڵك بەدیدەکرێت[5]. بەوپێیە جیاوازیی لەنێوان داهێنانی بەرهەمهێنانو داهێنانی وەرگرتندا نامێنێ، ئەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی تێگەیشتنی زانستیانەی هەردوو پڕۆسێسەکە. ئەمە لەکاتێکدا کە سەختە، بێ لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی یاساکانی وەرگرتنو هاندەرەکانی بەپێی پێداویستیو ئامانجەکانی وەرگرتنو بەبێ زانینی توانای چنینەوەو هەڵوەشاندنەوەی دەقو گەیشتنە ناوەڕۆکە هەمەلایەنەکانی، لە پڕۆسێسی وەرگرتن تێبگەین. چونکە ئەو وەرگرەی لەگەڵ دەقدا دەکەوێتە کارلێکردنەوە ئەوەیە کە لە دەق دەکۆڵێتەوە، هێماکانی شیدەکاتەوە، جومگەگیرییە بنچینەییەکانو تێڕوانینە گشتییەکانی دەستنیشاندەکاتو ئاسۆ لەخۆگرتوەکانی دەدۆزێتەوە. واتە وەرگرێکی داهێنەرە. بەوجۆرە وەرگر واتایەکی پێشکەوتوو دەداتە فرمانەکانی داهێنانو خواستگەلی وەها بۆ خۆیو ئەوانی دیکە دیاریدەکات کە لە کاری داهێنان جیاناکرێنەوە، بەڵکو تەواویدەکەنو هاوکات دۆخێکی داهێنان بەواتا فراوانو قوڵەکەی دەخوڵقێنێ. ئەم دۆخی داهێنانە تەنیا دەستکردی داهێنەرەکان نییە بەتەنیا، چونکە خوێنەرو ڕەخنەگر بەشێکی بنچینەیی دۆخی داهێنانن‌و بەبێ سێکوچکەی داهێنەرو بەرهەمەکەی- وەرگرو تواناکانی- ڕەخنەگرو شێوازو کەرەستەکانی کارەکەی کامڵ نابێت[6].

## ئاستەکانی وەرگرتن:

ڕوانینی وردبینانە بۆ پڕۆسێسی وەرگرتنی داهێنانە جۆراوجۆرەکان دەریدەخات کە خەڵك لە ڕوی شێوەو ئاستی وەرگرتنی ئەو داهێنانەوە جیاوازن، هەروەها لە ڕوی هەڵسەنگاندنی ئەوەی وەریشیدەگرن لێك ناچن. بەوپێیەی هۆکانی ئەو جیاوازیو لێك نەچوونە زۆرن‌و پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە کە ئەمە دەرفەتی نییە، بۆیە پشتئەستوور بە پێوانەی چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتی داهێنانەکە، زیاتر جەخت لەسەر هەندێك نموونەی وەرگر دەکەینەوە.

لە ساکارترین ئاستەکاندا، وەرگری ئاسایی بەدیدەکەین کە بابەتی داهێنانەکە دەخوێنێتەوە/ وەردەگرێت و تەنیا بە ئیمپرێشنێکی سەرەتایی بەرەنجامی خوێندنەوەی سەرەتاییەوە دەوەستێ، بەبێ قوڵبوونەوە یان شیکردنەوە. هەروەها ئەوانە قایلن بەوەی تەنیا چاو بە بابەتەکەدا بخشێنن و تێڕوانینێکی گشتی دەربارەی بەدەستبێنن. ئەم توێژە ڕیژەی هەرە زۆری وەرگرەکان پێکدێنێ، بەتایبەتی لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا. وەرگری بایەخدەر/بەدواداچوو نموونەیەکی دیکەی وەرگرە. ئەمانە توێژێك کەسی بەدواداچوو پێکدێنن کە کارەکە دەخوێننەوەو ناوەڕۆکەکەی دەخەنەڕوو و لایەنە چاك و خراپەکانی دەخەنە بەرچاو، بەڵام بەبێ قوڵبوونەوە لە دیاریکردنی جومگەگیرییەکانی و ئەو پاشینەیەی کارەکە هەنگاوی لێوە هەڵدێنێ. خوێندکارەکانی زانکۆو بەشێکی زۆری خوێندنە ئەکادیمییە ڕووتەکان بەشی زۆری ئەم توێژە پێکدێنن کە بە وەسفکردن و باسکردن و لەباشترین دۆخدا هەڵسەنگاندنەوە دەوەستن.

لە بەرزترین ئاستەکانی وەرگرتندا، ئەو وەرگرە لێکۆڵەرە بەدیدەکەین کە بایەخ بە داهێنانەکان دەدات، بەدوایاندا دەچێت، شیاندەکاتەوە، لایەنە لێکچوو و جیاوازەکانیان بەراورددەکات و هەڵوێست بەرامبەریان وەردەگرێت. ئەم جۆرە وەرگرە بایەخ بە دەلالەتەکان و پێشینە فیکری و ئایدیۆلۆژییەکانی دەقەکە دەدات و لە ڕێگەی هەڵوێستێکی هەمەلایەن یان جیهانبینییەکی گشتیی وەهاوە داوەریدەکات کە یارمەتیدەدەن شوێنگەی دەقەکەو وەچەکەی و ئەو ئاراستەیە دیاریدبکات کە لێی دەکەوێتەوەو یەکێك لە شێوازەکانی دەربڕینی دەبێت. ئەم جۆرە وەرگرە بەتواناترن بۆ تێگەیشتنی دەقەکان و شیکردنەوەی هێماکانی و نزیکترین کەسانێکن بۆ شێوازی ڕەخنەگرانەی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقی داهێنەرانەدا. ئەمانە ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە گفتوگۆکان و شێوە جۆربەجۆرەکانی گفتوگۆی ناو ئەو نێوەندانەی بایەخ بە مەسەلەکانی ئەدەب، هونەرو فیکر دەدەن و لەناو ئەواندا ئەو ئاقارە هونەری و ئەدەبیانە سەرهەڵدەدەن کە بەشێوەیەکی هەستپێکراو کاریگەریی دەخەنە سەر بیروڕای گشتی بایەخدەر بەم مەسەلانە. هەروەها ئەمانە پردی پەیوەندیی نێوان ڕەخنەگرە تایبەتمەندەکان و کەسە ئاساییەکانن، ئەمەش لە ڕێگەی لێکدانەوەو شیکردنەوەی چەمك و ئاقارە ڕەخنەییە باوەکانەوە.

لەکاتێکدا وەرگری ڕەخنەگر وەرگرێکی بە چۆنایەتی جیاوازە، ئەو کەسەیە بایەخ بە داهێنانەکان دەدات و پێیوایە بەرهەمگەلێکن شایەنی بایەخپێدانن. جا لەبەرئەوەی ڕەخنە بەپێویست گوێزانەوەیەکی فیکریی کاری هونەرییە، بۆیە ڕەخنەگر بە ئیمپرێشن و چێژوەرگرتنی سەرەتاییەوە ناوەستێ، بەڵکو ڕوودەکاتە باسکردن و شیکردنەوەو هەڵسەنگاندن، بۆ گەیشتنە هەڵوێستێکی تیۆری پشتبەستوو بە تێڕوانینێکی هەمەلایەن، کە وەك بنچینەیەك بەکاریدێنێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو بابەتەی لێیدەکۆڵێتەوە.

دەشێت ڕەخنەگرەکان ڕۆڵێکی زیندوو ببینن و بەشداریبکەن لە تەکاندان بە پرۆسێسی داهێنان و نوێکردنەوەدا، ئەمەش لەڕێگەی بەشداریکردنیان لە یارمەتیدانی وەرگرەکانی دیکە بۆ چێژوەرگرتن و تێگەیشتنی کارە داهێنەرەکان لەلایەك و کاریگەریخستنە سەر داهێنەرەکان بەهاندانیان بۆ تاوتوێکردنی مەسەلە هەرە جەوهەرییەکان لەلایەکی دیکەوە. ڕەخنەگری بەتوانای خاوەن تێڕوانین و بەهرە دەتوانێت وەرچەرخانێکی گرنگ لە ڕێڕەوی ژیانی داهێنانی ئەدەبی و هونەری و فیکریدا بێنێتەئاراوە، ئەمەش لە ڕێگەی کارکردن بۆ گەشەپێدانی ئاقاری ڕەخنەگرانەی چالاکەوە کە دەبێتە هۆی خوڵقاندنی نەوەیەکی نوێی داهێنەرو

بەهۆی ئەو تێڕوانین و خواستانەوە کە یاریدەدەرن بۆ دارشتنی ڕۆحی سەردەم و بایەخدانەکانی وەرگرەکان لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا[7].

وەرگر، جا ڕەخنەگر بێت یاخود خوێنەر، لە ڕێگەی وەرگرتنی ئەوەی جەوهەری و مێژووییە لە بابەتی داهێناندا، واتە بەڕادەی نزیکبوونەوەو تێگەیشتنی لە ڕەهەندە جوانکاری و مەعریفییەکانی دەق، بەشداریدەکات لە نوێکردنەوەی پرۆسێسی داهێناندا. لێرەدا کارامەیی وەرگرتن بێسنوورنییە، چونکە دەرپەڕینی ئەم پرۆسێسە دەشێت ببێتە هۆی شێواندنی دەقەکەو بەهەڵەتێگەیشتنی، ئەمەش لە دوو باردا: باری بارکردنی دەق بەشتێك لە توانایدانەبێت، ئەمەش بارێکی باوەو دەشێت لە چەندین گفتوگۆو بەرهەمی ڕەخنەگرانەدا بەدیبکرێت کە تاوتوێی ئەم یان ئەو داهێنانە دەکات. باری کورتکردنەوەی دەق بۆ بەشێك لە ناوەڕۆکەکەی و دانانی بە چییەتی دەقەکە. واتە پوختکردنەوەی داهێنانەکە لە ڕەهەندێك و لە بەرژەوەندیی بیروڕا یاخود مەبەستێکی دیاریکراودا. بەخۆ دورڕاگرتن لەو دوو لادانە، داهێنانەکە دەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببێنێت و بەشداربێت لە دەوڵەمەندکردنی کەسێتی وەرگردا. وەرگریش کاتێك لە ڕێگەی دەربڕینی پرسیارگەل و مەسەلەی نوێوە، کە کەرەستەی داهێنانەکەیە، دەگەڕێت بەدوای ناوەڕۆکی جوانکاری و مەعریفی نوێی وەهادا کە ڕەتکەری ئەوەیە پێیگەیشتوەو بەدەستیهێناوەو تەکان بە ڕەوتی کاری داهێنان دەدات و سەرەنجامیش بەهۆی دیالەکتیکی هۆشیاری و پراکتیکەوە کاریگەریی دەخاتە سەر ڕێڕەوی ژیانی کۆمەڵایەتی.

بۆ ئەوەی بتوانین لە پرۆسەی داهێناندا بەشێوەیەکی چاکتر توخنی ڕۆڵی وەرگری واقیعی بکەوین، پێویستە هەڵوەستەبکەین و پرسیار سەبارەت بەو مەبەست و ئامانجانە بکەین کە داهێنەران لە بەرهەمهێنانی بابەتەکانیان دەیخوازن. بۆ خۆدوورخستنەوە لە ئاخاوتن دەربارەی داهێنانی ڕووت، باس لە پەیوەندیی نێوان داهێنان و واقیعی کۆمەڵایەتی دەکەین، ئەمەش بۆ ناسینی فرمانە کۆمەڵایەتیەکانی داهێنان.

داهێنان بەشێکی گرنگی بەرهەمی کولتووریی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراوی ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراو پێکدێنێ و ملکەچی هەمان ئەو پەیوەندییانەیە کە لەنێوان بەرهەمی کولتووری و بنەمای بنچینەیی کۆمەڵگەدا پێکدێت، ئەو پەیوەندییەی کارتێکران و کارلێککردنی دیالەکتیکیانەی نێوان ژێرخان و سەرخان، دوایش نێوان بنەمای کۆمەڵایەتی و هۆشیاریی کۆمەڵایەتی بەگشتی دەگەیەنێ. بەم واتایە دەشێت سەرهەڵدانی ئاقارگەلی داهێنەرانەی دیاریکراو لە ئەدەب و هونەرو فیکردا گرێبدەینەوە بە ئاستی گەشەکردنی ئابووریی کۆمەڵایەتی قۆناغێکی مێژووییەوە. بێگومان لە ڕوانگەی مەتریالیزمی مێژووییەوە، چیدی پەیوەندیی نێوان شێوازە جۆربەجۆرەکانی دەربڕین و سیستەمی بەرهەمهێنانەوە پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن نییە، بەڵام ئەم پەیوەندییە گشتییە لە بایەخی لێکۆڵینەوەی بارە تایبەتیەکان کەمناکاتەوە، بەو پێیەی سروشتی پەیوەندیی نێوان بەرهەمی کولتووری و ژێرخان ڕاستەوخۆنییەو بە چەندین ناوکێشدا تێدەپەڕێت، ئەمە وێڕای نەبوونی پێکەوە ڕێکردنی هەردوو گەشەکردنەکە. ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە بۆچی شێوازە جۆربەجۆرەکانی بەرهەمهێنانی هونەری و فیکری، سەرەڕای گۆڕانی ئەو بنەما کۆمەڵایەتیەی بەرهەمیهێناوە، بەردەوامدەبێت[8] (**تراژیدیای یۆنانی و شانۆی شکسپیر**). واتە بەرهەمی کولتووری خاوەن تایبەتمەندیی چۆنایەتی و سەربەخۆیی ڕێژەییەو ناکرێت ڕاستەوخۆ بگێڕرێتەوە بۆ واقیع و وەك تاودانەوەیەکی ڕاستەوخۆی واقیع سەیربیکرێت،

چونکە بەرهەمی کولتووری خاوەنی بنەماو یاسا ناوەکییەکانی خۆیەتیو وێڕای کۆمەڵێك ئامڕازی پەیوەندیی ئایدیۆلۆژیانە کە دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، بەشداریدەکات لە خولْقاندنی ئەو دوورییەی نێوان دەربڕینی کولتووری (فیکریو هونەری)و ئاستی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا[9]. ئینجا بەپەراوێزکردنی شێوازگەلی دیاریکراوی بەرهەمی کولتووری لەلایەن کۆمەڵگەکانەوەو داهێنانی شێوازگەلی نوێ کارێکی هەڕەمەکی نییە، بەڵکو پەراوێزکردن یاخود نوێکردنەوە لە هەلومەرجی مێژوویی دیاریکراوو بۆ بەپیرەوەچوونی ئەو پێداویستیو ئەرکە نوێیانەن کە کۆمەڵگە یاخود یەکێك لە چینەکانی دەریاندەبڕێت[10].

## کەواتە ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی داهێنانی ئەدەبیو هونەری چین؟

سۆسیۆلۆژیای پۆزەتیڤیست، بەهۆی پێشکەشکردنی دیمەنێکی دورودرێژو وردکارانەوە سەبارەت بە کۆمەڵگەی دامەزراوو لە ڕێگەی چاودێریو دەرخستنی چۆنیەتی کارکردنی بنەمای کۆمەڵایەتیو زانینی شوێنگەی کارە داهێنەرەکانو هەڵهێنجانی ئەرکەکانیەوە، وەڵامی خۆی داوەتەوە. لێرەشدا کارەکانی (فۆکن)و (سبیلبرن)، وێڕای توێژینەوەکانی (زوزنگرین)ی ئەزموونخوازانە هاتنەئاراوە بۆ ئەوەی وێناکردنی خۆیان بخەنەڕوو، ئەوەبوو ئەو بوارەی پێیدەوترێ بواری سۆسیۆلۆژیایان لە ڕەخنەی ئەدەبی لەلایەكو جوانزانی لەلایەکی ترەوە جیاکردەوە، ئەمەش لە ڕێگەی جیاکردنەوەی داوەرییەکانی کردارو داوەرییە بەهاخوازەکانەوە.. لەلایەکی ترەوە ئاقارێکی دیکەی سۆسیۆلۆژیای ئەزموونگەری پێیوابوو کە دەکرێت وەك بەڵگەنامەی کۆمەڵایەتی بڕوانرێتە دەقە ئەدەبییەکان، ئەوەش لە ڕێگەی وردبوونەوە لە ناوەڕۆکەکانو پشتگوێخستنی شێوەوە، واتە لایەنە جوانکارییەکانی کارە ئەدەبییەکان. (فۆکن) دەڵێت دەشێت وەك دیاردەیەکی هونەری سەیری کارە ئەدەبییەکان نەکرێت، بەڵکو وەك دیاردەی کۆمەڵایەتی[11]. بەم واتایە، کارە ئەدەبییەکان تەنیا بێلایەن دەبنو کێشەی نووسین لە ڕێگەی دوورخستنەوەی پرسیار سەبارەت بە سوودو ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتیانەوە بەدوردەگیرێت کە دەریدەبڕێت، واتە مانای کۆمەڵایەتی نووسین پەراوێزدەکرێت[12].

لە کاتێکدا سۆسیۆلۆژیای دیالەکتیکی، بەجیاوازیی ئەو توخنکەوتنانەی پێشکەشیکردونو جیاوازیو ناکۆکییەکانی نێوان نوێنەرەکانیان، وەڵامی خۆی لە چوارچێوەیەکی گشتیدا خستەڕوو کە لە دەوری تێگەیشتنو بەرجەستەکردنی پەیوەندیی نێوان دەقی ئەدەبیو واقیعی کۆمەڵایەتی دەخولایەوە. بەم واتایە، کاری ئەدەبی تەنیا تاودانەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی نییە، هەروەها تەنیا پەیوەندییە باوەکانو ئایدیۆلۆژیای باویش بەرهەم ناهێنێتەوە، بەڵکو پشتبەستوو بە تێگەیشتنی هەستپێکراوو مەعریفەی ئەقڵی دیاردەیەکی دیاریکراوەوە کاری ڕەخنەگرانەو بووژاندنەوەیەك ئەنجامدەدات کە لە چوارچێوەی ڕەوتی گشتی (مێژووییو کۆمەڵایەتی)دا نەبێت شیاونین. مارکس لە بواری ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی نێوان ئەدەبو هونەر لەگەڵ واقیعدا دەڵێت: "شێوازی بەرهەمهێنانو ئەدەبی سەردەمێکی دیاریکراو ناوگری سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتین کە لەسەر بناغەیەکی دیاریکراو دامەزراون.."[13].

لەو کاتەوە بەشداریکردنەکانی ڕەخنەگرە دیالەکتیکیەکانو بایەخدەران بە سۆسیۆلۆژیای ئەدەب بۆ وەڵامدانەوەی ئەم ئیشکالیەتە لەئارادابوون، هەر لە (لۆکاتش)ەوە بیگرە کە وەك

شـێوازێکی ئـەدەبی بـاوو دەربـڕی کولتـووری هاوچـەرخ بایـەخی رەخنەگرانـەی دا بـە رۆمـان و پێیوابـوو ئـەدەب و هونـەر ئـەرك و فرمـانی دیاریکراویـان هەیـەو هـەوڵی دا لـە رێگـەی توێژینـەوەکانی بـۆ کارەکانی (بلـزاك، تۆماس مـان، تۆلسـتۆی و ئـەوانی دیکـە)وە ئـەوە بسـەلمێنێ. یەکەمین فرمـان توانـای داهێنانـە بـۆ چـڕکردنەوەی هۆشـیاریی مرۆڤایـەتی بـۆ ناسـینی جیهـانی دەوروبـەرو ئاراسـتەکردنی لـە رێگـەی خولقانـدنی مـۆدێلی نوێـوە کـە شـێوە جوانکـاری و مەعریفیـە تەقلیدییـەکان رەتـدەکات، بـەو جـۆرەش باسـی "نموونـەیی" کـرد وەك چـەمکێکی بنچینەیی رەخنـەی ئـەدەبی و یـەکێك لـە پێوانـە گرنگـەکانی ناسـینەوەی ئـەدەب. نموونـەیی بەرجەسـتەکاری پەیوەندیی نێوان ئەوەیە کە تاکەکەسی و جیاکارەیە لە مرۆڤدا لەگەڵ ئەوەی کە کۆمەڵایەتیە تیایدا. بەو جـۆرە هـەر کـارێکی ئـەدەبی، کـە سـەرلەنوێ بەرهەمهێنانـەوەی دەرهاوێشـتە کۆمەڵایەتیـە دامـەزراوەکان بـێ، بـەبێ ورووژانـدنی ئـەوەی جەوهەرییـە تیایانـدا، ئـەدەبێکی رووتکـارەو پەککەوتەیە لەئاست خستنەڕووی گشت لە رێگەی تایبەتیەوە، واتە رێگەی نموونەییەوە[14].

لە کاتێکدا (لوسیان گۆڵدمان) جەختی لەسەر ئـەوە کـردەوە کـە پێیـدەڵێ بنـەمای دەلالی و بینینـی دنیا، واتە یەکبوونی کاری داهێنانەرانەو واتاکەی، هـەروەها سروشـتی جوانکـاریی جیاکـارەی دووپـاتکردەوە، ئەمـەش بەمەبەسـتی دۆزینـەوەی پەیوەنـدیی نێـوان بنـەمای زەیـن کـە هۆشـیاریی دەسـتەجەمعی پێکـدێنێ و بنـەمای جوانکـاری و رواڵـەتخواز کـە کـاری ئـەدەبی لەسـەر رادەوەسـتێ. گۆڵـدمان دەڵێـت: "ئێمـە دەتـوانین پشتئەسـتوور بـە بنـەمای دەلالی و بینینـی دنیـا، کـە یەکەیـەکی کـامڵ پێکـدێنن، لـە دەقێکـی دیـاریکراو بکۆڵینـەوە"[15]. ئـەو لێـرەدا مەبەسـتی لـە بینینـی دنیا "ئەو کۆمەڵە خواست و هەست و بیروڕایانەیـە کـە تاکـەکانی کۆمـەڵێکی دیـاریکراو کۆدەکاتـەوەو وایـان لێـدەکات بـەرەنگاری کۆمەڵـەکانی دیکە ببنەوە"[16].

گۆڵـدمان لێکۆڵینـەوەیکرد دەربـارەی پەیوەنـدیی نێـوان بکـەری کولتـووری داهێنـەرو هۆشـیاریی (بەهەردوو شێوەی بەکردەوەو شیاو)، دواتریش لە پەیوەندیی نێوان بەرهەمی کولتووری و ئەو بکەرەی کۆڵییەوە. ئەو دەڵێت: "پەیوەندیی بنچینەیی نێوان ژیـانی کۆمەڵایـەتی و داهێنـانی ئـەدەبی گرێـدراوی نـاوەرۆکی ئـەو دوو بـوارە نییـە لـە واقیعـی مرۆڤایەتیـدا، بـەڵکو تـەنیا پەیوەنـدیی بـە بنـەمای زەینییەوە هەیە، واتە ئەوەی پێیدەوترێ گوتەکان و ئـەو هۆشمەندییـە ئـەزموونکارە رێکـدەخات کـە توێـژێکی کۆمەڵایـەتی دیـاریکراو هەیـەتی و ئـەو جیهانە ئەندێشەییەی نووسەر دەیخولقێنێ"[17].

بـەو جـۆرە داهێنـان، هەرچـەندە تاکەکەسـی و لوتبەرزانە بێت، ناکرێت بەبێ ئەو چوارچێوەیەی تیایـدا دروسـتبووەو بـەبێ ئـەوەی ئاراسـتەی ئـەوی دیکـە (وەرگـر) بکرێـت لێـی تێبگـەین. ئەمـەش هۆکـاری بـوون و بڵاوکردنـەوەو گەیانـدنێتی بـەوانی دیکە. لێرەوە دەتوانین لە هەر کارێکی داهێنەرانەدا دوو رەهەند جیابکەینـەوە: رەهەنـدێکی کۆمەڵایـەتی (واقیعی تێداژیاو) و رەهەندی تاکەکەسی (خودێتی داهێنەر). واتە هەر داهێنانێك لەسەر پەیوەندییەکی ئۆرگـانیکی رادەوەسـتێ کـە نێـرەرو وەرگـر پێکـەوە کۆدەکاتـەوە، ئـەو پەیوەندییـەش دەربـڕی ئاسـۆی هاوبەشـەو کۆشـشـدەکات بـۆ دۆزینـەوەی تێڕوانینێکـی گشـتی سـەبارەت بـە مەسـەلەیەك کـە پەیوەندیی بە داهێنەرو جەماوەرەکەیەوە هەیە.

جەختکرنـە سـەر لایـەنی کۆمەڵایـەتی لـە پرۆسێسـێکی داهێنانـدا مانـای کەمکردنـەوەی بایـەخی سروشـتی تاکەکەسـیی داهێنـان و تاکەکەسیبوونی بیکردنەوەی هونەری نییە، چونکە

داهێنەر خاوەن خودێتی خۆیەتی کە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیدا دەکەوێتە کارلێککردنەوەو ئیمپرێشن و هەست و دیتنەکان دەخاتەڕوو و بەشێوەیەکی جیاکارە دەریاندەبڕێت، ئەمەش لەڕێگەی هەڵبژاردنی بابەتی داهێنانەکەو وردەکارییەکانی و شێوەی هونەریی گونجاوەوەو بە یارمەتی خەیاڵی هونەریی داهێنەرو سەلیقەو وزە دەروونیەکانیەوە. ئەگەرچی لایەنی تاکەکەسیی پڕۆسێسی داهێنان مانای ئەوەنییە کە داهێنان تەنیا پشت بە لایەنی خۆیی دەبەستێ. ئەمەش ئەوە لێکدەداتەوە کە بۆچی ئەو لێکۆڵینەوانەی تەنیا پشت بە دەرهاویشتە دەروونیەکان دەبەستن، پەککەوتەن لەئاست بایەخدان بەهەموو ڕەهەندەکانی پڕۆسێسی داهێناندا. ئەمەش گرنگیی دەرهاویشتە سۆسیۆلۆژییەکان بۆ شیکردنەوەی سروشتی داهێنان دەخاتەڕوو. داهێنەر کاریگەریی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی لەسەرە کە تیایدا دەژی، ئەمەش نەك تەنیا لە ڕێگەی کاریگەریی دوولایەنی نێوان مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکەیەوە بەتەنیا، بەڵکو بەهۆی بەدەستهێنانی دیتنی ئەو کۆمەڵە کە بەشێکی پێکدێنێ، بەڵام داهێنەر تەنیا بە ئەنجامدراوو ئەوەوە ناوەستێ کە هەیە، چونکە سەرلەنوێ ئەو دیتنانە بەرهەمدێنێتەوەو پاش ئەوەی لە پۆخڵەواتەکان ئایدیۆلۆژیای توێژو چینە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەی پاکدەکاتەوە، هەوڵدەدات بیگەیەنێتە ئاستێکی بەرزی یەکبوون و هاوشێوەیی. واتە خواستی داهێنەر ئەوەیە هۆشیاریی ئەو توێژەی ئینتیمای بۆی هەیە لە دۆخی هۆشیاریی بەکردەوەوە (دۆخی باو) بگوێزێتەوە بۆ دۆخی هۆشمەندیی شیاو کە دەربڕی داهاتوخوازترین و پێشکەوتووترین بیروڕاو تێڕوانینەکانە. واتا ئەو لە هۆشیاریی بەکردەوەوە هەنگاوهەڵدێنێ بۆ ئەوەی ڕووەو هۆشیارییەکی هەمەلایەنتر ڕەتیبکات، ئەویش هۆشیاریی شیاوە.

ئێستا دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە سەبارەت بە فرمانە کۆمەڵایەتیەکانی داهێنان ورووژاندمان، ئەویش بەم شێوەیە: دەربڕینی واقیع (ڕاڤەکردنی واقیع) و داوەریکردنی پشتئەستوور بە پێداویستییەکانی مرۆڤو ئەو ئەرکانەی کۆمەڵگە یاخود یەکێك لە چینە بنچینەییەکانی لە یەکێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا دەیانخاتەڕوو.

بەم واتایە داهێنان ئەرك و فرمانەکانی خۆی جێبەجێدەکات، ئەمەش بە ڕادەی بەجێگەیاندنی ئەو قورساییەی لە ڕوی جوانکاری و مەعریفی و پەروەردەییەوە دەکەوێتە ئەستۆی، واتە بەڕادەی تەییارکردنی وەرگر بە ئەزموون و مەعریفەو ئاڕاستەکردن[18]، چونکە داهێنانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دەرفەتی خۆدەربڕینی داهێنەرانە دەڕەخسێنێ، ئەمەش لە ڕێگەی ڕەتکردنی هەرشتێك کە ئاستەنگ بێت لەبەردەم کرانەوەی تواناکانیان و پێگەیاندنی بەهەرەکانیان، وەك شێوەکانی نامۆبوون و چەوساندنەوەو دەسەڵاتخوازیی جۆربەجۆر، واشیان لێدەکات لە ژینگەیەکی ژیوارییی وەهادا بێنە قسەو خۆیان دەربڕن کە ڕێزی جیاوازییەکان دەگرێت و هانی فرەڕەنگی دەدات و دەرفەت بۆ دامەزراندنی دۆخێکی مەعریفی و جوانکاریی– دوایش مرۆڤانەی– بەرزتر دەڕەخسێنێ.

لێرەدا ڕەوایە بپرسین: ئەو ئاستەنگانە چین کە ڕێگرن لەوەی داهێنان بگاتە ئامانجەکانی خۆی و لە ئاستێکی بوونی تاکەکەسییەوە بچێتە ئاستی بوونێکی کۆمەڵایەتی کارامەوە؟

ئەو ئاستەنگانە زۆرن کە ڕێگرن لەوەی داهێنان خولی خۆی تەواوبکات و فرمانە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی جێبەجێبکات، واتە ڕێگرن لەوەی بگاتە وەرگرو کاریگەریی بخاتە سەرو هانیبدات بۆ بەشداریکردنی چالاکانە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. لەوانەیە بەربڵاویی نەخوێندەواری بەهەردوو

جۆرەکەیەوە: ئەلفابێیی و کولتووری، یەکەمین ڕێگربێت لەبەردەم ئەوەی داهێنان بگاتە ئامانجەکانی خۆی. لە کاتێکدا کێشەی کتێب و تابلۆو پارچە مۆسیقا (هەڵگرەکانی داهێنانەکان) و سنووردارێی بڵاوبوونەوەو گەیشتنیان بە خەڵك، بەهۆی ئاستەنگە ئابووری و سیاسی و ژیوارییەکانەوە، کێشەیەکی کەم بایەخترە لەوەی پێشوو. هەروەها ئەو کارانەی بانگەشەی داهێنان دەکەن و لە ڕوی شێوەو ناوەڕۆکەوە خراپ و هەژارن و لەسەر حسابی ئەقڵی خەڵك ختوکەی غەریزەکان و هەستوسۆزیان دەدەن، ئەڵتەرناتیڤێکی ئاسانە بۆ شێواندنی چێژی وەرگرەکان، چونکە لە ئاستی پێداویستییە سەرەتاییەکاندا ئاخاوتنیان لەگەڵ دەکات و بەشداری ناکات لە پێگەیاندن و پەرەپێدانی بایەخ و ئاسۆکانیان. ئەمەش لاوازیی گەشەکردنی ژیواری کۆمەڵگەکەمان و باڵادەستیی ئەو بنەما کۆمەڵایەتیە تەقلیدییانە دەچەسپێنێ کە پشتئەستوورن بە خێزانخوازی و عەشایەرییەت و تایەفەگەری و دژی دۆخی کۆمەڵگەی شارستانیی گەشەکردون، ئەو کۆمەڵگەیەی مرۆڤ دەتوانێت تیایدا پەیوەندی و گرێبەست و ئینتیمائەکانی خۆی بەشێوەیەکی ئازادانە دروستبکات و دەربڕێت و هەست بەبوونی خۆی بکات، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو دەرفەتە خۆویستانەوە نەك بەهۆی ئینتیمائە تەقلیدییە سەپێنراوەکانەوە.

پێویستە دەق/داهێنان، کە مەبەستێتی ئامانجەکانی خۆی بهێنێتەدی، ئەو تەلقینادانە ناکامە ڕەتبکات کە گرنگیی ناوەڕۆك زاڵدەکات بەسەر شێوەدا، چونکە داهێنان کارێکی ڕیکلامخوازانە نییە، جا ئەو دروشمانەی بەرزیاندەکاتەوە چەند شۆڕشگێڕانەو بریقەداربن. هەروەها ڕازاندنەوەیەکی هونەری یاخود کارێکی جوانکاریی ڕووت نییە کە خودێتی داهێنەر تیایدا بەشێوەیەك قەبەبکرێت کە بگاتە سنووری نەرجسیبوون. باڵەفڕەش نییە بە ئاسمانی ڕووتکاری و ڕەهاخوازیداو لەسەر حسابی واقعی و مێژوویی و تیاداژیاو.

پشتئەستوور بەو دابینکارییانەی پێشوو هەوڵدەدەین باسی چۆنێتی چارەسەرکردنی داهێنانەکانی خۆمان بۆ ئەو ئیشکالیەتە بکەین. لێرەشدا بەخێرایی هێما بۆ بواری ڕۆمانی هاوچەرخی عەرەب دەکەین، بەوپێیەی تاڕادەیەك بوارێکی داهێنانی نوێ و زۆر بەپیت و هەمەڕەنگەو لەبەر گرنگیی جیاکارەی ڕۆمان و تواناکانی بۆ دەربڕینی واقیعی کۆمەڵایەتی لەم ماوەیەی گەشەکردنی کۆمەڵگەی عەرەبدا (**کارە ئەدەبی و هونەرییەکان دەتوانن لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی هەمەلایەندا قوڵترو وردکارانەتر باسی ڕەهەندەکان و وردەکارییەکانی واقعی مرۆڤانە بکەن. بۆیە حەلیم بەرەکات پێیوایە دەتوانین "لە ڕێگەی ڕۆمانەوە زیاتر لە تێکڕای لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانی لەبارەی میسرەوە ئەنجامدراون لە واقعی کۆمەڵگەی میسر بگەین"**(19).

ڕۆمانەکانی عەرەب(بەتایبەتی ئەوانەی ئاڕاستەیەکی ڕەخنەگرانەی واقعیان هەیە) ڕواڵەتی نیمچە کاملی ژیانی عەرەبی هاوچەرخیان دەربڕیوەو ئاقارێکی داهێنەرانەی فرەسەرچاوەیان پێکهێناوە کە چەندین ئەزموونیان لەئامێزگرتوەو خاڵی هاوبەشیان دەربڕینی واقیع و ئاشکراکردنی ناکۆکییەکانی و بەشداریکردنە لە نووسینی مێژووی کۆمەڵایەتیدا. بۆ ئەمەش سوودیان لەو بوژاندنەوەیە وەرگرتوە کە ژانەری ئەدەبی لە ڕوی کەرەستە هونەرییەکان و تەکنیکەکانی گێڕانەوەی ڕۆمانئاسا بەخۆیانەوە دیوەو ئەو گەشەپێدانەی زانستە مرۆڤایەتیەکان و زمانزانی و ئاقارەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و سۆسیۆلۆژیای ئەدەب لەم بوارەدا هێناویانەتەدی.

ئەو کارە داهێنەرانەی عەرەب لە بواری ڕۆماندا کەم نین کە توانیویانە ئەرکەکانی پڕۆسێسی داهێنان جێبەجێبکەن‌و ئەوەی سوودبەخش‌و جوانە بەشێوەی دەقی ئەدەبی خاوەن تایبەتمەندی‌و دانسقە لەلایەك‌و هەڵگری تێڕوانینێك بۆ دنیا پێشکەشبکەن، جا ئەوانە لە واقیعدا هەبن یاخود بەڕێوەبن بۆ ئەوەی ببن. ئەوەش لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە لەگەڵ ئەو هێزانەی گۆڕانکاری‌و داهاتوو دروستدەکەن، واتە لە بزووتنەوەی نەشونماکردنی کۆمەڵایەتی مێژووییدا. لەم بوارەدا ئەوە بەسە بەرهەمەکانی ڕومانووسەکانی عەرەب وەبیربهێنینەوە، وەك: ئەلتەیب سالْح، نەجیب مەحفوز، عەبدولڕەحمان مونیف، حەنە مینە، حەلیم بەرەکات، حەیدەر حەیدەر، ئەلتاهر وەتار، ئەمیل حەبیبی، یوسف ئیدریس‌و ئەوانی تر. لێرەشدا بەڕادەی نزیککەوتنەوەی کارەکانی ئەو داهێنەرانە لە پرسیارە مەزنەکان سەبارەت بە مرۆڤو سەردەم‌و ژیانی کۆمەڵایەتی (لە ڕێگەی گەیشتنە توێژی فراوانی کۆمەڵگەو ڕەتکردنی پەیوەندیی بەرهەمهێن–بەرخۆر بۆ داهێنەر– وەرگرەوە) لە گۆڕانکارییەکاندا بەشداریانکردوەو هۆشیاریی کۆمەڵایەتی توێژو توێژاڵی زیاتری وەرگریان دەوڵەمەندکردوە. ئەو وەرگرانەی زەمینەی پێویستی بەردەوامبوون‌و پەرەسەندنی پڕۆسێسی کۆمەڵایەتی پێکدێنن، ئەمەش پشتئەستوور بە سروشتی کەڵەکەکردەیی مێژوویی پڕۆسێسی کاری داهێنان.

لەوانەی پێشەوە دەردەکەوێت کە وەرگرتنی نەرێی سادە ڕەتدەکەینەوە، چونکە هیچ بەشداریکردنێکی بەرچاو پێشکەش ناکات، بەڵام بایەخی زۆر دەدەینە ئەو توێژە وەرگرە بایەخدارەی توانای شیکردنەوەو تێگەیشتنی فرەئاستی دەقی داهێنانەرانەو گرێدانەوەیان بە چوارچێوەی گشتییەوە هەیە، جا ئەوانە خوێنەربن یاخود ڕەخنەگر. ئەمەش زۆربەی ئەو ڕۆشنبیرانە دەگرێتەوە کە هۆشمەندی‌و کاری خۆیان ئاڕاستەی شیکردنەوەو تێگەیشتنی واقیع دەکەن‌و بەشداریشدەکەن لە گۆڕینیدا. ئەمانەش ئەو کەسانەن کە گۆڵدمان باسیاندەکات: "لەنێو گرووپە کۆمەڵایەتیەکاندا کە کۆمەڵگە بەگشتی پێکدێنن توێژێك هەیە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕن لە گەشەکردنی مێژووییداو ڕۆڵێکی بڕیاردەر دەبینن لە داهێنانی کولتووریدا"[20].

بەم واتایە، کاری داهێنان لەلایەن دەستەبژێرەوە قۆرخ ناکرێت، جا ئەو دەستەبژێرە هەر خەسڵەتێکی هەبێت، هەروەها بەرهەمی دەستی تاکەکەسێکی دابڕاو نییە لە کێشەکانی کۆمەڵگەو پرسیارەکانی ژیان، بەڵکو بەری کاری ڕۆشنبیری ئۆرگانیکییە (بەواتا گرامشییەکەی) کە سروشتی کۆمەڵگەیی‌و چالاکی‌و بەهانەی بوون دەبەخشێتە داهێنان.

لە کۆتاییدا دەپرسین: ئایا سۆسیۆلۆژیای دیالەکتیکی دەستبڵاوە لە خواستەکانیدا بۆ دامەزراندنی بارێکی داهێنانی گشتی/بەکۆمەڵ کە بەهۆیەوە وەرگر بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاستێکی مەعریفی‌و جوانکاریی بالاترو وای لێدەکات بەشداربێت لە گەشەپێدانی پڕۆسێسی داهێناندا؟

هەوڵدانەکانی سۆسیۆلۆژیا بۆ دۆزینەوەی هۆشیارییەکی شیاو لەو کۆمەڵگەیەدا کە لێیدەکۆڵێتەوەو ئەو ئاقارە ماتانەی لە پێگەیشتندان‌و ئامانجیانە لە ڕێگەی گەڕان بەدوای شیانەکانی گۆڕینی هۆشیاری‌و واقیعی کۆمەڵایەتیدا ئەو کۆمەڵگەیە ڕەتبکەن‌و جێیبهێڵن پشت بە بیرۆکەیەکی ناوەکی دەبەستن، ئەویش ئەوەیە کە ئەو خەڵکە/ وەرگرانەی توانای قبوڵکردن‌و ڕەتکردنەوەو مافی ڕیککەوتن‌و جیاوازیان هەیە، لە ڕێگەی دیالۆگ‌و دۆزینەوەوە

بابەتەکانی داهێنان دەگۆڕن و لە کاری داهێنەرانەی شاراوەوە دەیانگوێزنەوە بۆ هێزێکی کاریگەر لەسەر ڕێڕەوی ژیانی کۆمەڵایەتی. لێرەوە جەماوەریبوون و بڵاوبوونەوەی ئەم یان ئەو داهێنانە تەنیا بەهۆی بەپیرەوەچوونی هەڵناسەنگێنرێ، بەڵکو جەماوەریبوونی کاری داهێنەرانە لە توانایدایە بۆ چڕکردنەوەی ئەو خەسڵەتە چۆنایەتیانەی پێشکەش بە خەڵکیان دەکات. ئەمەش وا لە وەرگر دەکات لە ڕێگەی داڕشتنی هۆشیاری و دیتنێکەوە، کە توانای یەکخستنی وەرگری بەرجەستەکراوو وەرگر وەك کیانێکی چۆنایەتی و نموونەیی هەیە، بتوانێت نیشانە جەوهەرییەکانی سەردەمەکەی بەدەستبهێنێ. بەوەش بەرهەمی داهێنەر بەکردەوە بگۆڕی وەرگرو واقیع دەبێت لە یەك کاتدا، ئەمەش بەڕادەی بەشداریکردنی بەکردەوەی لە بەرزکردنەوەی ئاستی جوانکاری و مەعریفی و ئایدیۆلۆژیی وەرگردا. بەپێی ئەم تێگەیشتنە خواستی سۆسیۆلۆژیای دیالەکتیکیانە ڕەوایە، ئەگەرچی گیروگرفتی زۆر ڕێگەی لێدەگرن. گۆڵدمان وتەنی: "مرۆڤ مەزنترە لەوەی هەیە، چونکە بەردەوام خۆی دروستدەکات و جیهانێکی نوێ دێنێتەئاراوە"(21).

## پەراوێزو سەرچاوەکان

1. اليافي، نعيم: القارىء والنص، المعرفة السورية، العدد 294/ آب 1986، ص44.
2. مرعي، فؤاد، في العلاقة بين المبدع والنص والمتلقي، الطريق، العدد السادس، كانون الأول 1989، ص 134.
3. المرجع السابق، ص134.
4. المرجع السابق، 138.
5. المرجع السابق، 142.
6. شحيّد، جمال: في البنيوية التركيبية، دراسة في منهج لوسيان غولدمان، دار ابن رشد، بيروت 1982، ص 126.
7. اليافي، نعيم: القارىء والنص، المعرفة السورية، العدد 294/ آب 1986، ص56.
8. لبيب، الطاهر: سوسيولوجيا الثقافة، ط3، دار الحوار، اللاذقية 1987، ص49.
9. لبيب، الطاهر: المرجع السابق، ص51.
10. لبيب، الطاهر: المرجع السابق، ص53.
11. بوعلي، عبدالرحمن: البنى الأدبية و بنية الوقع والظاهرة الروائية. مجلة الوحدة، العدد 34، ايلول 1983، ص33.
12. المرجع السابق، ص33.
13. شحيّد، جمال: في البنيوية التركيبية، دراسة في منهج لوسيان غولدمان، دار ابن رشد، بيروت 1982، ص 104.
14. سليمان، نبيل: اسئلة الواقعية والالتزام، دار الحوار، اللاذقية 1985، ص49.
15. شحيّد، جمال: في البنيوية التركيبية، ص46.
16. المرجع السابق ص168.
17. المرجع السابق ص29.
18. عيد، عبدالرزاق: الثقافي والجمالي والايديولوجي، اللاذقية 1988، ص105.
19. بركات، حليم: المجتمع العربي المعاصر (بحث استطلاعي ميداني)، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت 1984، ص359.
20. شحيّد، جمال: في البنيوية التركيبية، مرجع سابق، ص114.
21. غولدمان، لوسيان: تمرد الاداب والفنون في الحضارة الغربية، دراسات عربية، العدد11، ايلول 1981، ص102.

## سەرچاوە

مجلة "الوحدة"، المجلس القومي للثقافة العربية، رباط/ المملكة المغربية،
العدد 83/82 تموز/ آب 1991، ص (119-126)

# گفتوگۆ لەگەڵ د. محەمەد ئارکۆن

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

لە مانگی نیسانی ساڵی 2002دا محەمەد ئارکۆن سەردانی زانکۆی (بلمند)ی لوبنانی کرد و لەوێدا چەندین لێکۆڵینەوەی لە چەند لێکچەرێکدا پێشکەش کرد و دواتر گفتوگۆیەکی گەرم لە نێوان ئارکۆن و ئامادەبوواندا دروست بوو لە بارەی ئیپستیمۆلۆژیا و میتۆدە زانستییەکان و رەخنە لە عەقڵی ئیسلامی. ئارکۆن لە بەشێکی قسەکانیدا گلەیی لە عەرەب هەبوو کە لە دوای نووسین و بڵاوکردنەوەی دەیان وتار و وەرگێڕانی پتر لە دە کتێب لە لایەن هاشم ساڵحەوە، کەچی هێشتا بە ئەندازەیەکی باش ناخوێنرێتەوە و لە گرنگیی میتۆد و بابەتەکانی ئارکۆن بێئاگان. بەم بۆنەیەوە وسام سعادە لە زانکۆی بلمندی لوبنانیدا ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا سازکردووە لە بارەی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و زمان و کولتووری عەلمانییەت، هەروەها لە بارەی لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیی ئیسلام و کاریگەریەکانی 11ی سێپتێمبەرو گەلێ بابەتی تر.

**+سەردانیت بۆ لوبنان دەرفەتێکی باشە بۆ ئەوەی زیاتر لە مەسەلەی تایفەگەری نزیك بینەوە بەو شێوەیەی لە پەیوەندیی سیاسەت بە ئایینییەوە دەخرێتە ڕوو، یان پەیوەندیی جیاوازیی کولتووری بە فۆرمی دەوڵەتەوە و سروشتی ململانێ لەگەڵیدا. دوێنێ لە پەراوێزی کۆڕەکەتدا لە بلمند باسی تایفەت کرد وەك ئەوەی بریتییە لە "یادەوەریی کۆ"، هەروەها باسی گرنگیی فرە دیالێکتت کرد بە گوێرەی تایفەکان. بە پێی چ میتۆدێك و لەکام گۆشە نیگاوە دەشێت لە مەسەلەی تایفەگەری بکۆڵینەوە بە تایبەتی لە وڵاتێکی فرە تایەفیی وەکو لوبنان؟ ئاخۆ پتر بایەخ بە میتۆدی ئەنترۆپۆلۆژی بدرێ یان مێژوویی؟ میتۆدی ڕۆشنبیری یان سیاسی؟**

–دیاردەی تایفەگەری لە لوبناندا دیاردەیەکی زۆر کۆنە. چەمکی تایفەش کۆمەڵێ رەهەندی سیاسی و مێژوویی ئاڵۆزی وەرگرتووە بە هۆی دێرینیی تایفە جیاجیاکان لەم وڵاتەو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی گشتی. جا لەبەرئەوەی ئەم تایفانە بە تایبەتی لە لوبنان و لەسەروبەندی شەڕی ناوخۆدا کەوتنە وێزەی یەکتر، دەبینین رەهەندێکی سیاسی وەرگرت و لە رەهەندە رۆشنبیری و

ئاینییەکەی دوورکەوتەوە، واتە ئەو رەهەندانەی پەیوەستن بە عیبادەت و ئەو بیروباوەڕانەی کە لە نیازە سیاسییەکان جیا دەکرێنەوە. بێگومان ئەمە لە هەموو کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامییەکاندا روویدا بەڵام بەشێوەیەکی تایبەتی لوبنانی گرتەوە لەبەرچەند هۆیەك لوبنانییەکان دەیزانن.

ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ رەهەندە رۆشنبیری و ئاینییەکانی ئەو شتەی پێیدەوترێ تایفەکان، لەبەرئەوە من لێرەدا چەمکێکی دیکەی سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی بەکاردەهێنم، ئەویش چەمکی (یادوەریی کۆ)یە. یادوەریی ئەو مەبەستە سیاسییەی نییە کە لە واژەی تایفەدا هەیە، لەبەرئەوە بە گۆڕینی ناولێنانەکە دەگوازینەوە بۆ سەر کۆمەڵێ شتی گرنگ و لە بایەخپێدان و توێژینەوەکانماندا پتر تەرکیز دەکەینە سەر ئەو ناوەڕۆکە کولتوری و هیومانیستیانەی کە یادەوەری پارێزگارییان لێدەکات سا یادوەریی کەسایەتی بێت یان یادوەری کۆ، لێرەوە بایەخمان دەخەینە سەر رەهەند و پەیوەستە کۆمەڵایەتییەکان، ئەم پەیوەستانە یان ئەم پەیوەندییانە ناوەڕۆکێکی کولتووری و زمانەوانییان هەیە و بەندن بە داب ونەریتەکان، هەروەکو ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانە ناوەڕۆکێکی وەهایان هەیە بەندە بەو رووداوە مێژووییانەی گروپە کۆمەڵایەتییەکان تیایدا ژیاون، لەبەرئەوە دەبێ بە دوای ئەو رووداوە مێژووییانەدا بگەڕێین کە یادوەرییان پێکهێناوە و پرسیاری ئەوە بکەین بە چ شێوەیەك (یادوەریی کۆ) لە ڕووی مێژووییەوە دروست دەبێت؟ بێگومان لە ڕێگەی ئەو رووداوە گرنگانەوە دروست دەبێت کە لە هەمان کاتدا پارێزگاریشی لێدەکات، بەڵام لێرەدا رووداوگەلێك هەن تەنانەت یادوەریش لە بیریان دەکات، ئیدی مێژوونووس گرنگی بەو شتانە دەدات کە لە بیرکراون هەروەکو بایەخ بەو شتانەش دەدات کە یادوەری پاراستوونی.

لێرەدا رەهەندێکی دیکەش هەیە، ئەویش: گەڕان بەشوێن ناوەڕۆکەکانی یادوەریدا پشت بەو دیالێکتە دەبەستێت کە ئەندامانی گروپێك بەکاریدەهێنن و مومکین نییە پشت بەو شتانە ببەسترێت کە لە بارەی یادوەرییەوە نوسراون. ئەوەی زانا و توێژەران لە بارەی یادوەرییەوە دەینووسن: بابەتی‌نووسراو دەکەن بە سەرچاوە نەك بابەتی زارەکیی ڕۆژانەیی، لە کاتێکدا دەبینین "زارەکیی ڕۆژانەیی" کۆمەڵێ واژەی وەهای هەڵگرتووە کە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ مێژووی "یادوەریی کۆ"ی راستەقینە. ئەمە مەسەلەیەکە لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا بایەخمان پێنەداوە بەهۆی ئەو جیاوازی و لێکترازان و ئەو دابڕانەی لە نێوان زمانی نووسراو و زمانی زارەکیدا هەیە.

ئێمە زمانی زارەکیمان فەرامۆش کرد چونکە بایەخمان بەو زانستە نەداوە کە لە "یادوەریی زارەکی" دەکۆڵێتەوە، ئەم زانستە دوو ناوی هەیە: زانستی ئیتنۆگرافیا کە بایەخ بە وردو درشتی هەموو دیاردەکانی ژیانی رۆژانەی گروپێك دەدات، بایەخ بە دابونەریت و بیروباوەڕ و سرووتە کۆنەکان دەدات ئەوانەی بەر لە ئیسلام و بەر لە مەسیحییەتیش پرۆسە دەکران. ئەمە رەهەندێکە لەبەر چەندین هۆی ئایینی فەرامۆشمان کردووە، چونکە بیروباوەڕی ئەرتۆدۆکسیی لە ئایینی مەسیحی یان لە ئایینی ئیسلامی یان لە هەر ئاینێکی تردا هەموو ئەو دابونەریت و بیرو باوەڕانە دادەپۆشن یان دەیسڕنەوە کە بەر لە مەسیحیەت یان بەر لە ئیسلام هەبوون. ئیتنۆگرافیست ئەو دابونەریتانە لە مێژووی دووری خۆیاندا ئاشکرا

دەکات، ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە چۆن هەموو یادوەرییەکی کۆ پێ لەسەر پاراستنی ئەو دابونەریت و بیروباوەڕانە دادەگرێت کە خۆی – واتە ئەو یادوەریی کۆیە – تیایدا دەژی و دەرکی پێدەکات ئەگەر چی وەك ئیسلامییەك یان وەك مەسیحییەك دەرکی پێدەکات، چونکە نەیتوانیوە گەڕانێکی ئارکیۆلۆژی بە نێو ئەو دابونەریت و باوەڕانەدا بکات کە بەر لە ئاینەکان هەبوون. هەنگاوی ئیتنۆگرافیا لە گەڕان بە دوای یادوەریی کۆدا، ئەنترۆپۆلۆژیا درێژەی پێدەدات و تەواوی دەکات، واتە گەڕانی ئەنترۆپۆلۆژیا بە دوای ئەو یادوەرییە کۆیە جیاوازانەدا کە لە جەستەی کۆمەڵگاکاندا نیشتەجێن، ئیدی تێدەگەین چۆن ئەم یادوەرییە کۆیانە لە مێژووی خۆیانداو لە ساتەوەختی ململانێکانی نێوانیاندا کارلێکیان لەگەڵ یەکتردا کردووە. ئەمە ڕێگەمان بۆ خۆش دەکات لەو شتانە ڕزگارمان بێت کە خەیاڵدانی کۆمەلایەتی لە ساتەوەختی ململانێی سیاسیدا وەریدەگرێت تا داکۆکی لە شوناسی هەر یادوەرییەك بکات بێئەوەی بایەخ بە گەڕانەوە بۆ ئەو ڕێسا کولتوری و تەقلیدییە بدات کە هەموو یادوەرییەکان تیایدا بەشدارن.

**+جیاوازیی دیالێکتەکان مەسەلەیەکی ئاڵۆزە، وەك چۆن دەبێ تێبینی فرە دیالێکت لە وڵاتێکی دیاریکراودا بکەین، دەبێ لە گۆشەی پلە جیاوازەکانی نێوان دیالێکتەکانی ئەم یان ئەو وڵات لە بابەتەکە نزیك ببینەوە. کاتێ تۆ لەباسەکەتدا لە بارەی تایفەگەری، لە دیالێکتەکان دەدوێیت، مەبەستتە بارودۆخی لوبنان لەگەڵ هەلومەرجی مەغریبی گەورەدا بەراورد بکەیت. ئایا ڕەگەزە هاوبەشەکانی نێوانیان چین و جیاوازییەکەش لە کوێدایە؟**

–بەڵێ ئەمە لە مەغریبی عەرەبیشدا بوونی هەیە. بۆ نموونە ئەو ململانێیەی لە مەغریب و جەزائیردا هەیە لە نێوان ئەو یادوەرییە کۆیانەی تا ئەمڕۆش بە دیالێکتی ئەمازیغی قسە دەکەن و هاوکات بە دیالێکتی عەرەبیش دەدوێن. ئەم یادوەرییە کۆیانە بەشداری لە دوو یادوەریدا دەکەن: یەکەم ئەو یادوەرییەی لەسەر زمان و کولتوری ئەمازیغی بنیات نراوە، دووەم ئەو یادوەرییەی دیالێکتی عەرەبی بەکاردەهێنێت. توێژینەوەی ئیتنۆگرافی و ئەنترۆپۆلۆژی ئەو دوو ئاستە لە یادوەرییە جیاوازەکانی مەغریبی گەورەدا ئاشکرا دەکات. ئێمە لە گوتاری نەتەوایەتیماندا – کە هەر لە سەردەمی شەڕی ڕزگاریخوازیی دژی داگیرکەرەوە بەسەرماندا زاڵە – هەموو ئەو شتانەمان فەرامۆش کردووە وەك بڵێی بوونیان نەبێت، بگرە ئەوەمان بەسەر یادوەرییە کۆیەکاندا سەپاندووە کە خۆیان لە یادوەرییە زیندەگییەکانیان جیابکەنەوە تا لەیەك یادوەریدا یەکبگرنەوە، ئەو تاکە یادوەرییەش لەسەر کۆمەڵێ دروشمی ئایدیۆلۆژی بنیات نراوە و لە ڕەگوڕیشەوە لەو شوناسە ترازاوە کە توێژینەوەی ئیتنۆگرافی و ئەنترۆپۆلۆژی لێیدەکۆڵێتەوە. ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە توێژینەوە زانستییەکانی کۆمەڵگا عەرەبییەکان بایەخێکی ئەوتۆیان بەو دوو زانستە نەداوەو هەروەها بایەخیان بە پراکتیکی دەرەنجامە زانستییەکانی ئەو دوو زانستەش نەداوە، واتە وانە وتنەوەیەکی سەرجەمگیر و گشتگیری کۆمەڵگا عەرەبییەکان بە پێی میتۆدی ئەنترۆپۆلۆژیای مێژوویی فەرامۆش کراوە.

ئەم کۆمەڵگایانە تا ئەمڕۆش ملکەچی دیاردەی نەخوێندەوارین، نەخوێندەواریش واتە ئافرەتان زمانێك بەکاردەهێنن دەلالەت لە شتی تایبەتی

خۆیان دەکات و ئەو دەلالەتانە لە زمانی پیاواندا نییە، چونکە کۆمەڵگاکانی ئێمە لەسەر جیاکردنەوەی یادوەریی ژن و یادوەریی پیاو دامەزراوە، ئەم جیاکردنەوە و لێکترازاندنەی نێوان یادوەریی ژن و یادوەریی پیاو بۆ ماوەی چەندین سەدە کاری کرۆدتە سەر چۆنیەتی پەروەردەکردنی کچان و پەروەردەکردنی کوڕان و.. بەردەوامیش کاری تێدەکات. لێرەدا چەندین گیروگرفت هەن پەیوەستن بە پەیوەندییە سێکسییەکانەوە و تا ئەمڕۆش چارەسەر نەکراون چونکە ئێمە بایەخمان بەم لایەنە گرنگانەی ژیانی کولتوری و فیکری و بێگومان سیاسیش نەداوە. ئێمە هەموو ئەم ئاستانە لەگەل یەکدی تێکەڵ دەکەین و دەیخەینە ناو یەك تاکە گوتاری گشتگیرەوە و ناوی دەنێین گوتاری نەتەوەیی کە ئەمەش لە ڕاستیدا کۆمەڵێ وەزیفەی ئایدیۆلۆژی جێبەجێ دەکات کە گروپی براوە و باڵا دەست بەسەر گروپەکانی دیکەدا دەیسەپێنێ هەر لەبەرئەوەی دەسەڵاتی مەرکەزیی گرتۆتە دەست.

**+گوتاری دەسەڵاتی ناوەندی کە بۆ دابینکردنی یەکانەگیی زمانەوانی تێدەکۆشێ، دەچێتە چ خانەیەکەوە، یان با بڵێین لە چ نەسکێك دادەنرێ؟ ئاخۆ لە نەسکی نائامادەیی بیرۆکەی لێبوردەیی لە عەقڵی ئیسلامی – بە تایبەتی لە پەیوەستیدا بە کێشەی زمان – دادەنرێ؟ یان لە نەسکی متمانەکردن بە نموونەی دەوڵەتی یەعقوبی؟**

–ئەم مەسەلەیە لە سەرجەمی کۆمەڵگاکاندا هەیە. بۆ نموونە کۆماری سێیەمی فەرەنسی پشتی بە گوتارێکی نەتەوەیی یەکگرتوو و سەرجەمگیر بەستبوو بۆ هەموو ئەو یادوەرییە کۆیە جیاوازانەی لە کۆمەڵگەی فەرەنسیدا نیشتەجێ ببوون و دیالێکتی جیاجیان بەکاردەهێنا (دەڵێم دیالێکتە جیاجیاکان چونکە نەنووسرابوونەوە) پاشان ئەم دیالێکتانە پەراوێزکران و بیرچوونەوە چونکە دەوڵەتی ناوەندیی یەعقوبی کۆمەڵێ بەرنامەی خوێندنی لە قوتابخانە گشتییەکاندا بەسەر هەموو هاووڵاتییانی فەرەنسەدا سەپاند، بۆ زانینت خوێندن لە وێدا بە زۆرە و بە خۆڕاییە و عەلمانیشە (بڕوانە خوێندنی بە زۆر و بە خۆڕایی و عەلمانی!). ئەم سێ مەرجەی کە حکومەتی ناوەندی دەیسەپاند، سەرکەوتوو بوو لە پێکهێنانی یەك یادوەریی یەکگرتوو، دەرەنجامی ئەمەش پێکهێنانی دەوڵەتی فەرەنسی و نەتەوەی فەرەنسی بوو، ئەو فەرەنسایەی ئەمڕۆ دەیبینین و ئەوەی کە نموونەیەکی سیاسی دیکەی بەلاوە نا، مەبەستم نموونەی سیاسی لە سویسرا کە نموونەیەکی فیدراڵییە.

کەواتە چەمکی "یادوەریی کۆ" چەندین ڕەهەندی هەیە کە دەشێت بیر لە پشت بەستن بە نموونەیەکی سیاسیی نامەرکەزی بکەینەوە، هەروەها پێویستبوونی ڕێزگرتن لەو بەهایانەی هەموو یادوەرییەك لە یادوەرییە کۆیەکان داوای دەکات و پارێزگاریشی لێدەکات. ئێمە دەتوانین سوودەکانی سیستمی فیدراڵی و سوودەکانی سیستمی ناوەندی پێکەوە کۆبکەینەوە تا هەر یادوەرییەك مافی خۆی وەربگرێ و هاوکات بتوانێت لەگەڵ یادوەرییەکانی تردا کارلێکێکی ئاشتیانە و لێبوردەییانە بکات.

***لە فەرەنسەدا قوتابخانەی گشتی، پرۆسەی یەکبوونی زمانی بەسەر هەمووان‌دا سەپاند. ڕەوتی نموونەی یەعقوبی لە گۆشەی سیاسەتی فێرکردن و تەعلیمیەوە بە چ شێوەیەك دەبێت؟ ئایا ئەم نموونە عەلمانییە کە هەر ناوەندێکی وەسیت لە نێوان تاکەکەس وەك هاووڵاتییەك و نێوان دەوڵەت وەك بوونەوەرێکی مەعنەویی گشتی ڕەتدەکاتەوە،**

**شکستی هێناوە؟ ئەمە دەڵێم و لە خەیاڵمدا لوبنانێکی تایەفی هەیە کە شوێن نموونەیەکی تر کەوتووە. دەستوری لوبنانی ئازادییەك بە تایفەکان دەبەخشێت تا قوتابخانەی تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن و پەروەردە و خوێندنی تایبەتی خۆیان پرۆسیسە بکەن، قوتابخانەی رەسمیش لە ڕووی مێژووییەوە وەك ئاوارتەیەك هەبووە. ئێمە لێرەدا لەبەردەم نموونەیەکداین لە مەسەلەی فێرکردن و پەروەردەدا لە عەدالەت و دیموکراسیەت دوور دەکەوێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەڵوێستێکی لێبوردەتر و فرەیی تری لە مەسەلەی جیاوازیی کولتوریدا هەیە.**

–ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندیی بەو شتەوە هەیە کە پێیدەڵێین ڕۆشنبیریی عەلمانییەت یان عەلمانیکردن، ئەم عەلمانییەتە دژی ئایینەکان نییە و بیروباوەڕە ئاینییەکانیش رەت ناکاتەوە وەك هەندێ کەس لەو باوەڕەدان. بگرە بە پێچەوانەی ئەمەوە هەڵوێستی عەلمانیانە لەسەر ڕێزگرتنی سەرجەم یادوەرییە کۆیەکان و بیروباوەڕە ئاینییەکانیان دامەزراوە، دەوڵەتیش (واتە دەوڵەتی عەلمانی) پارێزگاری لە هەموو یادوەرییە نیشتەجێکان دەکات، بەڵام هاوکات پێ لەسەر پێویستبوونی خوێندنی مێژوو دادەگرێت لە تەك خوێندنی رەهەندە ئەنترۆپۆلۆژییەکانی کولتوورەکان لە هەر کۆمەڵگایەکدا تا رەگەز و توخمە نیشتەجێکان بتوانن دەرك بەو ڕێسا ڕۆشنبیرییە هاوبەشەی سەرجەمی گروپەکانی ناو کۆمەڵگا بکەن.

لێرەدا بەرنامەی خوێندن و وانە وتنەوەی ئایینەکان هەیە و دەشێت یادوەرییە کۆیەکان پارێزگاری لە بەهای ئایینی و نەریتەکانیان بکەن و هاوکات دەرك بەوە بکەن کە هەموو ئەو بەهاو بیروباوەڕانە بنکەیەکی ئەنترۆپۆلۆژیی هاوبەشیان هەیە. بەڵام ئێمە تا ئەمڕۆش بیرمان لەو پرۆگرام و بەرنامە زانستییانە نەکردۆتەوە کە دەبێت لە سیستمە پەروەردەییەکان و لە قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و لە زانکۆکاندا پراکتیك بکرێن، مومکین نییە دەرك بەو شتانە بکەین ئەو کاتە نەبێ کە لە زانکۆکاندا بایەخ و گرنگی بە لێکۆڵینەوە مێژووییە ئەنترۆپۆلۆژییەکان بدەین و هانی ئەو جۆرە توێژینەوە مێژوویانە بدەین، تا زانکۆکان ئەو مامۆستایانە بەرهەم بهێنن کە دەتوانن ئەو زانیارییانە بگەیەنن و خەیاڵ و زەینی نەوەکان لەسەر تێڕوانینێکی سەرجەمگیر و لێبوردە و ئازاد بەرامبەر بە هەموو بەها ئەخلاقی و ئایینی و فیکرییەکان پەروەردە بکەن.

ئەمە چارەسەرێکی ئەنترۆپۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی و زمانەوانی و مێژوویی و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییە بۆ هەموو ئەو لەمپەر و بەربەستە زیهنییانەی تا ئەمڕۆش زیاد دەکەن و کەڵەکە دەبن بەهۆی هەژمونی ئەو دروشمە ئایدیۆلۆژییانەی خەیاڵدانە کۆمەڵایەتییە دژ بەیەکەکان متوربە دەکەن و یادوەرییە کۆیە زیندووەکانیش لاواز و پەراوێز دەکەن، بەداخەوە ئەمە لە دوای تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهانییەوە لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا ڕوویداوە.

***پێداگرتنی تۆ لەسەر ئەنترۆپۆلۆژیا زیاد لە پرسیارێك دەهێنێتە پێش. ئایا تۆ مەبەستت لەکام ئەنترۆپۆلۆژیایە؟ ئەو ئەنترۆپۆلۆژیایەی لە مانا کۆنەکەیدا بەندە بە کایەی فەلسەفەوە؟ ئایا سروشتی پەیوەندی نێوان ئەنترۆپۆلۆژیا و زانستەکانی تر چییە؟ ئایا جۆرەکانی ئەنترۆپۆلۆژیا بوونە بە مەرجەعێکی زانستی و مەرجی هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تر؟**

–ئەنترۆپۆلۆژیا لەسەر هەموو ئەو زانستانە دامەزراوە کە بەزانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان ناوی دەبەین. مومکین نییە بتوانین توێژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژی ئەنجام بدەین تەنها ئەگەر سەرەتایەکی مێژوویی بۆ بکەینەوە مێژوویەك بە چەندین فەرهەنگ نووسرابێتەوە کە تایبەتن بە زانستە کۆمەڵایەتییەکان، واتە بە پشت بەستن بە سۆسیۆلۆژیای مێژوویی و سایکۆلۆژیای مێژوویی.

لە راستیدا ئەم زانستانە دەبنە مایەی راڤەکردنی ئەنترۆپۆلۆژیانەی کۆمەڵگا، لەبەرئەوە وتم مومکین نییە ئەنترۆپۆلۆژیا لە ئیتنۆگرافیای کولتورە جەماعییەکان قەتیس بکرێ، چونکە ئەگەر تەنها لەو ئیتنۆگرافیایەدا بمێنینەوە ئەوا کۆمەڵێ زانیاریی گرنگ کۆدەکەینەوە بەڵام دەرك بەو ڕێسا کولتوورییە هاوبەشەی ئەو توخمانە ناکەین کە لە کۆمەڵگادا نیشتەجێیە، هەروەها لەو ئاینانەی لە کۆمەڵگادا هەن. بۆ نموونە: ئیتنۆگرافیا لە حەرام و حەلاڵ دەکۆڵێتەوە لەلای گروپێك لە گروپەکانی کۆمەڵگا کە باوەڕیان بە ئاینێکی دیاریکراو هەیە، بەڵام ئەنترۆپۆلۆژیا لە حەرام و حەلاڵی گروپە جیاوازەکان دەکۆڵێتەوە کە باوەڕیان بە ئایینە جیاوازەکان هەیە، هەروەها ئەنترۆپۆلۆژیا پرسیار لەو پێوەرانە دەکات کە هەر گروپێك بەکاری دەهێنێت بۆ سەپاندنی ئەو شتانەی حەرامن و ئەوانەی حەلاڵن، واتە ئەو پێوەرانە چین وا لە گروپێك دەکەن هەندێ شت بە حەرام و هەندێ شتی تر بە حەلاڵ دابنێن. دیسان ئەنترۆپۆلۆژیا لە هەموو ئەو گروپانە دەکۆڵێتەوە کە بەهاکانی خۆیان لەسەر کۆمەڵێ چیرۆك و حیکایەت و نەریت دادەمەزرێنن، ئەمە توخمی هاوبەشی هەموو یادوەرییە کۆیەکانە سا هەر ئاینێکیان هەبێت.

نموونەیەك دەهێنمەوە تا خوێنەر لە مەبەستەکانی ئەنترۆپۆلۆژیا تێبگات. توێژەری ئەمریکی کلیفۆرد گیرتز لێکۆڵینەوەی لەسەر یادوەرییە کۆیەکان کرد لە ناوچەی جافای وڵاتی ئیندونیسیا و هەموو زانیارییە ئیتنۆگرافییەکانی کۆکردەوە کە تایبەت بوون بەو یادوەرییە کۆیانەی ئەو ناوچەیە. پاشان لە جافاوە گواستیەوە بۆ مەغریبی دوور و ئیدی لێرە میتۆدی ئەنترۆپۆلۆژی دەست پێدەکات. دوای ئەوەی کۆمەڵێ زانیاریی ئیتنۆگرافیی گرنگی تایبەت بەو یادوەرییانەی کۆکردەوە، گەڕایەوە بۆ بیرنستۆن و لەوێدا کتێبە ناودارەکەی نووسی. چۆن بە ڕێگەیەکی ئەنترۆپۆلۆژی لە ئیسلام بکۆڵینەوە؟ تۆ دەبێ بە باشی ئەم ڕستەیە بنووسیتەوە تا خەیاڵدانە کۆمەڵایەتییەکان لە دژی محەمەد ئارکۆن رانەپەڕن بە تایبەتی لە لوبنان چونکە دەشێ خوێندنەوەی بەدحاڵیبوون دروست بکات. من ناچمە ناو مەسەلە سیاسی و ئاینییەکانی سیستمی تایفی. من وەکو مێژوونووسێك و ئەنترۆپۆلۆژیستێك قسە دەکەم. پرسیاری سەرەکی لەلای من ئەمەیە: چۆن ئەمڕۆ لە ئیسلام تێبگەین، یان چۆن لە ڕووی ئەنترۆپۆلۆژی و مێژووییەوە لە ئیسلامی ئەمڕۆ بکۆڵینەوە.

***قەیرانی ئێمە بریتییە لە قەیرانی بەدینەهێنانی مۆدێرنە لە سەردەمی پۆست مۆدێرنەدا. سێ چرکەساتی گرنگ مۆدێرنەی خۆرئاوایان دروستکرد، هەریەکێ لەو چرکەساتانە شڵەژان و ململانێیەکی بەنێویەکدا چووی لەگەڵ چرکەساتەکەی تردا لەخۆگرتبوو. مەبەستم لەو سێ چرکەساتە: چەرخی ڕێنیسانس و بزاوتی ریفۆرمی ئایینی و چەرخی ڕۆشنگەرییە. کەچی ئێمە ماوەیەکی درێژ چاوەڕێمان کرد و هیچ یەکێ لەو چرکەساتانە نەهاتن. چاوەڕێی ریفۆرمی لۆسەری**

**بووین له ئیسلامدا بەڵام رووینەدا. لەبەرامبەر ئەمەدا ئێمە بووین بە دوو بەشەوە: بەشێکمان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کۆمەڵگا ئیسلامییەکان لە ڕێگەی "نوێکردنەوە"وە بچنە ناو مۆدێرنەوە. بەشێکی ترمان بانگەشەی مۆدێرنەیەکی تایبەتیی ئیسلامی دەکرد. لە هەردوو حاڵەتەکەدا وا دەردەکەوێ کە ریفۆرمی لۆسەریانەی ئیسلام هەرگیز نایەت و لەسەر ئەم بنچینەیە مامەڵە دەکرێت. ئایا "مۆدێرنەی ونبوو" ئەو وشە نائامادەیەیە کە تۆ باسی دەکەیت و ئەوەی پەیوەستە بە کۆمەڵگاکانی ئێمەوە؟**

-"وشەی نائامادە" لە خۆرئاواو لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکانیشدا ونە. ژمارەیەکی گەورەی موسڵمانان هەوڵدەدەن گرفتەکانی ئێمە لە ڕێگەی "بەئیسلامکردنی مۆدێرنە"وە چارەسەر بکەن، بەڵام بەشێکی تر دەیانەوێ ئیسلام نوێ بکەنەوە واتە "مۆدێرنیزەکردنی ئیسلام". هەردوو ئەم هەڵوێستەش رەواییەکی مێژوویی کولتووری و سایکۆلۆژییان هەیە، بەڵام دەبێ توێژەران بایەخ بە شیکردنەوەی رەخنەیی مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆژی و تیۆلۆژی و فەلسەفی و تەشریعی لە هەموو گوتارەکانی ئەو ڕەوتە بدەن و بە قووڵی لێی وردبنەوە چونکە ئێمە پێویستیمان بەسەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی فیکری ئیسلامی هەیە، هەروەکو مەسیحییەکان و یەهودییەکانیش پێویستیان بەسەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو هەیە، واتە جارێکی تر بیرکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەی بەندە بە مێژووی هەرسێ ئایینە ئاسمانییەکە. هیچ کەسێك بۆی نییە لە ڕووی زانستی و فیکرییەوە بانگەشەی "بەمەسیحیکردنی مۆدێرنە" یان "بەئیسلامکردنی مۆدێرنە" بکات بێئەوەی چەکدار بێت بە کەرەستەی زانستی و بەو چوارچێوە فیکرییەی کە زانا پسپۆڕەکان لە بواری ئەنترۆپۆلۆژیا و سۆسیۆلۆژیادا پرۆسە و پراکتیکی دەکەن. لێرەدا پێ لەسەر ئەوەش دادەگرم کە "وشەی نائامادە" لەو ژینگە ئەکادیمییانەشدا هەیە کە پشت بە مۆدێرنە دەبەستن بێئەوەی هەست بەوە بکەن کە لێرەدا مۆدێرنەی کلاسیکی هەیە و دەچێتە ناو مێژووی فیکرەوە، ئیتر ئەو جۆرە توێژینەوە و تەئویلانە بە کەڵکی ئەو بەرەنگارییانەی ئەمڕۆی ئێمە نایەن کە لە دوای جەنگی کەنداو و جەنگەکانی پاش 11ی سێپتێمبەر فشارێکی زۆرتری بۆ هێناوین.

مەبەستم لە "وشەی نائامادە" چییە؟ تەنها مەبەستم لە ڕوانینێکی سیاسییانەی نوێ نییە کە پتر بۆ چارەسەری کێشەکان بگونجێت، بەڵکو لەوەش زیاتر مەبەستم لەو شتانەیە کە لە فیکری هاوچەرخی خۆرئاواییدا مومکین نییە بیریان لێبکرێتەوە بەتایبەتی ئەو شتانەی پەیوەستن بە بیری تەشریعی و سیاسی و ئابووری و پەروەردەییەوە. لێرەدا فیکرێك نییە متمانەی پێ ببەخشین و پشتی پێ ببەستین بۆ ڕێنوێنی کردنی کار و بڕیارەکانمان و بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانمان. جا ئەگەر ئەمە لە فیکری هاوچەرخی خۆرئاواییدا وابێت ئیتر دەبێ چی لە بارەی ئەو دروشمە ئایدیۆلۆژییە ساختە و هەڵخەڵەتێنەرە بڵێین کە نەك تەنها عەقڵی ئەکتیڤ فریو دەدات بەڵکو یادوەریی کۆ و خەیاڵدانە کۆمەڵایەتییەکانیش فریو دەدات و لێکیان هەڵدەوەشێنێتەوە.

چەمکی "وشەی نائامادە" وەك بابەتێك بۆ توێژینەوە و بیرکردنەوە، خۆی بەسەر هەموو کولتورەکانی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان دەسەپێنێت. ئەگەر دانمان بەوەدا نا کە لە ئاستی سەرجەم

سیستمه سیاسییه‌كانی ئه‌مڕۆدا وشه‌ی نائاماده هه‌یه، هه‌روه‌ها له ئاستی سه‌رجه‌م ژینگه ئه‌كادیمی و زانستییه‌كاندا و له ئاستی هه‌موو ئه‌و چوار چێوانه‌ی پارێزگاریی له ئاینه‌كان ده‌كه‌ن و بانگه‌شه‌ی بۆ ده‌كه‌ن، ئه‌وسا ده‌شێت له چه‌ندین پرۆژه‌ی مێژوویییه‌وه ده‌ست پێبكه‌ین كه پشت به‌و شته ببه‌ستێت كه من ناوی ده‌نێم "ئه‌قڵی ئاینده‌یی" و ئه‌وه‌ی هێشتا دروست نه‌بووه.

***تۆ له زه‌مه‌نێكدا باسی "وشه‌ی نائاماده" ده‌كه‌یت كه له هه‌موو گوتار و ئه‌رگۆمێنتێكدا ته‌نها یه‌ك وشه بڵاوه، ئه‌ویش وشه‌ی "تیرۆر"ه. تۆ وه‌كو بیریار و توێژه‌رێكی "كۆچبه‌ر" چۆن مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ ئه‌م وشه ڕه‌واجپێده‌ره "واته: تیرۆر"دا ده‌كه‌یت؟**

–دیارده‌ی تیرۆر به‌نده به‌و ئاژاوه ده‌لالییه سه‌رجه‌مگیره‌ی له هه‌موو جیهاندا هه‌یه. بێگومان ئاژاوه‌ی ده‌لالی (یان فه‌وزای ده‌لالی) له خۆرئاواو له كۆمه‌ڵگا خۆرئاواییه‌كانیشدا هه‌یه، چونكه ئه‌و ئه‌قڵه‌ی له گوتاره هاوچه‌رخه‌كاندا ته‌وزیف ده‌كرێت خۆی له قه‌یرانێكی فیكریدایه، كه‌واته مومكین نییه ئاماژه بۆ چه‌ند به‌هایه‌ك بكات كه خۆی به‌سه‌ر ئاگایی هاوچه‌رخی به‌شه‌ریدا بسه‌پێنێت.

له‌پاش كۆتایی جه‌نگی سارد به‌ڵێنیان پێداین كه مرۆڤایه‌تی بچێته قۆناغێكی تره‌وه، واته سیستمێكی ڕه‌وای نێو ده‌وڵه‌تیی نوێ. له پاش ده ساڵ له جه‌نگی كه‌نداو چووینه نێو چه‌ندین جه‌نگی تره‌وه، ئێمه تا ئه‌مڕۆش بێبه‌شین له دادگایه‌كی نێو ده‌وڵه‌تی تا كێشه گه‌وره‌كانی بۆ به‌رز بكه‌ینه‌وه بۆ ڕاوه‌دونانی سته‌مكارانی سه‌رۆكی هه‌ندێ له ده‌وڵه‌تانی له شێوه‌ی میلۆسۆڤیچ. لێره‌دا چه‌ندین میلۆسۆڤیچی دیكه هه‌ن هێشتا ده‌ستیان واڵایه بۆ سته‌مكاری.

### سه‌رچاوه

له ئینته‌رنێته‌وه – هه‌فته‌نامه‌ی (السفیر) نیسانی 2002

# بەفەڕەنسی دەنووسم تا تێڕوانینی ئەوان سەبارەت بەخۆمان راستکەمەوە

**ئەمین مەعلووف**

لە عەرەبییەوە: شیرین. ك

ئەمین مەعلووف، نوسەرێکی لوبنانییەو لە پاریس دەژی، چەندین رۆمانی بە زمانی فەرەنسی بڵاوکردۆتەوە کە هەندێکیان خەڵاتی ئەدەبی بەرزیان وەرگرتووە و هەمووشیان بۆزیاتر لە سی زمانی جیهانی وەرگێڕدراونو لە کاتی دەرچوونو بڵاوبوونەوەیاندا بوونەتە رووداوێکی ئەدەبیو رووناکبیری، نەك بەتەنیا لەبەر ئەو چێژە ئەدەبییەی دەیداتە خوێنەرو حیکایەتەکانی هەزارو یەك شەوەی بیر دەخاتەوە ئەو حیکایەتانەی باو باپیرانی مەعلووف نوسیویانە، بەڵکو لەبەرئەوەی بە زمانێك لە زمانەکانی خۆرئاوا راستەوخۆ تێڕوانینی خۆرهەڵات بۆ خۆرئاواییەکان دەگوێزێتەوە کە دووری ئەو دوو ناوچەیە لەیەکتریو جەنگە کۆنو نوێیەکانی کە لەنێوانیاندا روویداوە بووە بەهۆی ئەوەی یەکتر نەناسنو چەندین راوبۆچوونی نادروستو سەرپێیان بەرامبەر بە یەك هەبێت.

ئەمین مەعلووف لە رۆمانەکانیدا کە زۆریان پشتیان بە مێژوو بەستووە تێڕوانینی خۆرهەڵاتیەکان دەگوێزێتەوە بۆ خۆرئاواییەکانو لایەنە گەشەکانی شارستانێتی خۆرهەڵات دەخاتە ڕوو تا بەهۆیەوە جۆرە دیالۆگێکی جیاواز لەنێوانیاندا دروست ببێتو هەردوولایان بەسەر ئەو مێژووە هاوبەشەیاندا بچنەوە کە زۆرجار خۆرئاواییەکان بە شێوێنراوی لێی گەیشتوون.

خۆرئاواییەکان بە گەرمی پێشوازییان لە کتێبەکانی مەعلووف کرد وەکو (الحروب الصليبية كما رآها العرب) (ليون الافريقي) (سمرقند) (حدائق النور)و ئەوانی تریشی کە جگە لەو چێژو سوودەی هەیەتی لاپەڕەیەکی نوێی لە دیالۆگی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا کردەوە، ئەو دیالۆگە کۆنەی کە لە هەمان کاتدا نوێیەو بەردەوام نوێدەبێتەوە، بۆیە گەر بمانەوێ وردتر قسە بکەین دەڵێین: ئەو

دیالۆگەی مەعلووف لە کتێبەکانیدا دایمەزراند دیالۆگێکە لەنێوان عەرەبو ئیسلامەکان لەلایەكو ئەوروپا لەلایەکی تر، کە دوو جیهانی دوورو لەیەك کاتیشدا نزیکن، ئەو دەریایەی کەوتۆتە نێوانیان چەندین شارستانی هاوبەش لە کەنارەکانیدا گەشەی کردووەو چەندین جەنگو کاولکاریش روویداوە.

جارێکیان مارون عەبود ناوی هەڵۆی لوبنانی لە(ئەحمەد فارس ئەلشدیاق) نا کە یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی رابوون لە لوبناندا کە دواجار رۆڵی ئەو پێشەنگە گەیشتە ئاسۆ دوورەکانیش، لە ئێستاشدا ئەمین مەعلووف شایەنی هەمان نازناوە بۆ ئەو رۆڵە گرنگەی لەپێناو لوبنانو عەرەبدا لە رۆژئاوا بینیویێتیو بۆ ئەو گوتارە نیشتمانیو روناکبیرییە مەردانەیەی هەڵیگرتووە.

لەم گفتوگۆیەدا کە گۆڤاری (العربی) لە بەیروت لەگەڵ ئەمین مەعلووفدا ئەنجامیداوەو سەرنووسەریش بەشداری تیا کردووە باس لەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی نێوان ئەوروپاو جیهانی عەرەبو داهاتووی ئەو پەیوەندییە دەکاتو پێی وایە جیهانی عەرەب چەند لە ئەوروپاوە نزیکە ئەوەندەش لێوەی دوورە، ئەو شتەی بووە هۆی درزبردنی پەیوەندییەکەیان ئەوە بوو کاتێك ئەوروپا لە سەدەی پازدەو شازدەدا کە تەقیەوە، جیهانی عەرەب یەکەم شوێن بوو راستەوخۆ گورزی بەرکەوت ئیتر دوای ئەوە نەیتوانی لەسەرپێی خۆی راوەستێتەوە، چونکە دوای ئەو گورزەش کۆلۆنیالیزم هاتو هەموو وڵاتانی عەرەبی داگیرکردو نەیهێشت لەو کەوتنەی راست بێتەوەو بۆخۆی بەتەنیا پێشبکەوێ، لە ئێستاشدا ئەو خەرەندەی نێوانیان هێشتا زۆر بەرینە، بۆنموونە شارێك لە باشووری ئیسپانیا کە بەتەنیشت شارێکی باکووری مەغریبەوەیەو تەنیا گەروی جبل تاریق-یان لەنێواندایە، ئەو شارە ئیسپانیە زیاتر لە شارێکی لیتوانیا دەچێ کە لەوپەڕی ئەوروپایە وەك لەوەی لەو شارەی مەغریب بچێت کە زۆر لێوەی نزیکە.

بەڵام ئەمین مەعلووف لەو باوەڕەدایە کە ئەوروپاو جیهانی عەرەبی زۆریان پێویست بەیەکەو خەو بەوەوە دەبینێ کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ تاڕادەی (هاوبەشیەکی ئۆرگانیکی) لەنێوانیاندا دروست ببێت، یەکێتییەکی عەرەبی- ئەوروپی لێبکەوێتەوە، لە ماوەیەکی کورتدا کرانەوەیەکی شارستانیو ئابووریو کۆمەڵایەتی چاوەڕواننەکراو بێتە ئاراوەو بەم سەدەیە رابگەین، هەروەکو ئەوەی لە ئیسپانیاو یۆنانو قبرص روویدا دوای ئەوەی پرۆسەیەکی پیتاندن لەنێوان ئەوانو ئەوروپادا روویداو لەبارێکەوە چوونە بارێکی تر.

ئەمین مەعلووف دەڵێ: دەبێ ئێمەی عەرەب دەستپێشخەربینو واز لەم توندڕەوییەی خۆمان بهێنین، من خەون بە یەکێتییەکی ئەوروپای دەریای ناوەڕاستەوە دەبینم کە کۆمەڵێ دەوڵەتی دراوسێی ئەوروپا بگرێتەوە وەکو تورکیاو زۆربەی دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەها مەغریبیش وەکو دەست پێشخەرییەك تادواجار هەموو دەوڵەتەکانی مەغریبی عەرەبی بچنە ئەو یەکێتییەوە، واتە یەکێتییەك یان هاوبەشییەکی ئۆرگانیکی نێوان ئەوروپاو جیهانی عەرەب.

ئەمین مەعلووف بیستو حەوت ساڵە لوبنانی جێهێشتووە واتە لە گەرمەی شەڕی ناوخۆی لوبناندا وڵاتی جێهێشتووەو چۆتە فەرەنسا کە زمانی فەرەنسایی دەزانیو لە رۆژنامەکانی فەرەنسا

کاری کردووە پێش ئەوەی خۆی بۆ نووسینی ڕۆمان تەرخان بکات، ئەو ڕۆمانانەی بەگەرمی پێشوازییان لێکرا، سەیریش لەوەدایە خۆی سەر بە بنەماڵەیەکی لوبنانییە کە ڕۆڵەکانی لە ئەدەبی عەرەبیدا پسپۆڕن، ئەم بنەماڵەیە حەفتا شاعیری تیا هەڵکەوتووە، لەوانە شفیق المعلوف خاوەنی (عبقر)و فوزی المعلوف خاوەنی (علی بساط الریح) رشدی المعلوف-ی باوکیشی ڕۆژنامەنووس‌و ئەدیب‌و شاعیر بووە، ئەمین مەعلووف وێنەیەکی پڕشنگداری شارستانییەتی عەرەبی پێشکەش بە خوێنەری خۆرئاوایی کردووە، کە بە پلەی یەکەم وێنەیەکی ڕاستگۆیەو چەندین لایەنی ژیانی بەغداو سەمەرقەندو بوخاراو غەرناتەو ئەندەلووس-ی بەگشتی گێڕاوەتەوە، تێڕوانینی ئیسلامەکانی سەبارەت بە جەنگی خاچپەرستان پێشکەش بە خوێنەری خۆرئاوایی کردووە تا وێنەیەکی جیاوازی ئەو جەنگەیان لەلا بێت ئەوەی مێژوونووسە عەرەبەکان بە(جەنگی فرەنجە) ناویان بردووە، ڕیاکاری بۆ خوێنەری ئەوروپی نەکردووە ختووکەی غەریزەکانی نەداوەو پێی نەوتووە کەوا مێژووی عەرەب هەمووی مێژووی خوێن‌و کوشتن‌و بڕین بووە بەڵکو مێژووی ناوچەکەو مێژووی شارستانیەتەکەی بە ڕاستگۆیی‌و سەربەرزانە گێڕاوەتەوە.

### ئەمەش دەقی چاوپێکەوتنەکەیە:

***باشە تۆ زمانی عەرەبی زۆر باش دەزانی بۆ بە فەرەنسی دەنووسی؟ بەمەش تۆ لە داب و نەریتی بنەماڵەی مەعلووف لاتداوە، ئەو بنەماڵەیەی دەیان شاعیری پێشکەش بە زمان و ئەدەبی عەرەبی کرد بۆ؟**

-چەندین هۆکار هەبوو بۆئەوەی بە زمانی فەرەنسی بنووسم، هۆکاری یەکەم کە ڕەنگە سەرەکیترین هۆکار بێت، جەنگی لوبنان بوو کە ناچاری کردم بچمە کۆمەڵگەیەکی تر واش ئاسانتر بوو بەزمانی ئەو کۆمەڵگەیە بنووسم.

لە لوبنان زمانی فەرەنسیم خوێندووە، بەڵام زمانی یەکەمم عەرەبی بووە. یەکەمجار لە ڕۆژنامەی (النهار) کارم کردووە کە ڕۆژنامەیەکی عەرەبییە، لە قۆناغێکی کارکردنمدا هەموو ڕۆژێ بە عەرەبی وتارێکم دەنووسی سەبارەت بەبابەتی سیاسیی، لەو باوەڕەشدام گەر بارودۆخی ئەو جەنگە نەبوایەو کۆچم نەکردایە بەردەوام دەبووم‌و هەر بە عەرەبی دەمنووسی، کاتێکیش چوومە فەرەنسا سەیرم کرد ئاسانە بە فەرەنسی بنووسم چونکە خۆشم پێشتر بە باشی ئەو زمانەم دەزانی، لە لوبنان لە قوتابخانەیەك خوێندوومە زۆر بەباشی فەرەنسی تیا دەخوێنرا بەڵکو لە عەرەبیش باشتر، سەبارەت بەخۆم لەماڵەوە کە بە عەرەبی قسەمان دەکرد جۆرێ لە هاوسەنگی بۆ دروست دەکردم لەو پەیوەندیەمدا بە زمانی فەرەنسییەوە، ئەو کاتە گەر بەتەنیا خەریکی زمانی فەرەنسی بوومایە ئەوا فەرەنسییەکەم بەهێزتر دەبوو لە عەرەبییەکەم بەڵام لە ماڵەکەماندا جۆرێ نەریت هەبوو کە بۆجارێکیش جگە لە عەرەبی بە زمانێکی تر قسەم نەکردووە، باوکیشم (رشدی المعلوف) کە نووسەرو شاعیرو ڕۆژنامەنووس بوو هەر بە عەرەبی دەینووسی، ئێمە وەکو بنەماڵە شانازیمان بەوەوە دەکرد کە بنەماڵەی مەعلووف خزمەتی زمان‌و ئەدەبی عەرەبی کردووەو لەو بوارەدا مێژوویەکی دێرینی هەیە، ئەم حاڵەتە جۆرێ لە هاوسەنگی لەنێوان ئەو دوو زمانەدا

دروست دەکرد، دواجارو بە پلەی سێیەم زمانی ئینگلیزی هات.

وەکو وتم هۆکاری یەکەمم کە وایلێکردم بە فەرەنسی بنووسم سەفەر کردنم بوو بۆ فەرەنسا، دیارە کەسێك کە لە کۆمەڵگەیەکدا بژی‌و تێکەڵاویان بێت دەبێت چاوەڕوانی کاردانەوەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بێت سەبارەت بەو شتانەی دەینووسێ ئەمە شتێکی ئاساییە، دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت کاتێك یەکێك لە کۆمەڵگەیەکدا دەژی‌و بەزمانی ئەوان نانوسێ لەوێدا وەزعی ئاسان نابێت، لەبەرئەوە ئەو کاتەی لە لوبنان بووم، واتە پێش سەفەرەکەم نەدەکرا بەردەوام بە فەرەنسی بنووسم ئەوسا بە عەرەبیش دەمنووسی‌و بە فەرەنسیش.

هۆکارێکی تر کە وایلێکردم بە فەرەنسی بنووسم ئەوە بوو لە فەرەنسا هەستم کرد پێویستم بەوەیە چەند شتێك بگەیەنمە خوێنەری ئەوروپی، بەڕێکەوت نەبوو کە یەکەم کتێبم کە بە فەرەنسی نووسیم کتێبی (الحروب الصليبية كما رآها العرب) بوو، هەستم کرد چەند شتێك هەیە لە وڵاتی عەرەبەوە کە تیا ژیاوم لەگەڵما هاتووە بۆ ئەوروپا، چەند شتێك کە لە ڕۆژئاوا نەناسراوە یان بەهەڵە یان بە شێوێنراوی زانراوە، هەستم کرد پێویستدەکا وێنەیەکی تریان سەبارەت بە شارستانی عەرەب‌و وڵاتی عەرەب پێشکەش بکەم جیاواز لەو وێنەیەی لەلایانە، یان لەو وێنەیەی بەشێوەیەکی تەقلیدی لە ڕێگەی گەڕیدە خۆرئاواییەکانەوە گەیشتۆتە لایان، ئەو گەڕیدانەی دەهاتنە ڕۆژهەڵات‌و کە دەگەڕانەوە بۆ روژئاوا وەسفیان دەکرد، چەند نووسەرێکی ڕۆژهەڵاتی پێش من بە زمانی ڕۆژئاوا باسی ڕۆژهەڵاتیان کردووە، لە بیستساڵی دوایی سەدەی رابردوودا دیاردەیەك بڵاوبووەوە، ئەویش هاتنی نووسەران بوو لە چەندین وڵاتانی دوورەوە بۆ ئەورووپا‌و ئینجا دەستیان کرد بە نووسین بە زمانی ئەوروپی وەکو فەرەنسی، ئینگلیزی، ئیسپانی، ئەڵەمانی، سەبارەت بە مێژوو کلتوورو بارودۆخی وڵاتەکەیان‌و هیواکانیان، بۆ نموونە چەند نووسەری تورك هەن کە لە ئەڵمانیا دەژین‌و بە ئەڵەمانی دەنووسن، بۆ یەکەمجار خوێنەری ئەڵەمانی بە زمانەکەی خۆی گوێی لەو دەنگانە دەبێت کە لە تورکیاوە هاتوون یان لە شوێنی ترەوە یان سەبارەت بە چەند مەسەلەیەك کە لە گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپییەکانەوە گوێی لێبوو بوو.

ئەم دیاردەیە بەتەواوەتی نوێیە، جاران ئەڵەمانەکان کتێبی نووسەرە تورکەکانیان وەردەگێڕایە سەر زمانی ئەڵەمانی، بەڵام ئەو کتێبە وەرگێڕدراوانە کەم کەس دەیخوێندنەوە، بەڵام کاتێك نووسەرێکی بیانی دێت بە زمانی خەڵکی وڵاتەکە دەنووسێ ئەمە جۆرێ پەیوەندی تر دەخوڵقێنێ، هەر کە یەکەمجار لە لوبنانەوە هاتمە فەرەنسا هەستم بەمە کردو هەستم کرد بەدحاڵیبوونێك هەیە بەرامبەر ئەوی دی، ئەو بەدحاڵیبوونەش لە هەردوولاوەیە، لێرەشەوەو لەوێشەوە، وێنەیەکی شێوێنراو هەیە، وێنەیەکی ناواقعی هەیە سەبارەت بە عەرەب لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە، لەبەرئەوە ئەرکی هەموو نووسەرێکە کاتێ دەگاتە ئەوروپا ئیش لەسەر ئەوە بکات بەپێی توانا ئەو وێنەیە راست بکاتەوە.

یەکەم کتێب کە نووسیم لەم هەستەمەوە هەڵقوڵابوو، هەروەها دووەم کتێبیشم ڕۆمانی (لیون الافريقي) کە گەوهەری کتێبەکە لە حەفتا تا هەشتا لاپەڕەی یەکەمیدایەو باس لە کەوتنی غەرناتە

دەکاتو دواتریش ئەندەلوس، ویستم باسی رمانی غەرناتەو ئەندەلوس کەم لە دیدگای سەرکەوتووەکانەوە نا ئەوانەی شانازییان بە گێڕانەوەی غەرناتەوە دەکرد بەڵکو لە دیدگای ئەوانەوەی لێی دەرکران، ئەمە بیرۆکەی سەرەکی من بوو کە (لیون الافریقی)م دانا، لەو باوەڕشدام کە دەبێت پێشکەشکردنی دیدگای عەرەب بۆ رۆژئاوا بە زمانێکی رۆژئاوایی بێت. دیارە هۆکاری تریش هەیە پاڵی پێوەناوم کە بە فەرەنسی بنووسم.

## لایەنە رەسەنەکان

***یەکەم شت کە خوێنەری رۆمانەکانت تێبینی دەکات بە ڕاستگۆیی باسی ئەو لایەنانەت کردووە کە پێشکەشی خوێنەری رۆژئاواییت کردوون، بەدڵی ئەو خوێنەرە نەجوڵاویتەوە بەڵکو بە ئەنقەست تێڕوانینی ئەوی ترت پێشکەشکردووە بەوپێیەی تۆ سەر بە شارستانییەتی عەرەبیت.**

–کەشی ئەو ماڵەی تیا گەورە بووم ئینتیمایەکی چەسپاوی بۆ شارستانییەتی عەرەبی هەبوو، جگە لەو هەستەش کە دەبێت چ شتێ گەشو بەرزو رەسەنە لەو شارستانیەتەدا نیشانی ئەوی تر یا بەرامبەرەکەی بدەین، خۆشی هەروایە کاتێ یەکێك سەر بە شارستانییەکی گەورەی وەکو عەرەبی ئیسلامی بێت ناتوانێ لە(بارێکی تایبەت)دا خۆی قەتیس بکات، وەکو خۆگیرکردن لەو کۆمەڵە ئاینی یا تایەفی یا مەزهەبیەی ئینتیمای بۆی هەیەو دەست لە هەموو شتێکی تری ئەو شارستانیەتە بشوا، قەت شتی وا نەهاتووە بەخەیاڵما.

کاتێ باسی شارستانیەتی عەرەب دەکەین دەبێت باسی هەموو لایەنەکانی بکەین، باسی چەند سەدەیەکی مێژوو، باسی چەند وڵاتێك کە هەموویان بەتەنیا عەرەب نین، کاتێ مرۆڤ سەر بە شارستانیەتی عەرەبی بێت دەبێت ئیبن سیناو بەیرونی و ئیبن روشد–یشی خۆش بوێ، لەوانەیە دواجار بگاتە ناوەڕاستی ئاسیا، بێگومان دەشگاتە ئەوپەڕی مەغریب، ئەو کاتە هەست بە ئینتیمای خۆی دەکا بۆ لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو شارستانیەتە، کەواتە دەبوو لایەنی جیاوازی ئەو شارستانیەتە پێشکەش بە رۆژئاواییەکان بکەم، ئەمەش لەو خۆشەویستییەوە هاتووە کە پێی گۆشکراوم، خۆشەویستیم بۆ ئەو شارستانیەتە، هیچ منەتێکیش ناکەم، ئەمە ئەو کارەیە خۆمم بۆ تەرخان کردووە، ئەمەش لەو کەشە خێزانیو نیشتمانییەوە هەڵقوڵاوە کە تیایدا پەروەردە بووم لەبەرئەوە ناتوانم ئەو شارستانیەتە کەرت کەمو بەشی کەم لایەنێکی هەڵبژێرمو لایەنێکی تر دوورخەمەوە یان بڵێم ئەو لایەنە تایبەتە بە عەرەبێکی تر پەیوەندی بە منەوە نییە. ئەمە ئەو شارستانیەتی عەرەبییەیە کە دیومەو کە مامەڵەم لەگەڵدا کردووە بەشێوەیەکی یەکسانو کامڵ، شارستانییەتێك لە قۆناغێکی مێژوویيدا دەستپێکردووەو لەوانەیە پەیوەندییەکی بە ئایینەوە هەبووبێت، لەڕووی مێژووییەوە ناتوانین ئەو شارستانیەتە لە ئایین جیا بکەینەوە، ئەو ئایینە گەیاندییە ناوەڕاستی ئاسیاو ئەوپەڕی مەغریب.

شارستانیەتی عەرەبیش کە بنیاتنراوە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەیە، ئەوانەی باوەڕیشیان بەو ئایینە هێناوە هەموویان عەرەب نین، بەڵکو شارستانیەتی میللەتانی تریشە کە بەشدارییان لە بنیاتنانو دروستکردنیدا کردووە.

بیریشمان نەچێت کە شارستانیەتی رۆژئاوا پەیوەندی بە مەسیحییەتەوە هەیە، بەڵام مەسیحییەت شارستانیەتی رۆژئاوا لەخۆیا کورت ناکاتەوە، لەناو مەسیحییەتدا بەشێکی گەورە هەیە پەیوەندی بە شارستانیەتی رۆژئاواوە نییە، لەناو شارستانیەتی رۆژئاواشدا زۆر شتی سەرەکی هەیە پەیوەندی بە مەسیحییەتەوە نییە، بۆنموونە قانونی رۆمانی کە تا ئێستا بنەمای شارستانیەتی رۆژئاوایە لەپێش مەسیحییەتەوە هەبووە، بەڵام ئێستا شتەکە واکەوتۆتەوە کە دیموکراسیو قانونو ماف کۆڵەکەی شارستانیەتی خۆرئاوایە.

***هەر هەمان شت لە شارستانیەتی عەرەبیشدا روویدا کاتێ چەندین کلتوورو شارستانیەتی پێش خۆی ئیستیعاب کرد.**

–بێگومان، شارستانیەتی عەرەبی لە مەزنترین ساتەکانیدا شارستانیەتی گریكو فارسیو هیندی ئیستیعابکردو بەسەر مەسیحییەتو هەموو کلتووره ئاینییەکانی تریشدا کرایەوە بەوجۆرە شارستانیەتی عەرەب بووە شارستانیەتی هەموو گەلانی ناوچەکە ئەوەش نهێنییەکە لە نهێنیەکانی مەزنی ئەو شارستانییەتە.

## لەنێو شارستانییەتەکاندا

***دوای ئەوەی یەکەم کتێبت (الحروب الصليبية كما رآها العرب)ت نوسیو ئینجا کتێبی دووەم (ليون الافريقي)ت نووسی، بەخەیاڵتا دەهات کە تۆ دەتوانی لە مەسەلەی لەیەك نزیکبوونەوەو راکێشانی پردی رووناکبیری لەنێوان وڵاتە عەرەبییەکانو ئەوروپاو رۆژئاوادا رۆڵێك ببینی؟ کاتێ ئەو شتانەت نووسی لە زەینتدا بوو بەشداری لە دیالۆگی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا بکەی؟**

–ئەم مەسەلەیە هەروا لەخۆیەوە هات بەهۆی باکگڕاوندی روناکبیریو فیکریمو لەبەرئەوەی من سەر بە وڵاتێکم کە ئاسایی خۆی دیالۆگ ئامێزە، بمەوێو نەمەوێ ئەو باکگڕاوندە واملێدەکات نووسەرێکی بەئاگابم بۆ ئەو مەسەلانەی ناوت هێنان چونکە چارەنووسی منی نوسەر بەستراوە بە لەیەك نزیکبوونەوەی ئەو شارستانیەتو کلتوورانەوەو گرنگی پێدان پێیان، ئیتر بمەوێ یان نەمەێ لەبەرئەوەی من لە نێوەندی ئەو شارستانیانەدا دەژیم یان لە کەناریاندا. بە مناڵی لە قوتابخانەیەك دەمخوێند مامۆستاکانی لە فەرەنساو هۆڵەنداو وڵاتانی تری ئەوروپاوە هاتبوون، لەبەرئەوە خۆم بینیەوە وام لەنێوجەرگەی پرۆسەیەکی خۆڕۆشنبیرکردن و لەوانی دی خۆنزیکخستنەوە، لە قوناغێکی دواتردا تیۆرێکم بۆ ئەو پرۆسەیە دەستکەوت، ئیتر قەناعەتم بەوە کرد کە دواجار دەوری من ئەوەیە پرد لەنێوان هەردوو بەرەدا دروست بکەم، دواجاریش لە ڕوانگەی لوبنانی بوونی خۆمەوە کە هەردەم بۆ ئەو دەورە ئامادەی دەکردم ئاسایی ئەو کارەم کرد، ئەوەی لە لوبنانیش لەدایك بێت هەوای ئەو کەشە رووناکبیرییەی ئەوێ هەڵمژێت کە تێکەڵە لە چەندین کلتوورو کاریگەری جیاواز جیاواز، دەبێت خۆڕسکانە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات، بۆیە کاتێ کە یەکێکمان کەسێکی بیانی دەبینێ سەرەتا پێی دەڵێن (هەندێ شتت سەبارەت بە ئێمە پێگەیشتووە یان لەوانەیە بەشێوەیەکی نادروست تێی گەیشتبیت، ئەمە وایلێکردوی تاڕادەیەك وێنەیەکی هەڵەت سەبارەت بە وڵاتەکەم یان مێژووەکەم هەبێت، رێم پێبدە وێنەیەکت نیشانبدەم کە بەلای منەوە ئەوە وێنەی راستەقینەی وڵاتەکەمە).

لەراستیدا بەشێوەیەکی ئاسایی من ئەمەم لە مەسەلە مێژووییەکاندا کردووە، زۆرجار مێژوو بەهەڵە دەگێڕدرێتەوە، سەبارەت بە سەرەتای جەنگی خاچپەرستان زۆرم خوێندۆتەوە، وەکو ئیبن الاثیر و خەڵکانی تر هەموویان ئەوەی دیویانەو بیستوویانە دەیگێڕنەوە، تێڕوانینمان بۆ جەنگی خاچپەرستان بەگشتی ئەو تێڕوانینە بوو لە قوتابخانە لەرێی کتێبی رۆژئاواییەکانەوە خوێندومانە، من خۆم تینوو بووم بۆئەوەی چەندین چیرۆکی ناو مێژوو، شارستانی خۆم بگێڕمەوە لە ڕوانگەیەکەوە جیاواز لە ڕوانگەی رۆژئاوا، وەکو چیرۆکی غەرناتەو جەنگی خاچپەرستان.

***چەندین چیرۆکی ترت گێڕاوەتەوە وەکو چیرۆکی مانی لە(حدائق النور)دا لە سەمەرقەند-یش لاتداوە، بەڵام جەنگی خاچپەرستان ئەو چیرۆکە سەرنجڕاکێشەیە، نووسەرە عەرەبەکان قەت وەکو ئەوروپییەکان سەیری ئەو جەنگەیان نەکردووە.**

-ئەمە ئاساییە.

***پێشینان گوزارەی (جەنگی خاچپەرستان)نیان بەکار نەدەهێنا بەڵکو دەیانووت جەنگی ئەفرەنجە رەنگە ئەوان بەخشندەتر بووبن.**

-جەنگی خاچپەرستان ئەنجامی بڕیارێك بوو، کەسانێك کۆبوونەوەو وتیان دەبێت بچینە رۆژهەڵات بۆئەوەی کارێکی مەزن ئەنجامبدەین کە گەڕاندنەوەی قودسە، ئەو کەسانەی لەو جەنگەدا بەشدارییان دەکرد فیکرەیەکی روونو ئاشکرایان هەبوو سەبارەت بەو ئەرکەی لەپێناویا هاتبوونە ناوچەکە تا جێبەجێی بکەن، ئەو کەسەی لە حەڵەب یان دیمەشق نیشتەجێ بوو، مەرج نییە کاتێ ئەو کەسانەی دەبینی بزانێ ئەرکی راستەقینەی ئەوانە چییە؟ دیارە ئەمەش لە قۆناغێکدا روویداوە کە نە راگەیاندنو نە رۆژنامەوانی هەبووە، ئیتر خەڵکی شام کە ئەوانەیان بینیوە زانیویانە ئەوانە داگیرکەرنو هاتوون وڵاتەکە داگیر بکەن، ئەمەشیان بەلاوە ئاسایی بووە. لە رابردوواو بەدرێژایی مێژوو ئەو ناوچەیە گەلێ داگیرکەرو سوپای جۆراوجۆری دیوە هاتوونو داگیرکاریان کردووە، کەس بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ئەمانە پلانی جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەوانی پێشتردا، بێزەنتیەکان کە پێش خاچپەرستان سوپایان ناردووە لەنێو ئەو سوپایەدا چەکداری فەرەنسی تیا بووە کە سوپای بێزەنتە بەکاری دەهێنان بۆ گەڕاندنەوەی ئەنتاکیە یان هەر شارێکی وڵاتی شام، کە خەڵکی شام ئەو سوپایانەیان دەبینی دەیانووت شای رۆم سوپایەکی تری نارد.

## تێگەیشتنی راستەقینە

***لە سەدەی بیستدا چەندین گەشتی عەرەبیو رۆژهەڵاتی بەناوبانگ هەیە، لەوانە گەشتی: محەمەد عەبدە، ئەلئەفغانی، شەکیب ئەرسەلان، ئەلتەهتاوی، سەرەتا ئەوانە کە چوونەتە ئەوروپا جیهانێکی تریان دیوە وەسفیان کردووەو دواتر لە کتێبەکانیاندا باسیان کردووە، دیارە لە هەمانکاتدا بە پێچەوانەشەوە گەشت هەبووە بۆ رۆژهەڵات. ئایا گەشتەکەی تۆ بۆ ئەوروپا لەو گەشتانە دەچێت، یان جۆرێکی تر بووە؟ بێگومان تۆ ئێستا رۆژهەڵاتیشیو ئەوروپیش، لە شوناسێك زیاترت هەیە، ئەو شوناسانەت سەرچاوەی دەوڵەمەندیو ئیلهامن بۆ ئەدەبەکەت بەڵام تۆ خۆت چۆن ئەو کەرت بوونە دەگێڕیتەوە لەنێوان رۆژهەڵاتو**

**ڕۆژئاوادا، لەنێوان شوناسێك و شوناسێكدا لەنێوان بەرەیەك و بەرەیەكی‌تردا؟**

–ئەو كەسایەتیانەی ناوت هێنان لە قۆناغێكدا چونەتە ئەوروپا گەلەكانیان زۆر شتیان سەبارەت بە ڕۆژئاوا نەدەزانی، لەبەرئەوە ئەوان ئەركێكیان لەسەرشان بوو ئەویش دیتنی ئەو وڵاتانەو نەقڵكردنی وێنەكەی بووە بۆ وڵاتەكانیان، من درەنگتر هاتم، ئێمە لەسەدەی تەلەفزیۆن و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو كتێبدا دەژین، لەبەرئەوە كاری من و ئەوانەی وەكو من وان جیاوازە لە كاری ئەو پێشەنگانەی ئاماژەت پێدان، مەسەلە سەختەكە ئێستا ئەوەیە ئێمە دەبێت ئەركەكەمان جۆرێكی تر بێت، بەڕاستی لە واقعی شارستانیەتەكەی بەرامبەر تێبگەین، لەوانەیە یەكێك پێی سەیر بێت تا چ ڕادەیەك ڕۆژئاوا زانیاری سەبارەت بە جیهانی عەرەبی نییە، نە مێژووەكەی نە كەلەپووری نە كۆمەڵگە تازەكانی، زانیاری ڕۆژئاوا سەبارەت بە مێژووی كۆمەڵگەكانمان زۆر پێش نەكەوتووە ئەمڕۆ تێگەیشتنێكی قووڵترو باشتر نییە لەچاو دووسەد یان چوارسەد ساڵ لەمەوبەردا.

كەس لە ئێمە لە ڕۆژئاوا هەستناكەین كە خۆرئاوا بەو ڕاستی و قوڵییە دەماننناسێ، بێگومان گەلێ هەواڵ سەبارەت بە عەرەب و ئیسلامەكان دەگاتە ڕۆژئاوا، لە چەندین سەرچاوەی جیاوازەوە بەڵام گرفتەكە لە تەفسیركردنی ئەو هەواڵانەدایە، تێگەیشتن لە بنەماكانی كۆمەڵگەی عەرەبی و باكگراوندەكانی و پاڵنەری ئەو كارانەی تیایدا ڕوودەدا تێبگەن، بەداخەوە هەستناكەم تێگەیشتنێكی قووڵ لە ڕۆژئاوادا هەیە سەبارەت بەوەی لێرە ڕوودەدا.

ئەوەی من دەمەوێ بیكەم، بەڕاستیش خەیاڵ پڵاونیم سەبارەت بەوەی تا چەند كاریگەری دەبێت، هەوڵدانێكە بۆ نەقڵی شتێك لەو مەعریفەیەی هەمە بۆ ئەو كۆمەڵگەیەی تیا ژیاوم، شتێك نەقڵ كەم لەو تێگەیشتنەی خۆم لە مێژووەكەم لە شارستانیەكەم بۆ خەڵكانێكی تر لە شارستانیەكی تردا، بەڵام حەز دەكەم ئەوەش بڵێم كارێكی لەو جۆرە پێویستی بە كۆششێكی زۆرو درێژخایەن و كەڵەكە بوو هەیە نەك بەتەنیا كۆششی تاكە كەسێك، پێویستیش ناكات بڵێم ئەوە پێویستی بە كۆششی چەندین نەوەیە بۆ چەندین ساڵ.

گەر پرسیاریش لە من بكەی كە بیست و حەوت ساڵە كۆچم كردووە بۆ ئەوروپا داخۆ ئەوروپای ئەمڕۆ باشتر لە جیهانی عەرەب تێدەگات لەچاو بیست و حەوت ساڵ لەمەوپێشدا، بەڕاشكاوی وەڵامت ئەدەمەوەو ئەڵێم: نەخێر.

ڕەنگە لە هەندێ لایەندا جۆرە بەرەوپێشەوە چوونێك هەبێت، بەڵام هێشتا خەرەندی نێوان ئەو دوو جیهانە زۆر گەورەیە، هەر یەكێك لەم دوو جیهانە پێی وایە باش لەوە دەگات كە ئەوەی تر دەیڵێ، بەڵام لەڕاستیشدا هیچ یەكێكیان تێناگات ئەوی دی بۆ وا هەڵس‌وكەوت دەكات، بۆئەوە ڕوودەدا چۆن ڕوودەدا چی ڕوودەدا؟ خەرەندەكە زۆر گەورەیە لەنێوان ئەو دوو جیهانەدا، لەو قەناعەتەشدا نیم بە تێپەڕینی كات ئەو خەرەندە بێتەوە یەك، لەراستیدا قەت نایەتەوە یەك.

*** بەڕای تۆ خەتا لەكێوەیە؟**

–كەمتەرخەمیەكە لە هەردوولاوەیە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش بەڵام ئەگەر هەزار كەس وەرگرین لە جیهانی عەرەب كە گرنگی بە ئەوروپا ئەدەن و شوێن هەواڵەكانی دەكەون، دەبینین ئەوانە دەتوانن لە

ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕووناکبیری ئەورووپا تێبگەن، بەڵام لە ڕۆژئاوا هەزار کەس نادۆزیتەوە زمانەکانی وڵاتانی عەرەبو ئیسلامی بەتەواوی بزانن.

لەسەر ئاستی تێگەیشتنی بەرامبەرو ئارەزوو بۆ ناسینی بێگومان ئەوە ڕۆژئاوایە کە کەمتەرخەمە، هەر ڕۆژئاواشە کە دەتوانێ واقعی خۆی، هەستەکانی، بیروباوەڕی، وێناکردنەکانی بۆ هەموو جیهان نەقڵ بکاتو قەناعەتیشیان پێبکات، ئەمە لەکاتێکدا جیهانی عەرەبیو ئیسلامی ناتوانێ خۆی بگەیەنێتە ویژدانی میللەتانی تر.

## کێشەیەکی ئاڵۆز

***لەسەر ئاستی هاوبەشی مێژووییو جوگرافی دەبینین نزیکترین دوو جیهان کە لە جەنگو غەیری جەنگیشدا هاوبەش بوون جیهانی عەرەبیو ئەورووپییە لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی نێوان ئەو دوو جیهانە، کەڵەکەبوونی دوژمنایەتی یا کێبڕکێ یا هاوکاری بووە کەچی جۆرێ لە متمانە لەنێوانیاندا دروست نەبووە، هێشتا بەدگومانی زۆرە بەتایبەتی لەلایەن هەندێ لە دەوڵەتانی عەرەبییەوە، ئەو بەدگومانییەی ئەورووپاشی تێپەڕاندووەو گەیشتۆتە ئەمەریکاش، ڕەنگە عەرەب متمانەی زیاتری بە ئەمریکییەکان کردبێت وەك لە ئەورووپاییەکان، بێگومان ئێستا قوناغە توندوتیژەکانی دژایەتیکردنی مێژوویی کۆتایی هاتووە، دەبێت ڕابردوو تێپەڕێنین، پەیوەندی نوێ دروست بکەین، لە بوارەکانی ئابووریو ڕووناکبیریو بواری تریشدا، دەریایەکی هاوبەش لەنێوانماندایە کە دەریای سپی ناوەڕاستە.**

-گەر مرۆڤ بیەوێ هەموو مەسەلەکە لەیەك ڕستەدا کورتبکاتەوە دەبێت بڵێ کێشەی جیهانی عەرەبی لە پەیوەندییەکەیدا بە ئەورووپاوە کێشەیەکی ئاڵۆزە، جیهانی عەرەبی نزیکە لە ئەورووپاوەو دووریشە، کە ئەورووپا لە سەدەی پازدەو شازدەدا تەقیەوەو دەستیکرد بەوەی دەست بەسەر جیهاندا بگرێ، جیهانی عەرەب ڕاستەوخۆ گورزی بەرکەوت، ئەوانەی دوور بوون لە ئەورووپاوە توانیان گەر بۆماوەیەکیش بووە پارێزگاری جۆرێ لە پێشکەوتنی خۆیانو جۆرێ لە بەردەوامبوونی خۆیان بکەن، لەبەرئەوە ئەورووپا لەو دوو سەدەیەدا ڕاستەوخۆ لەسەر حیسابی جیهانی عەرەب پێشکەوت، چونکە یەکەم گورزی بەرکەوت، لەبەرئەوە لە سەرەتای ڕێنسانسی ئەورووپییەوەو سەرەتای ئەوەی شارستانی ئەورووپا بوو بە شارستانییەتێکی جیهانی سەردەست ئیتر دەوڵەتە عەرەبییەکان بەتایبەتی ئەوانەی دەکەونە بەرامبەر ئەورووپا نەیانتوانی هیچ شتێك سەربەخۆ بۆخۆیان پێشبخەن، جگە لەوەی پێشکەوتنی ئەورووپا لەڕێی سنوورە ڕاستەوخۆکانیشەوە نەگوێزرایەوە بۆ جیهانی عەرەبی وەکو چۆن ئەو شارستانییە گەیشتە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ئەمەش بەهۆی ئەوەی پێکگەیشتنێکی شارستانی لەنێوانیاندا نەبوو.

کەواتە فاسیلەیەکی شارستانی لەنێوان ئەو دوو جیهانەدا هەیە کە بێگومان پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە، ئەمە وایکرد جیهانی عەرەب لە ئەورووپاوە نزیك بێت بەڵام نەیتوانی بەجیا لەو پێش بکەوێ، هەر ئەو فاسیلە شارستانیە وایکرد جیهانی عەرەب زۆر دوور بێت لە ئەورووپاوە، هەمیشە هێڵێکی جیاکەرەوە هەبوو نەیدەهێشت ئاوێتە بوون و تێکەڵاوبوون لە نێوانیاندا دروست بێت کەچی ئەمە

لای عەرەبو ئیسلامەکان پرسیارێکیشی دروست نەکرد، نەشیاندەتوانی لە شارستانی ئەوروپی تێبگەن یان ئیستعابی بکەن چونکە بە ڕوونی بۆیان ئاشکرا بوو کە ئەو شارستانییە لە دەرەوە بۆیان دێ، تائێستاش لەم کێشەیە رزگارمان نەبووە، وەکو وتم: شارێك کە دەکەوێتە باشووری ئیسپانیاو شارێك کە دەکەوێتە باکووری مەغریب دەبێت زۆر لەیەکەوە نزیك بن کەچی دەبینین شارەکەی باشووری ئیسپانیا لە لیتوانیاوە نزیکترە تا لە شارەکەی باکووری مەغریبەوە، ئەمڕۆش هەر ئەو شارە ئیسپانیە زیاتر لە لیتوانیاوە نزیکترە لەچاو چل ساڵ لەمەوپێشدا ئەمە سەیر نییە؟

***ئایا مەبەست دوورخستنەوەمانە وەکو ناوچەو وەکو جیهانێکی تر؟**

–بەهیچ جۆرێ لەو باوەڕەدانیم پلانی لەو جۆرە هەبێت، لە قۆناغێکدا لەبەر گەلێ هۆ، ئەوروپا بەرەو هەموو جیهان کشاو لەسەر هەموو ئاستێ، سیاسیی، عەسکەریو کۆلۆنیالی، ئەوروپا گەیشتە ئەوپەڕی دنیاو بەهەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەوە، بۆ نموونە لە ئەفریقا کۆمەڵگەکانی جۆرێ لە تێکشکاندنی تووش هات، لە هەردوو ئەمریکاش کۆمەڵگە تەقلیدیەکانی سڕانەوەو هیچی وایان لێنەمایەوە، لە قۆناغێکی دواتریشدا کۆمەڵگەکانی چینو هیندستان بەخەستی زەرەرمەند بوون.

گورزە راستەوخۆکەی ئەوروپا بەر وڵاتانی باشوورو رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست کەوت، ئیتر هەر هەوڵدانێك بۆ بنیاتنان بەباچوو، کە ئەوروپا دڵی ئەو شارستانیە گەورەیە بێت کەبەسەر جیهاندا زاڵە هیچ بوارێك بۆ خەڵکی وەهران یان مەراکیش یان تونس نامێنێتەوە کە شارستانیەکی بەدیل دروست بکەن، رەنگ بوو بتوانرێ لە شەنگەهای یان تۆکیۆ شتێ بنیاتنرێ، بەڵام نەدەتوانرا هیچ شتێك لە یەکەم هێڵی باکووری ئەفریقا بنیاتنرێ، ئەو وڵاتانەی دراوسێی ئەوروپا یان دەبوو بچنە ناوچەی شارستانی ئەوروپاوە یان دەبوو لەناوچوونایە، بەڵام ئەوەی روویدا ئەو وڵاتانە بە عەمەلی نەیانتوانی بچنە ناو ئەو جەوە ئەوروپییەوە بەڵکو لە ماوەیەکی کورتدا بوونە وڵاتانی کۆلۆنیاڵکراو، ئەمەش مەسەلەیەکە تا ئێستا نەمانتوانیوە لێی دەرچینو تائێستا مەسەلەکان ئاڵۆزن، کۆلۆنیالزم هاتو رۆیشت ئینجا جەنگی سارد دەستیپێکرد، هەموو ئەم دیاردانە دەوری خۆیان بینی بەڵام مەسەلەکان تا ئەم ساتەوەختە چارەسەر نەکراون بەڵکو زیادی کردووەو کەمی نەکردووە.

***هیچ شێوەیەك یان پەیوەندییەکی نوێ یان بەدیلێك پێشنیاز دەکەی لەنێوان جیهانی عەرەبو ئەوروپاو رۆژئاوا؟**

–لەو باوەڕەدام ئەو لایەنانە هەریەکەیان پێویستی بەوی ترە، بەتایبەتی لەم ساتەوەختەدا، لە رابردوودا رەنگە پێویستیەکەیان بەوی تر وەکو ئێستا روونو ئاشکراو زەروور نەبووبێت.

لەوانەیە ئێستا ئەوروپا تاڕادەیەك پەراوێز کەوتبێت پاش ئەوەی سەنتەری جیهان بوو ئێستا دەورەکەی تۆزێ سنووردارە لەبەرئەوە ئێستا لە جاران زیاتر پێویستی بە ئەوانی ترە، چیتر ئەوروپا ناتوانێ لە خۆرئاوادا پەیوەندییەکی یەك لایەنەی هەبێت دەبێت بۆ پێگەیەکی تر بگەڕێ لە جیهاندا، لەلایەکی تریشەوە هەستدەکەم کە جیهانی عەرەبی هاوچەرخ چ لە رۆژهەڵاتو چ لە رۆژئاوا ناتوانێ خۆی بە تەنیا، سەربەخۆ پێش بکەوێ تا بەتووندی ئاوێتەی ئەوروپا نەبێ،

هەروەکو ئەوەی لە ئیسپانیاو پورتوگالو یۆنانو قبرص روویدا.

دەبێت ئاوێتەبوونێکی بەهێز بە جۆرێ لە جۆرەکان کە رێ بە عەرەب بدات بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بۆپێشەوە باز بدات.

گەر پەنا بۆ خەونیش بەرم ئەوا ئەڵێم: ئەو ئاوێتە بوونە دەبێ ببێتە هۆی یەکێتییەکی دەریای ناوەڕاست، کۆمەڵێکی باش لە وڵاتانی عەرەبی دراوسێی ئەوروپا، هەموویان بچنە ناو ئەو یەکێتییەوە وەکو تورکیا، زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، مەغریب، رەنگە دوایی هەموو وڵاتانی مەغریبی عەرەبی، خەونەکە دروست بوونی جۆرێ لە هاوبەشی ئۆرگانیکییە، گەر بشێت وابڵێین.

ئێمە پێویستمان بە دەستپێشخەرییەك هەیە بەشێوەیەکی دراماتیکی ئەو کەللە رەقییە کوشندەیەی کۆمەڵگەکەمان بشکێنێ، رێخۆشکەر بێ بۆ بازێکی گەورە لەسەر ئاستی ئابووریی، نەك بە بەرەوپێشەوە چوونێکی خاوخلیچكو ناکاریگەر، لە میانەی دەساڵ یا پازدە ساڵدا دەبێت ئەو وڵاتانەی ناوم هێنان بگەنە حاڵەتێکی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتی چاوەڕواننەکراو وەکو لە یۆنانو قبرصو شوێنانی تر روویدا.

ئەمەش زۆر زەحمەت نییە گەر رابردوو وەلانێین‌و عاقڵانەو ئازایانە سەیری داهاتوو بکەین.

## سەرچاوە

گۆڤاری العربی/ ژمارە542/کانوونی دووەمی2004.

# به چینی بیردەکەمەوە وەلــێ به ئینگلیزی دەنوسم!

## گفتوگۆیەك لەگەڵ
## (هۆجین)ی شاعیر و نوسەری ئاسیایی

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

هۆجین؛ی شاعیرو نوسەری بەرجەستەی ئاسیایی- نوسەری ڕۆمان و کورتەچیرۆك- بەرهەمی هەڵبژاردەی جۆراوجۆری لە کارنامەی چالاکییە هونەرییەکانیدا هەیە، بەرهەمگەلێکی وەك (چاوەڕوانی)، (ژێر پەرچەمی سور)،(ئۆقیانووسی وشەکان)،(زاوا)یە. ناوبراو کە هەنوکە مامۆستای بواری ئیتیکی نوسینە لە زانکۆی (ئاموری) ی ئەتڵەنتا، تائێستا کۆمەڵە خەڵاتێکی نمونەی پۆن- فاکنەر، پۆن-هەمەنگوای و خەڵاتی نەتەوەیی کتێبی ئەمریکای بەدەستهێناوە. ناوبراو لە چیرۆکەکانی خۆیدا کە ڕووداوەکانی لە چین و لە سەردەمی شۆڕشی کلتوری ئەم وڵاتەدا ڕوودەدەن، پتر باس لە کۆمەڵە مەسەلەیەکی نمونەی ئینتیما، توندوتیژی و توانستە بەفیڕۆچووەکانی مرۆڤ دەکات. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر رۆژنامەیەکی ئاسیایی گفتوگۆی لەگەڵ ئەم نوسەرەدا کردووە و ئێمەش بەهۆی بڵاوبوونەوەی نوێترین کتێبی (زاوا) کە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورتە، ئەم گفتوگۆیە پێشکەش بەخوێنەرانی بەڕێز دەکەین.

********

*** بیرۆکەی (چاوەڕوانی) چلۆن لاتان دروست بوو؟ و ئایا چیرۆکە کورتەکانی تۆ سەرجەمیان و بەشێوەیەکی تەواو لەسەر بنەمای خەیاڵتان نوسراوە یاخود لەسەر بنەمای ژیانی واقیعی کەسەکان؟**

-(چاوەڕوانی) لەسەر بنەمای ئەو ڕووداوانە فۆرمەڵەبوو کە هاوسەرەکەم، کە بۆ یەکەمینجار لەگەڵ خێزانەکەیدا ئاشنابووم؛ بۆی گێڕامەوە. یەکێك لە خزمانی هاوسەرەکەم لەکاتێکدا کە ڕووخساری نادیاربوو، لە دوورەوە بینیم. هاوسەرم واناساندی کە ئەو کەسە دوای (18) ساڵ ئارامگرتن توانی تەڵاق وەربگرێت، بەڵام هەنوکە

هاوسەرێتیکردنی دووەمیشی ڕووبەرووی گرفت بۆتەوە. دواتر بەگاڵتەوە بە هاوسەرەکەم وت: بەسەرهاتەکەی کەڵکی چیرۆکێکی پێوەیە. من دەمەوێت لەسەر ئەو بنەمایە، ڕۆمانێك بنوسم. هەوڵی خۆم دا، وەلێ ئەوکاتە، توانایی و لێوەشاوەیی پێویستم نەبوو. سەرەڕای ئەوەش، ئینتمایەکم بۆ نوسینی ڕۆمان نەبوو، تا ئەوکاتەی کە لە کارێکدا دەستمکرد بە خوێندن لە نوسیندا. ناچاربووم بۆئەوەی کە کارەکەم بپارێزم، کار و بەرهەمی نوێ چاپ بکەم، پێموایە هەمان ئەو مەسەلەیە بوو بەهۆی ئەوەی کە من لە ساڵی (1994) دەست بە نووسینی (چاوەڕوانی) بکەم.

***چیرۆکە کورتەکانتان چۆنە؟ ئەوانیش بەسەرهاتی واقیعین؟**

– هەم بەڵێ و هەم نەخێر. (99٪)ی وردەکارییەکانی لە بنەڕەتا واقیعین، بەڵام خۆم سەرلەنوێ ڕووداوەکانم ڕێکخستۆتەوە.

*** ئەو سەردەمانەی کە لەسوپای چیندا بوویت، چۆن ڕابورد؟ ماوەی چەند لە سوپادا بوویت و ئەزموونەکانتان لەوێدا تا چ ئەندازەیەك کاریگەری لەسەر بەرهەمەکانتان هەبوو؟**

–من لە دوادواکانی ساڵی (1969) چوومە سوپاوە، و تاساڵی (1975) لەسوپادا خزمەتم کرد. پێموابوو جەنگێکمان لەپێشدایە، وەلێ هیچ ڕووینەدا. هەستم دەکرد وزەیەکی زۆر بەهەدەر دەڕۆن. ژنان و پیاوانێکی پڕ وزەو پڕتوانست بوون کە تواناکانیان لەوێدا بەهەدەر دەڕۆیشت. لە دیدی فیزیکی و جەستەییەوە هەلومەرجەکە زۆر سەخت و دژوار بوو، بەڵام لە لایەنی فکریەوە، نەخێر. چونکە هەموو شتەکان بەتەواوی ڕوون و ئاشکرابوو. ئێمە بەتەواوی دەمانزانی پێویستە چیبکەین، بەڵام لەلایەنی فیزیکیەوە، بەگرفت بوو و ئەوەش فێری ڕێکخستن و ئیلتزاماتی کردم.

*** لە دەسەڵات و وزەی بەفیڕۆ ڕۆیشتوو دەدوێیت، ئەمەش من دەباتەوە بۆ یادی کەسایەتی لین لە (چاوەڕوانی)دا. ئەو پاڵنەرێکی زۆر کەمی هەیە. ئایا پێتوایە (لین) لەگەڵ (شیو)دا دەتوانێت ئەم مەسەلەیە لە کەسایەتیاندا بگۆڕن؟ ئایا ئەمە بەهۆی کەمبوونی مادده سەرەتاییەکانی پاڵنەرەوەیە لە کەسایەتیاندا؟**

– من پێموایە ئەوان توانیان بگۆڕدرێن، بەڵام هەلومەرج و ژینگەی دەوروبەریان توندڕەو و ڕکەبەرانە بوو. بەو مانایەی کە ژینگە دۆخەکەی خراپتر کردبوو، ئیتر جێگایەك بۆ گەشە و پێشکەوتن نەمابۆوە بۆ ئەوان.

*** ئایا ئەم چیرۆکە ئەگەری ئەوەی هەبوو لە جێگایەکی تردا ڕووبدات یاخود بەتایبەتی تایبەتە بە کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی؟**

– ئەم چیرۆکە دەکرێ لە جێگایەکی ترو لە فۆڕمێکی تردا ڕووبدات، بەڵام کرۆکی ڕووداوەکە یەکێکەو بوونی ڕووداوێکی تراژیدی لە ژیانی هەموو کەسێکدا شیاوی وەدیهاتنە و ڕەنگە کەسێکی تریش لەڕووی هەستەکانەوە، بێ تواناو ئیفلیج بکات. ئەم ڕووداوە هەم لە جێگایەکی تری بەدەر لە چین و هەم بەسەر کەسێکی تر دەکرێ ڕووبدات. ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە نامەی جۆراوجۆرم لە کەسانی ناچینیەوە بەدەستگەیشتووە کە دووچاری دۆخی لەو شێوەیە بوون. ئەگەرچی ڕەنگە فۆڕمی ڕووداوەکان جیاوازبن، وەلێ خودی ئەوانە لێکچووشن.

*** ئایا ڕاستە کە تۆ لە شیعرەوە هاتیتە ناو جیهانی ئەدەبەوە؟ چ کاتێك هاتیتە ناو پەخشانەوە؟**

–شیعر، بەخت و چارەنووس ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. من هێشتاش هەوڵی خۆم دەدەم.

کتێبە شیعرییەکەم، زستانی ئەمساڵ چاپ دەکرێت. بەڵام ماوەیەکە کە کاتێکی زۆرم بۆ چیرۆك تەرخانکردووە. بۆ شاعیرێك، بە گرفتە کە پێوەرەکانی وتنی شیعر بخوێنێت. من دڵم دەیەوێت شاعیرێکی باش بم، نازانم دەبم یان نا، وەلێ هەوڵی خۆم دەدەم.

*** چ کاتێك دەستتکرد بە خوێندنی زمانی ئینگلیزی؟**

– دوای هاتنەدەرەوەم لە سوپا، بووم بەنەخشەکێشی کۆمپانیایەکی ڕێگای ئاسن. لەو سەردەمەدا لە ڕادیۆی لۆکاڵی شارەکەمان، ڕۆژانە بەرنامەی فێربوونی زمانی ئینگلیزی پەخش دەکرد. من گوێبیستی دەبووم و کارم لەسەر وانەکان دەکرد. بەرنامەکە لە ڕۆژێکدا ماوەی نیو کاتژمێر پەخش دەکرا. پێموابوو دواتر دەتوانم کتێبە ئینگلیزییەکان بخوێنمەوە.

وەك ئامڕازێك دەمڕوانیە ئینگلیزی، لە دوو ساڵی یەکەمی فێربووندا، لەڕاستیدا زۆر ئینتمام بۆی نەبوو. لەساڵی سێیەم و چوارەمدا بوو کە چونکە دەمەویست ئەدەبیات بخوێنمەوە، بەوهۆیەوە هەوڵم بۆ زمانەکە دەدا. دەبوایە لە تاقیکردنەوەی ئینگلیزیدا وەربگیردرێم.

*** تۆ لەلایەن چ کەسانێکەوە کارت تێکرا؟ ئەو نوسەرانەی ئارەزوومەندیان بوویت کێ بوون؟**

– کۆمەڵە کەسێکی کارتێکەربوون کە پەیڕەویکردنیان بەگرفت بوو. ساڵەها بوو کە فالکنەرم خۆشدەویست. من بەرهەمی نوسەرانی ئەمریکایم زۆر خوێندۆتەوە و ڕەنگە بەبێئاگاییەوە کاریگەرییەکی زۆریان تێکردبم، تەنانەت لە فالکنەریشەوە. تائێستا بەرهەمەکانی فالکنەرم زۆر ڕاڤەکردووە، بێگومان نوسەرانی ڕووسیشم خۆشدەوێت، بەتایبەتی چیخۆف و تۆڵستۆی.

*** کاتێك مرۆڤ بەزمانێکی تر دەدوێت، کەسایەتیەکی جیاواز لەخۆی نمایش دەکات، تاکاتێك کە بەزمانی دایکت بدوێی، ئایا ئەم مەسەلەیە لەکاتی نوسینیشدا بەوشێوەیەیە؟**

– بێگومان، مرۆڤ کاتێك زمان دەگۆڕێت، ناچاردەبێت خۆشی بگۆڕێت. من بە چینیانە بیردەکەمەوە، وەلێ بە ئینگلیزی دەنوسم.

*** وانەوتنەوە تا چ ئەندازەیەك کاریگەریی لەسەر کارەکەتان هەبووە**

–هەستی جۆراوجۆرو ئاوێتەبووم لەو بارەیەوە هەیە. لەلایەکەوە، شتی زۆر فێردەبم، بەتایبەتی کاتێك ئەدەبیات دەڵێمەوە، ناچارم لەسەر ئەو مەسەلەیە کاربکەم. بۆئەمەش، زیاترو زیاتر، نوسین دەناسم. لەلایەکی ترەوە، کاتێك لە هۆڵەکانی ئیتیکی نوسیندا وانەدەڵێمەوە، خۆم دەبمە سەرچاوەی خۆراکی خوێندکار. هەمان وزەو توانایەك کە بۆ نوسینی ڕەشنووسی کاری خۆم پێویستمە، لە کارەکانی ئەواندا بەکاریدەهێنم. ڕەنگە زۆر تاقەتپڕوکێن بێت، وەلێ لەکۆی ئەمانەدا پێموایە وانەوتنەوە، ڕێگایەکی شایستە و باش بێت بۆ موچە و بەڕێوەچوونی ژیان. پێموایە وانەوتنەوە ئەوەی فێرکردووم کە دەربارەی کارەکانی خۆم کەمتر جدی بم...

***ئایا بەدەستهێنانی خەڵاتی پۆن-فاکنەر و خەڵاتی نەتەوەیی کتێبی ئەمریکا، نوسەرایەتیتانی خستۆتە ژێر کاریگەرییەوە؟**

–بەڵێ، ئەمە فشاری زیاتری خستەسەرم. بەرلەوە، مرۆڤێکی گومناو بووم. دوای ئەوە هەموو شتێك جیاواز بوو، خەڵك بەشێوەیەکی تر دەیانڕوانی.

*** ئایا ئێستا بەرهەمی ترت لەبەردەستدایە کە ڕووداوەکەی لە چین ڕوودات؟**

–بەڵێ، لەسەر ڕۆمانێك كاردەكەم كە ماوەیەك لەمەوپێش دەستم پێكردووە و پێویستە تەواوی بكەم.

***وەك ئۆستادێك، سەختە كە وەڵامێكی پوختی ئەم پرسیارە بدەیتەوە، بەڵام گرنگترین ئامۆژگارییەك كە دەكرێ بە نوسەرێكی لاو بدرێ، چییە؟ و تۆ خۆت، چۆن دەنوسیت؟**

– ئارام و لێبوردە بێت، ئارامگرتن؛ كلیلی هەموو شتێكە. كاتێك كە كاتم زۆرە، واتا لە هاویندا نزیكەی كتێبێك دەنوسم، دواتر كاتێك كە وانەدەڵێمەوە، كتێبەكە پاكنوس دەكەم. لەگەڵ ئەوەی كە هەموو ڕۆژێك كاردەكەم، وەلێ ئەمە بەومانایە نیە كە هەموو ڕۆژێك دەنوسم، ئەم كارە وەدینەهاتووە و كاتێكی زۆری دەوێت. كاتێ كە دەستنوسی سەرەتایی كتێبێك دەنوسی، تا تەواوبوون؛ ماوەیەكی زۆری لەنێواندا هەیە. هەندێ كات، هەفتە و مانگ بەفیڕۆ دەڕۆن، چەندین جار ئەم كێشەیە هاتۆتەپێشم. (18) لاپەڕەی كتێبێكم نوسی، دواتر بینیم كە زۆر بێسوودە و دەبێ سەرلەنوێ لە سەرەتاوە دەستی پێبكەمەوە. لەبەر ئەو هۆیەیە كە دەڵێم؛ ئارامی و لێبووردەیی كلیلی هەموو شتێكە.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی (جام جم)، ژمارە (1209)، لاپەڕەی (فرهنگ و هنر).

# پەسەندکردن

**مێگهان ماکدونال**

**له ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن**

**نیکۆلینا پڕ بە فراوانی بێ سنووری زەریا ڕاکشاوەکەی بەردەمی هەڵیدەڕوانی. زەریایەکی مەنگ کە ڕووبەرەکەی هەر لە شووشە دەچوو. مانگیش ڕۆشن بەو ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە و تریفەی بەسەر خاك و خۆڵی ئەو دەوروبەرەدا دەپرژاند، بە جۆرێك کە ترس و بیم لە دڵان ببارێنێ. هێشتا هەردوو "ئەستێرەی مانگێ" لە بەرامبەریدا هەڵنەهاتبوون، بگرە دوو سەعاتی دیکەیان دەویست کە ئەوانیش بدرەوشێنەوە. نیکۆلینا هێشتا کاتی لەبەردەمدا هەبوو.**

**هەردوو باڵەکانی فش کردەوە و تا ئەوپەڕی بەرز و ئاوەڵای کردن. دووباڵ کە دوو بەقەد گەورە و زۆریش بەهێز بوون. لە ژێر تریفەدا پەڕ و باڵەکانی دەدرەوشانەوە.. ڕۆشن هەروەکو زیو. پەنجە چڕنوکدارەکانی بە نێو قژە ڕەشەکەیدا هێنا و پاشان هەردوو شاخە چکۆلەو ڕەپ ڕواوەکانی سەر تەپڵی سەری خۆی سەح کردەوە.**

**نیکۆلینا هەناسەیەکی هەڵکێشا و پاشان هەردوو دەستی بە خۆیدا شۆڕ کردەوە. سەری هەڵبڕی و بۆ دڵنیایی خۆی لە مانگەکە ڕاما. ئەمشەو بۆ یەکەمین جارە کە دەتوانێ باوکی و پیاوەکانی ببینێ. سەری نەوی کرد، بە دوو چاوی مەل ئاسا لەو تەختی لمە لووسەی ڕوانی کە هەموو ڕۆخانەی زەریاکەی داگیر کردبوو. زۆر جوان بیری کەوتەوە کە چۆن چۆنی کەس و کاری دایکی ڕووبەڕووی وەستان و بەرەنگاری بوونەوە. تا هەنووکەش هاوار و قریشکە و قاقایان لە گوێیدا دەزرنگایەوە. هێدی هێدی جێ برینەکانی هەر هەموو ئازای جەستەی ساڕێژ دەبوونەوە، ئاخر ئەوەندە بەر گاشە بەردەکان کەوتبوو هەر هەموو گیانی زام و برین بوو.**

**زۆر لەسەرخۆ کەسێك لە دواوە بانگی کرد:**

**"نیکۆلینا؟"**

نیکۆلینا خەنییەوە و یەکسەریش دەنگەکەی ناسییەوە. پاشان بە نەرمی.. بەڵام بە دەنگێکی دلێرەوە لێی پرسی:

"ئێدواردن.. ئەوە لێرە خەریکی چیت؟"

ئێدواردن بە هەردوو دەست چڕنوقەکانی نیکۆلینای گرت و پێی وت:

"دەبوو جارێکی دیکە بتبینمەوە. نەمتوانی دووربم لێت."

بە دوو چاوی شینەوە، شینێکی تۆخ لەو ملوانکەیە ورد بۆوە کە گەردنی نیکۆلینا-ی ڕازاندبۆوە، ئەو ملوانکەیەی کە هەر خۆی پێشکەشی کردبوو، دیاری و گەواهی خۆشەویستی ئێدواردن بۆ نیکۆلینا. دەقاودەق پێش ئەو کاتە بوو کە ئیدی چیتر نەیانهێشت پێی بخاتە خاکی ئەوانەوە، ئیتر هەمیشە پیاوەکانی باوکی نیکۆلینا ڕێیان پێ دەگرت و ئەو دەڤەرەیان لێ حەرام کرد چونکە گوێی بە هیچ نەدەداو فەرمانەکانی دەشکاندن.

بە دووچاوی تەڕ و پڕ لە تاسە و بریقەوە.. زۆر ناسکانە لێی پاڕایەوەو وتی:

"باوکم و پیاوەکانی هەر ئێستا دەگەنە ئێرە. دەبێ هەر ئێستا بڕۆیت و ئێرە بەجێ بێڵیت."

"پیاوەکانی باوکت نامترسێنن. منیش بۆ خۆم جەنگاوەرێکی ئازا و نەبەردم. من دەتوانم هەر هەموویان تێك بشکێنم و تەفر و تونایان بکەم."

"هەروەکو ئەو سەربازانەی کەوتوونەتە دوای باوکم؟"

ئێدواردن زۆر عاشقانە لە نیکۆلینا-ی ڕوانی. لەو ئان و ساتەدا پێستە کاڵەکەی لە ژێر ڕۆشنایی ئەستێرەی "دووانە"دا بە باق و بریقێکەوە دەبریسکایەوە.

نیکۆلینا سەری هەڵبڕی و لە تاریکایی ئاسمانی ڕوانی.. پاشان سەری نەوی کردەوە و لە خۆشەویستەکەی ڕاما و پێی وت:

"دەبێ هەر ئێستا بڕۆیت. هەر ئێستا هەموویان دەگەنە ئێرە."

قژە کاڵەکەی لەسەر چاوە تیژەکانی وەلاداو بە چرپەوە پێی وتەوە:

"گەرەکە بڕۆی.."

ئێدواردن بەرلەوەی بە ناسکی لێوەکانی ماچ بکات.. پێی وت:

"نیکۆلینا.. وەرە و لەگەڵما ڕاکە."

"من ناتوانم.. ناچارم و هەر دەبێ لەگەڵ باوکمدا بگەڕێمەوە."

ئێدواردن لە ناکاو، دوور، ئاوڕێکی دواوەی دایەوە، هەردوو گوێی قوڵاغ کرد تا زرم و کوتی سمی ئەسپەکان ببیستێ کە بەر دار و بەرد دەکەوتن.. پاشان پێی وت:

"من چاك دەزانم کە تۆ لەوێندەرێ، لەگەڵ باوکت و پیاوەکانی ئاسوودە نابیت.. ئەوێ شوێنێکە تۆ حەزی پێ ناکەی."

"وا چاکە هەر ئێستا بڕۆیت. ئەگەر باوکم هەردووکمان بەیەکەوە ببینێ، من دڵنیام کە دەتکوژێ."

ئێدواردن هەردوو چنگە چڕنوکدارەکانی نیکۆلینا-ی گوشی و وتی:

"بەڵام بەڵێنم پێ بدە کە ئەگەر پێت ڕازی نەبوو.. وەرە و لەگەڵ مندا ڕاکە.. با بەیەکەوە بین."

تا دەهات بەدەم بای غارەوە حیلە و پڕمە پڕمی ئەسپەکان بەرزتر دەبۆوە.. زۆر لەسەرخۆ و بە هێمنی نیکۆلینا لێی پاڕایەوە:

"دەتۆ بەس بڕۆ.. ئێرە جێبێڵە!"

"بەڵێنم بدەرێ نیکۆلینا.. بەڵێن."

نیكۆلینا بە سۆزێكەوە ماچی كرد و هەوڵیدا دووری بخاتەوە و پێی وت:

"بەڵێنت دەدەمێ.. بەڵێن بێ."

نیكۆلینا بینی كە چۆن بەسەر لمەكەدا و زۆر خێرا و چوست دوور دەكەوێتەوە. هەرزوو بوو بە خاڵێكی ڕەش تا دەهات دوور و دوورتر دەكەوتەوە. هەناسەیەكی هەڵكێشا و ڕووەو لای ڕەوە ئەسپەكان ڕووی وەرگێڕا كە بەدەم بای غارەوە دەهاتن. نیكۆلینا قیت وەستابوو، سەری بەرز و هەردوو شانی بە پشتەوەدا كەوتبوون. شنەبایەكی نەرم گەمەی بە قژی دەكرد و كراسەكەی دەخستە سەر نەرمە شەپۆلان.

كابرایەكی كەتەو زەبلەكی و ماسولكەدار سەرێكی بەرزكردەوە وەك ئەوەی بە پیاوەكانی بڵێ بوەستن.. پاشان بە دەنگی بەرز هاواری لە زەلامێكی دیكە كرد:

"مەستۆ...!"

نیكۆلینا نیگای كرد و هەر بە دڵ ناسییەوە زانی ئەو كابرایە باوكیەتی. كابراش پڕ بە هەردوو چاوە زۆر شینەكانییەوە لە سەرتاپای كچەكەی ڕوانی. "با" قژە ڕەش و لووسەكەی كابرای هەڵدەدایە دواوە، هەردوو قۆچەكانی گەلێ گەورەتر بوون لە هی كچەكەی، كەوانەیی بۆ پشتەوە هەڵگەڕابوونەوە.

بە دەنگێكی بەهێز و تیژ وەك نیگاكانی، بەڵام لەگەڵ دركاندنی هەر وشەیەكدا زمانی تەتەڵەی دەكرد، بێ ئەوەی لە زمانی كچەكەی تێبگات.. پێی وت:

"كەواتە.. تۆ كچی منی؟"

ئەم لە زمانی باوكی تێگەیشت و هەر بەو زمانەش وەڵامی دایەوە، ئەوەشیان كاریگەری لەسەر باوكی هەبوو.. بەڕادەیەك كە نیكۆلینا پێی ئاسوودە و ئارام بوو:

"بەڵێ گەورەم.. من كچی تۆم و تۆش باوكمی."

"تۆ بەتەمای كە بێیتە ناو خێڵەكەمان و لەگەڵ ئێمە بژی؟"

بەڕێزەوە سەری لەقاند و نوشتایەوە.

باوكە كەوتە خوراندنی ملی ماسولكەداری ئەسپە ڕەش و بڵندەكەی.. پاشان لە كچەكەی پرسی:

"بۆچی وا هەست دەكەی ئێمە حەز بە كەسێكی وەك تۆ دەكەین بێتە ناومان گەرچی دەزانین كە دوو ڕەگیت؟"

نیكۆلینا بەو پرسیارە زۆر بریندار بوو، بەڵام زانی كە باوكی و پیاوانی ئەو خێڵە زۆر دڵڕەقن و هیچ ڕێزێكیان بۆ ئافرەت نییە. نەیهێشت هیچ هەست و نەستێك بەسەر ڕووخسارییەوە دەربكەوێ، ڕێك سەیری ناوچاوی باوكی كرد، پاشان وەك ئەوەی باوكی تاقیبكاتەوە.. لێی پرسی:

"ئەی چی وای لە تۆ كرد هەست بكەی كە من حەز بكەم لەگەڵ كۆمەڵێك لە پیاوی دڕندە و بەربەری و شەڕانیدا بژیم؟"

سەربازەكانی باوكی كەوتنە مڕەمڕ و وەك ڕەشەبا دەیانلووراند و قسەكانیان لەناو یەكدیدا دەخنكان. نیكۆلینا هەستی دەكرد كە ئەم قسانە جگە لە دەربڕی ڕق و تووڕەیی هیچی دیكە نین.

باوكی ئەو گەمەیەی فەرامۆش كرد و گوێی پێنەدا، ئەو گەمەیەی كچەكەی دەیویست لەگەڵیدا دایبمەزرێنێ.. پاشان لێی پرسی:

"دەی كەواتە تۆ بۆچی داوا دەكەی لەگەڵ ئەم دڕندانەدا بژیت كە ئێمەین..؟"

"من تەنها دەمویست ئەو پیاوە بناسم كە بە باوكی من ناسراوە. زۆر شت هەیە سەبارەت بە خۆم

کە نایزانم و تێی ناگەم. وامزانی لە دوای ناسینی تۆ ئەو هەموو ڕاز و نهێنییانەم بۆ ئاشکرا دەبن."

دڵی نیکۆلینا کوتە کوتە بە پەلە لێی دەدا. ئەم دەیزانی شکاندن و سووکایەتی پێکردنی ئەو کۆمەڵە پیاوە، عاشقە شەڕە، ئەوپەڕی بێ ڕێزییە، دەشیزانی گەروا بڕوا لەناو ئەو خێڵەدا جێی نابێتەوە.

باوکی سەری لەقاند، بە پانتایی زەریا مەنگەکەدا ڕوانی، بە ئاستەمێکیش وردە شەپۆڵەکان دامێنی کراسەکەیان ماچ دەکرد.

"من بڕوا ناکەم تۆ بەکەڵکی ئەوە بێیت لەناو ئێمەدا بژیت." ئەمەی وت و سەیری دەست و باڵەکانی نیکۆلینا-ی کرد.. پاشان قسەکەی تەواو کرد:

"من چی بڵێم.. تۆ شتێکی زۆر سەیر و سەمەرەی.. بوونەوەرێکی زۆر عەنتیکەی."

سەربازەکان قاقا پێکەنین، تانەو تەشەری ئەوەیان تێدەگرت کە چەندە ناشیرین و گێل دیارە.

"دەتوانی بڵێی من تۆم خۆش دەوێ و حەز دەکەم بتناسم. تۆ دەزانی من منداڵی تۆم؟ لە خوێن و گۆشتی تۆم. تۆ منت خولقاند.. دەزانم من لە توخمی ئادەمیان ناچم و لە ئێوە ناکەم.. بەڵام تۆ منت وەك یەکێ لە منداڵەکانت قەبوڵ کرد. ئەوە گوناهی تۆیە کە من وا دەعەجانی و عەنتیکە خوڵقاوم!"

بەدەم ئەم قسەیە قیژاندی و سێ ڕیز فرمێسك بەسەر کوڵمە سوورهەڵگەڕاوەکانیدا دەهاتە خوارێ.. پاشان تێهەڵچۆوە:

"ئەوە تۆ و پیاوەکانت ئاواهی ڕووبەڕووی شتەکان دەبنەوە؟ هەڵە و گوناه دەکەن و پاشانیش لێی ڕادەکەن!"

دەم و چاوی بێ بەزەیی باوکی یەکپارچە بوو بە گرژی و دەمار.

"تۆ هەرگیز لەناو ئێمەدا جێت نابێتەوە.. هەرگیزا و هەرگیز پەسەند ناکرێی! تۆ جۆرێك خوڵقاویت و چەشنە توخمێکیت کە کەس حەزت پێ ناکات."

زۆر دڵڕەقانە و بە تاڵییەکەوە ئەم قسەیەی فڕێداو پاشان پشتی کردە کچەکەی، ئاوزەنگی لێداو ئەسپەکەی کەوتە غار، بێ ئەوەی یەك ئاوڕ بداتەوە، سەربازەکانی زۆر نزیك لە باوکی نیکۆلینا بەسەر ئەسپەکانیانەوە دەلەنگینەوە.

دوای ئەوان نیکۆلینا بەدەم گریان و زریکەوە هاواری دەکرد:

"من هیچ توخمێکم نییە.. نە ئادەمیم و نە دەعەجانی."

نیکۆلینا کەوتە سەر هەردوو ئەژنۆ، بە دەم گریانەوە هەنسکی هەڵدەدا. سەری ڕووە و ئاسمانی مەخمەلی هەڵبڕی و قریشکاندی. هەموو دونیا لەتاو ئەو قریشکە و هاوارە بڵند و ناقۆڵایە کەوتە لەرزین. لەو ساتەوەختەدا دڵی پارەپارە دەبوو. هەموو خۆزگەی ئەوە بوو خۆشیان بوێ وەك خۆی کە هەیە، نەك وەك چ ڕەنگ و رووخسار و ئاکارێکەو چۆن دەنوێنێ. حەزی دەکرد ئاوا ناشیرین سەیری نەکەن و وەها قێزەوەن نەیبینن، حەزی دەکرد دۆستانە بەڕوویدا پێبکەنن و لە چاوی هەمووواندا خۆی ببینێ و بیناسنەوە.. حەزی نەدەکرد وەها گرژ و مۆن بێزی لێ بکەنەوە. بەڵام تەواو.. نیکۆلینا تێگەیشت کە هەرگیزاو هەرگیز هیچ خۆزگەیەکی نایەتە دی و هیچ کام لە ژن و پیاوەکانی خێڵی باوکی پێی ڕازی نابن. نیکۆلینا زانی کە تاماوە هەردەبێ ئاواهی: بوونەوەرێکی

سەیر و سەمەرە و.. هەر ئاواهی بێ توخم و دەعەجانی بێ.

ئێدواردن هەردوو باسکی تێ وەرێناو لە باوەشێی کرد، دیسانەوە نیکۆلینا خۆی پێ نەگیرا و فرمێسکی باراند، سەری خستە سەر شانی ئێدواردن. دەیتوانی لەگەڵ ئەودا ڕابکا و ئێرە بەجێبێڵێ، بەڵام بۆ هەر کوێ بچێ، خەڵکەکە لە ئاکاری سەیر و هەیکەلی نائاسایی و عەنتیکەی ورد دەبنەوە و بە نەفرەتی دەکەن. ئێدواردن لەو خەڵکە دەیپارێزێ، بەڵام خۆ ناکرێ هەمیشە ئێدواردن لەگەڵیا بێ. ئەم خۆزگەی دەخواست کە باوکی و خێڵەکەی وەکو خۆی پەسەندی بکەن و لەناوخۆیاندا جێی بکەنەوە، بەڵام هەرگیزا و هەرگیز ئەوەیان مەیسەر نابێ. ئەو بۆ خۆی بوونەوەرێکی بەدفەساڵ و دەعەجانی بوو.. هەموو بەدفەساڵ و دەعەجانیەکانیش زۆر ناشیرینن.

بە دڵ و بە مێشك دەیویست ڕابگەیەنێ کە ئەم چی دەوێ، بەڵام کەس نەیدەتوانی وەڵامێکی بداتەوە، چونکە کەس وەك ئەو نەبوو تا تێبگا.. تەنها کەس هەر نیکۆلینا خۆی بوو لە دەردی خۆی تێبگا. ئەم تەنیا بوو.. هەتا هەتایە تەنیا، دەرکراوو دوورخراوە لە هەموو دونیا. ئەم لەم جیهانەدا لەدایك بوو، هەر لەناو ئەم جیهانەشدا دەمرێ، بەڵام مەحاڵە لەم دونیایەدا بتوانێ شاد و بەختەوەر بێ، چونکە تا ماوە لەم دونیایەدا جێی نابێتەوە و هەرگیزاو هەرگیز پەسەند ناکرێ.

سەرچاوە
*sermacdon@sympatico.com*

# دوو شیعری شاملو

له فارسییەوە: مەریوان هەڵەبجەیی

## 1-عەشقی گشتی

ئەسرین ڕازێکە
زەردەخەنە ڕازێکە
عەشق ڕازێکە
ئەسرینی ئەوشەوە کە زەردەخەنەی عەشقم بوو
چیرۆك نیم کە بمخوێنیتەوە
ستران نیم کە بمچڕیت
دەنگ نیم کە بمبیسیت
یان شتێکی وا کە بیبینی
یان شتێکی وا کە بزانی..
من خەمی هاوبەشم
هاوارکە لە من

درەخت لەگەڵ دارستان دەدوێ
گیا لەگەڵ بیابان
ئەستێرە لەگەڵ کاکێشان
منیش لەگەڵ تۆ دەدوێم
ناوت بە من بڵێ

دەستت بدەرە من
پەیڤت بە من بڵێ
دڵت بدەرە من
من ڕەچەڵەکەکانی تۆم پەیدا کردوە
بە لێوەکانت بۆ هەموو لێوەکان دواوم
وە دەستەکانت ئاشنای دەستەکانمە.
لە تەنیایی ڕووناکدا لەگەڵ تۆ گریاوم
لەبەرخاتری زیندوەکان،
وە لە گۆڕستانی تاریکا لەگەڵ تۆدا جوانترین
سروودەکانم چڕیوە
هەروا کە مردووەکانی ئەم ساڵ
عاشقترین زیندوەکان بوون.
دەستت بدەرە من
دەستەکانی تۆ ئاشنای منە
ئەی ئەوەی کە درەنگ پەیدابویت
لەگەڵ تۆ دەدوێم
وەك هەور لەگەڵ تۆفان
وەك گیا لەگەڵ بیابان
وەك باران لەگەڵ زەریا

وەك باڵندە لەگەڵ بەهار
وەك درەخت کە لەگەڵ دارستان دەدوێ
هەروا کە من
ڕەچەڵەکەکانی تۆم پەیدا کردوە
هەروا کە دەنگی من
ئاشنای دەنگی تۆیە.

## 2-ڕۆژێك

ڕۆژێك ئێمە دووبارە کۆترەکانمان
دەدۆزینەوەو میهرەبانی دەستی جوانی دەگرێ.
ڕۆژێ کە کەمترین سروود
ماچە و..
هەر مرۆڤێك بۆ مرۆڤێکی تر برایە
ڕۆژێك کە ئێدی دەرگای ماڵەکانیان
داناخەن.
قفڵ ئەفسانەیەکە و دڵ
دڵ تەنیا بۆ ژیان
ڕۆژێ کە مانای هەموو پەیڤێك
خۆشویستنە
تاوەکو تۆ بۆ دوا وشە
بە دوای پەیڤێکدا نەگەڕێی
ڕۆژێ کە ئاوازی هەر وشەیەك
ژیانە
من لەبەر دواین شیعر
ڕەنجی گەڕان بە دوای قافیەدا نەکێشم
ڕۆژێ کە هەر لێوێك سترانێکە
تاوەکو کەمترین سروود ماچ بێت.
ڕۆژێ کە تۆ بێی
بۆ هەمیشە بێیت و
میهرەبانی لەگەڵ جوانی یەکسان بێت.
ڕۆژێ کە ئێمە دان داکەین
بۆ کۆترەکانمان..
منیش چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە دەبم
تەنانەت ئەگەر ڕۆژێ
کە ئێدی
من نەبم..

# مەملەکەتی من لەسەر زەوییە

کۆلێت
لە فەرەنسییەوە: جەلال حەمید

### شاژنی سەر زەوی

کۆلێت لە ڕۆمانی – پێچەکانی کێڵگەی مێو *les vrilles de la vigne* – دەڵێ: "ئێوە بڕوا ناکەن من لە تەمەنی دوانزە ساڵیەوە چی شاژنێکی سەر زەوی بووم". لەگەڵ ئەوەش زۆر بە چاکی و بە شێوەیەکی ئاشکرا بەرەنگاری ساڵەکان بووەتەوە چونکە پیری هەرگیز زەفەری پێنەبردووە و قەد دووچاری نائومێدی نەبووە و گەلێ جار بە هووشیارییەوە دەیگووت: "مەملەکەتی من لەسەر زەوییە". گابرێل سیدۆنی کۆلێت لە 28ی کانوونی دووەمی ساڵی 1873 لە ناوچە دوورە پەرێزەکانی بوغگۆن و دیومۆغڤانی سەر بە سان سۆڤۆغ ئان پویسای (یۆن) کە دایك و باوکی تێدا نیشتەجێبوون، هاتۆتە دونیا. کابتن کۆلیتی باوکی خەڵکی تۆلۆنە و لە ساڵی 1859 لە ماگێنتا بریندار دەکرێ و قاچێکی دەبڕنەوەو لە تەمەنی سی ساڵیدا بەناچاری دەبێتە باجگرەوەی گوندەکان. سیدۆنی لاندۆ – سیدۆ–ی دایکی کە خەڵکی بوغگینۆن بوو، لە شووی یەکەمیا ژۆلێتی کچە قژ درێژ و ئاشێلی کوڕی دەبێ و لە دووەم لیۆبۆلدی بە لیۆ نازناو و کۆلێتی دەبێ. دایکی ئافرەتێکی هەڕەمەك و بەخشندە دەبێ، سۆز و ئالوودەیی سەرجەم لایەنەکانی ژیان و دانایی سروشتی خۆی بۆ کچەکەی دەگوازێتەوە. نووسەری – پێچەکانی کێڵگەی مێو – بە ووردی ئەمە بۆ هاوڕێیەکی دووپات دەکات: "من بە وولاتێك کە لێی دوورکەوتوومەتەوە، بێهوودە لە گوندێکی کەمێك خەماویدا بۆی دەگەڕێم کە دارستانەکان بە تاریکی دایدەپۆشن. گووندێکی ئارام و هەژارە کە دۆڵێکی شێدار و شاخێکی شینباوی ئەوتۆی هەیە تەنانەت خۆراکی بزنەکانی بۆ دابین ناکرێ". لە کاتێکدا خێزانی کلۆدین و سیدۆ بەشێوەیەکی لەیاد نەکراو باس لەو منداڵیە گوندنشینیە دەکەن کە کۆلێت لە سۆنگەیەوە فێری بیستنی هەموو شتێکی نێو سروشتی بزوێنەر و ژاوەژاو و گۆرانی و هەڵبەز و دابەزی زەردەواڵە

پشت مەخمەڵیەکان دەبێ و لە هەموو کەس پتر دەڕوانێتە گوڵ خونچەی ژاکاو و ڕەنگی زەردباو و جوانی ئاسمان.

## چەپکێکی گەشاوە

خودی کۆلێت لەگەڵ فۆرمەلە دانسقەکەی – دەرکەوتنی بەرەبەیان – گەلێ کۆك و تەبا دەبێ کە تیادا باسی سیدۆ دەکات و ماوەی سێ چارەکە سەدە ماندوونەناسانە ناوبانگ دەردەکات. ئاخۆ ئەم بەرهەمە دەوڵەمەندە لە سەرچاوەی – چەپکی گەشاوەی هەزار گوڵی – هۆنراوەکەی بۆدلێرەوە سەری هەڵنەداوە؟ پاش چەند ساڵێك خوێندن لە قووتابخانە کۆلێت بەڕادەیەکی کەم شێوەو کەشوهەوای ڕۆمان دەبەخشێتە بەرهەمی کلۆدین. کۆلێت لە تەمەنی بیست ساڵاندا دەبێتە هاوسەری کەسایەتی پاریسی ئانغی گۆتێ فیلاغ کە بە نازناوە تایبەتیەکەی خۆی "ویلی" ئیمزا لەسەر هەرچوار بەرگەکەی کلۆدین – 1900–1903 – تۆمار دەکات. کۆلێت لە بەرهەمی – ڕاهێنانەکانم، *mes apprentissages*، 1936 – ڕەخنە لە وتارە بەراییەکانی دەگرێ و بیرۆکەکانی بە سادەیی لەقەڵەم دەدات، بەڵام لە ساڵی 1904 یەکەمین – دیالۆگە ساویلکەکان – بەناوی خۆیەوە بۆ ف.جام بڵاودەکاتەوە. جیابوونەوە پڕتاوەکەی لە ساڵی 1906 دەبێتە سروشبەخشی بەرهەمەکانی – سۆزی تەریکبوو، 1907 –و– پێچەکانی کیڵگەی مێو، 1908 –و– ئاوارە *Vagabonde*، 1910 بۆیە پاشان لە چوارچێوەی میوزیکی هۆڵ ژیانێکی ماندوو و پەرتەوازە دەباتە سەر. لە ساڵی 1912 شوو بە ئانغی دوژوڤنێل دەکات و پاشان لێی جیا دەبێتەوە. کچەکەی کە لە ساڵی 1913 لەدایك دەبێ لە ڕۆمانی پرۆڤانسی سیحراوی *Bel Gazou*– بەرجەستەی دەکات. بە درێژایی ماوەی جەنگ کۆلێت لە ئیتالیاوە بە تایبەتی ڤینیسیا کۆمەڵێك هەواڵ و بەرهەمی بەپێز ڕەوانە دەکات کە دەبێتە مایەی سەرنجی مارسیل پروست. بەڵام لە کاتی بەرپابوونی ئاشتیدا قۆناغی نووسینی شاکارەکان دەسپێدەکات کە ڕەگەزەکانی ئۆتۆبیۆگرافیای تیا بەکاردەهێنێ. پاشان کۆمەڵێك تاوتوێکردنی ئاکاری لە بەرهەمەکانی وەك –ئازیز، 1920 –و– کۆتایی ئازیز، 1926 –و– گەنمی نێو گژوگیا، 1923 – دەخاتە ڕوو. لە ڕۆمانی – ماڵی کلۆدین، 1922 – و– دەرکەوتنی بەربەیان، 1928 – وردبوونەوەیەکی شاعیرانەی بەرفراوان ئاوێتەی یادەوەری و دیمەنەکانی ناوچەی بوغگۆن و پرۆڤانس دەکات. بۆ یادکردنەوەی دایکی لە ساڵی 1929 قەشەنگترین بەرهەم لە ژێر ناونیشانی – سیدۆ– ئەنجام دەدات.

## سەرکەوتن

لەگەڵ هاتنی ساڵانی سیەکان چارەکە سەدەیەك لەپڕ بەرهەمترین و دەگمەنترین کاری نووسەرێکی ئەم سەدەیە دەسپێدەکات کە لە ڕێگەی ئیلهام و سروشی جۆراوجۆر پەرەدەسێنێ لەوانە: بەندیخانە و بەهەشت، 1932 –و دوو ڕۆمانی بواری غیرەکاری – پشیلە، 1933 –و– دیۆ، 1934 –و– ژۆلی دو کاغنیلۆن، 1941 –و– پاریس لە پەنجەرەکەمەوە، 1942 –و– ژیژی، 1943 –ن. لە ساڵی 1949 ڕۆمانی – چرای شین، *Le Fanal bleu* دەردەکەوێ کە بۆ هەمیشە تیشك دەخاتە سەر ڕووخسارە نووشتاوەکەی نووسەر بەسەر مێزی نووسین و پشیلە خۆشەویستەکانی. گەرچی ئێمە بەردەوام نازناوی کولێتمان لێنابوو، لە ساڵی 1935 دەبێ بە مەدام مۆریس گودوکێ لە

ناوجەرگەی پاریس لە پاڵی غۆیال نیشتەجێ دەبێ. گودوکێ ئەندامی ئەکادیمیای شاهانەی بەلجیکا و ئەکادیمیای گونکوغ و ئەفسەرێکی پلەداری جۆقی سەربازی بوو. کۆلێت لە لووتکەی سەرکەوتندا بوو کە لە سێی ئابی ساڵی 1954 کۆچی دوایی کرد. گەر مردنی کاریگەری گەورەی کردبێتە سەر جەماوەرێکی بەرفراوان، خۆی پێناچێ هەرگیز لە مردن ترسابێ و بۆ ئەو مەبەستەش خوازیار بوو شوێن نیشتەجێ پرۆڤانسیەکەی بێتە دوا مەنزڵگە. لە ساڵی 1928 لە تویێی ڕۆمانی – دەرکەوتنی بەربەیان – دەڵێ: "هەندێ جار لە ئاکامی بیرکردنەوە دەگەیشتمە بڕوایەك کە بەشەکەی تری ژیانم بڕێکی کەم لە سەنگینی و دڵەڕاوکێی پێ بەخشیووم سەبارەت ئەوەی کە دواتر دێتە ڕێگام.. ئەمە بیرۆکەیەکی بەرتەسك و تراویلکاوییە. مردن جێگای بایەخم نیە و هیچ گوێ بە مردنی خۆم نادەم".

## هۆنراوەو ڕاستی

کۆلێت خۆی خودی ژیانە و زۆر بە هوشیارییەوە دەکەوتە ڕەتکردنەوەی ئەو خەم و پەژارەیەی کە پەکی دەخست و ئەو سازشەی سەرسامی دەکرد. لە ڕوانگەیەوە ووشە لە بۆتەی تەڕو پاراوی و نوێخوازی بەردەوام هەست دەبزوێنێ. کاتێك کە باسی بۆن و تام و دیمەنێك دەکات تەنها ناوەکانیان دیاری ناکات بەڵکو ژیانیان وەبەر دەنێ، پێدەچێ سەرچاوەی ئەو –فوارە سیحراوییانەی – هەڵگۆزیبێ کە ئامادەگی لە – گۆرانی لیریکی و بالاد–ی ڤیکتۆر هیگۆدا هەبوو کە لە منالییەوە گەلێ بەو ستاندالە سەرسام بوو و گەر بە دیدێکی پەرۆش و دۆشداماو لە گەردوونی بڕوانیبا ئەوا وەك ئەوان لەودیو واقیعەوە هەستی بوونی نادیاری بەرجەستە دەکرد و هەروەها بێ پەرواو بە شێوەیەکی ئاشکرا دەیڕوانیە زیندووکردنەوەی بوونەوەران. سەرجەم لایەن و گرفتەکانی خۆشەویستی لە تویێی ڕۆمانەکانیا وەدەردەکەوێ: گرفتی هەرزەکاری لە ڕۆمانی – گەنمی نێو گژوگیا، *Leble enherb* – و ئازار و ئەشکەنجە فەوتێنەرەکانی غیرەکردن لە ڕۆمانی – دیۆ– و کارەساتی ژن و مێرد لە ڕۆمانی – کشانەوەی سۆزداری، *Le Retraite Sentimentale* –و پەیوەندییە نهێنیەکان لە ڕۆمانی – ئەم خۆشیانە، *ces plaisirs* –و هاودژی پڕ لە ئەشکەنجە لە ڕۆمانی – ئازیز و کۆتایی ئازیز – و ئاکام هێمنی لە – دەرکەوتنی بەربەیان–.

## دانابیەکی سروشتی

گەر بێتو کولێت لاوازی و هەڵە مرۆییەکانی فەرامۆش نەکردبێ و بێ چەواشەکاری و حەشاردان وەسفی کردبن ئەوا ڕووبەڕووی ئەفرێنراوە تایبەتیەکانی سۆز و زیندووەکان هەندێ جار ستایش و بەردەوام هاوڕێیەتی دەنوێنێ. کەمتەرخەمی سەبارەت بیروباوەڕە ئایینیەکان دەردەبڕێ و سۆفیگەری تەواو پشتگوێ دەخات کە تیادا ڕۆح لە شتی نزم و بێ کەڵك جیادەکاتەوە بۆ گەیشتن بە چەند بەهایەکی ڕاستەقینەی وەك ئالوودەیی و لێبووردوویی و چێژی جوانی بەردەوام و تەنانەت لەناوچووش و قبووڵکردنەوەی پاکبوونی جیهان و خود. ئەم یومانیزمە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەن گەورە و ئاشکرا دەبوو، یارمەتیمان دەدا بەیەك کەڕەت لەم بەرهەمەیدا دەرك بە کۆڵێك تێبینی ئاشکرای خۆش و هاوتەریبی و دانایی بەرین کە چەشنی لافۆنتین لەگەڵ تەنزدا ئاشنا دەبێت. بەجۆرێك موعجیزە پەیدا دەبێ و

تێڕوانینێکی توندوتیژ بۆ واقیع و پەرچدانەوەیەکی دروست و دەنگدار سەرهەڵدەدات کە لە ڕوانگەی خۆی و مۆنتێن واقیع خۆشبەختانە و بەشێوەیەکی سروشتی تێکەڵی ژیان دەبێت.

## یارییە قەدەغەکان

لە باخچەکەدا کۆلێتی حەوت ساڵان و لیۆی هاوڕێ بچکۆلە و برای تاقانە و ڕەسەن لە سۆنگەی چەند داهێنانێکی سەیر و ناپێشێلکار، کوڕێکی لاو ڕوانینێکی فرە شاعیرانە لەمەڕ ئەم جیهانە منالآنەیە پێکدەهێنێ کە گواستنەوەو ڕاگوێزانی واقیع تێکەڵ بە ڕەگەزەکانی ڕاستی ڕۆژانە دەکات.

ئەستۆنیفرۆنك پۆنسکۆپ کە لە ژیاندا بوو چۆن بوو؟

براکەم سەری دانەواند و دەستەکانی بە دەوروبەری هەردوو ئەژنۆی لکاند بە لاچاو کەوتە ڕوانین بۆ ئەوەی بە ووردی شوێنە دووردەستەکانی تێڕوانینە مرۆییە بەراییەکان و هێڵە لەبیرچووەکانی ڕوخساری ئەستۆنیفرۆنك بپشکنێ.

—تەپڵ لێدەری شار بوو. بەڵام لە ماڵەکەیدا ناوپۆشی کورسی دروست دەکرد.

کەسێکی کەتەو زەبەلاح بوو! خوا بیگرێ جێی بایەخێکی ئەوتۆ نەبوو. مەی دەخواردەوەو ئازاری ژنەکەی دەدا.

—کەوابێ بۆچی لەسەر کێلەکەی نووسیوتە: باوك و مێردێکی ڕەفتار باش؟

—چوونکە خەڵکی کە زەماوەند دەکەن ئەو جۆرە قسانە دەخرێنە بەرباس؟

—کێی تر لە دوێنێوە مردووە؟

—خاتوو ئێگرێمیمی پیولیتیەن.

—خاتوو ئێگرێمیمی کێ بوو؟...

—ئیگرێمیمی لەگەڵ پیتی (ی) کۆتایی. خاتوویەکی ئەوتۆی هەردەم ڕەشپۆش کە دەسکێشی خوری لەدەست ئەکرد.. براکەم ماتبوو و بە هۆی لێکخشانی دەستکێشەکان بە نینۆکەکانیەوە ددانەکانی کیڕەیان لێوەهات. ئەو تەمەنی سیانزە و منیش حەوت ساڵان بووم. بە قژە ڕەشە قرتاو و غەماوییەکەی و چاوی شینی زەردباوی لە مۆدیلی گەنجێکی ئیتالی دەچوو و تاڕادەیەکیش نەرمونیانوو تەواو کۆڵنەدەر بوو.

—بەم بۆنەیەوە، ووتی: سبەی کاتژمێر شەش ئامادەبە. کارێکمان هەیە.

—کاری چی؟

—کارێك بۆ خزمەت و حەواندنەوەی گیانی لۆگستۆ تروترومێك.

—باوکە یاخود کوڕ؟

—باوکە.

—کاتژمێر شەش ناتوانم دەچمە قوتابخانە.

—خوا خراپت بۆ بکات. ناتەوێ خزمەتی کەس بکەیت. لێمگەڕێ با تەنیا بم، پێویستە بیر لە کێلی خاتوو ئێگرێمیمی پولیتەن بکەمەوە. وێڕای ئەم ئاگادارکردنەوەیە کە چەشنی زەنگی فەرمانێك بوو بە دوای براکەمەوە چوینە ژووری هەڵگرتنی دانەوێڵە. براکەم چەند پارچە کاغەزێکی بڕی بە کارتۆنێکی سپی نووساند لە شێوەی کێلێکی ڕاستوڕەوان و پەیکەرێکی بازنەیی لە بەشی سەرەوە و مەزارگەیەکی لاکێشەیی نەخشێنراو بە خاچ ڕێکیخست. پاشان بە مەرەکەبی چینی چەند پیتێکی گەورەی قەشەنگی لەسەر کێلە کوورت و درێژەکان وێنەکێشا کە لە شێوازێکی مەڕمەڕی پوختدا پەشیمانی زیندووان و چاکەکاری مردوویەکی ڕاکشاوی ناڕاستەقینە و نەمر ڕادەگرێت. "لێرە ئەستۆنیفرۆنك پۆنسکوپ کە لە

22ی حوزەیرانی ساڵی 1874 لە تەمەنی پەنجاو حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، ڕاکشاوە. باوکێکی باش و مێردێکی چاك، ئاسمان چاوەنواڕی و زەوی بۆی بەداخ بوو. ئەی ڕێبوار نوێژی بۆ بکە!" ئەم چەند دێرە ڕەشە لەسەر بەردێکی جوان و بچووکی گۆڕێك لە شێوەی دەرگایەکی ڕۆمانی و ڕەنگێکی درەوشاو بە بۆیەی ئاوی تۆمارکرابوو. پایەیەك لە شێوەی ستاندی تابلۆ بە سووکی دەباتە دواوە و دەینووشتێنێتەوە.

–ئەمە کەمێك ووشکە. براکەم ووتی. بەڵام تەپڵ لێدەری شار.. من دەستبەسەر خاتوو ئێگغێمیمی دەگرمەوە. قایل بوو کە کوورتەیەکم بۆ بخوێنێتەوە: "ئای نموونەی هاوسەری کریستیان! تۆ لە تەمەنی هەژدە ساڵی دەمری، چوار کەڕەت بوویتە دایك!

ئەوان گریە وناڵەی مناڵەکانتیان نەپاراست! بازرگانیە زەرەرمەندەکەت و مێردەکەت بێهوودە بە دوای بیرچوونەوە دەگەڕێن" من وا لەوێم.

–دەسپێکێکی چاکە. لە تەمەنی هەژدە ساڵ چوار منداڵی هەبوو؟

–وەك پێم ووتی.

–ئەی بازرگانییە زەرەرمەندەکە چیدەگەیەنێ؟ براکەم دەستەکانی بەرزکردەوە.

–تۆ تێناگەی چونکە تەمەنت لە حەوت ساڵ زیاتر نیە. کەتیرەیەکی خەستم بۆ بکەرە قاپێکەوە تاجە گوڵینەی ئەڵماسی شینم بۆ گۆڕی هەردوو جمکە ئازیۆم ئامادە بکە کە لە هەمان ڕۆژ لەدایکبوون و مردن.

–ئۆ! ئاخۆ ئەوان کەسی چاکبوون؟

–زۆر چاك، براکەم ووتی. دوو کوڕی سورکەڵەبوون کە تەواو لێکتر دەچوون، فێڵێکی ترم لێکردن. دوو پایەی بڕاوم لە کۆمەڵێك کارتۆن دروست کرد و سەیری مەرمەڕەکەی سەر سەریم کرد و تاجە گوڵینە ئەڵماسەکانم پێ ڕێکخست. ئای! پیرێژنەکەم.. فیکەی سەرسامی لێداو بە بێدەنگی دەستی بە کارکردن کرد. ژووری دانەوێڵەکە پڕ بوو لە گۆڕی سپی و بچووك و گۆڕستانێك لە بووکەڵەی گەورە. شێتگیریەکەی بەرگەی هیچ جۆرە لاساییەکی تەنزئامێزی لاسار و خۆشیەکی ماتەمینی نەدەگرت. هەرگیز پەتی بەروانکەی چێشتخانەی لە ژێر چەناگەی نەدەبەست بۆ ئەوەی بە پۆشاکی قوداسی بێ قۆڵ سروودی — دایس ئێرە، *Dies irae* — بچڕێت. بەڵام ئەو وەکو خەڵکانێك چۆن حەز لە شێوازی باخچەی فەرەنسی و حەوزی بچووك و بێستانی میوەهات دەکەن، حەزی لە گۆڕستان دەکرد. (...). ڕۆژێکیان زەوییە زبرەکەی ژووری دانەوێڵەکە شوێنی تیانەما. براکەم ویستی ستایشی گۆڕە سپییەکان و زەوییە نەرم و بۆندار و سەوزاییە ڕاستەقینەو لاولاو و دارکەژەکان بکات.. لە قوڵایی باخچەکەدا لە پشت دار بییەکەوە *Le cypres* هەستا بە گۆڕینی شوێنی کۆچکردووە ناودارەکان کە خەڵکێکی زۆر بە ماتەمیەوە بەسەر سەوزاییە چێنراو بەلای تاجە گوڵینەی ئەڵماسیە بچووکەکاندا تێدەپەڕین. گۆڕهەڵکەنە تێکۆشەرەکە چاوێکی هونەرمەندانەی هەڵتەکاند.

–ئەوە چۆن سەرکەوتن بەدەستئەهێنێ!

لە کۆتایی هەفتەدا، دایکم لەوێوە گوزەری کرد، بە سەرسامیەوە هەڵوەستەی کرد، بە چاوی ئەبڵەقەوە سەیری دووربین و هاوێنە و چاویلکەیەکی دەسکداری کرد، لە ترساندا قیژاندی و بە پێلەقە چووە سەر هەموو گۆڕەکان. ئاکام مناڵەکە لە کوختێکی بچووك سەقامی گرت! ئەمە شێتییە، سادیەتە، ئەمە — چێژ لە مردوو بینینە، اشتهاء الموتی– و پێشێلکردنی پیرۆزییەکانە، ئەمە.. نازانم ئەبێ چی بێ! دایکم لە تاوانبارەکە

ڕاما، لە سەرویەوە نهێنییەکی سەرسوڕهێنی کەسێکی گەورەی لە منالێکدا بەدیکرد. فلچە کرێنێکی تیژ و ژمارەیەك کێل و تاجە گوڵینە و پایەی بڕدراوی دەسکەوت. براکەم بێ ئەوەی نارەزایی دەربڕێ ژان دایگرت هەستی کرد بێ ئابڕوێتی بە کارەکەی کراوە. بەرامبەر سەوزاییەکی ڕووتەن و پەرژینی دارسنەوبەرەکان کە خاکە تەڕ و شیتەڵکراوەکەیان بە سێبەر داپۆشیبوو، منالەکە بە دەروویەکی پڕ لە پەژارەو شاعیرانە منی بە شایەت ڕاگرت و ووتی.

–پێت وایە باخچەیەکی بێگۆڕ بێتە مایەی نیگەرانی و دڵتەنگی؟

ماڵەکەی کلۆدین (کتێبخانەی ئاشێت، بلاوکەرەوە)

## شێوازە جوانەکان

کۆلێت لە ساڵی 1900 دیمەنی کۆمەڵێك ئاکار و خوڕەوشتی سەیری لە کەسانی پۆشتە و نازدار و کۆلکە شارستان و ژنانی نێوکۆمەڵ و پیاوانی شانۆ و سەرمایەدار و پەراگەندەی سەرشەقامەکان و بێکاری بۆ جێهێشتین و سەردەمێك دەبوژێنێتەوە کە تیادا ئۆتۆمبیلەکان سەر بە چینە بەرزەکان و لە ڕێگەی کلاو گەورەکانەوە هێدی هێدی بەربلاو دەبن.

لەم دەقەی خوارەوەدا دەتوانین دیمەنی سەیری نێوەندێکی پەراوێزکراو بەدیکەین کە وێڕای ئەوەش واز لە تابوو یاسا و دابونەریتی تایبەتی خۆی ناهێنێ.

گیلبێرتی نازناو بە ژیژی دایکی پەروەردەی دەکات کە گۆرانیبێژێکی پلە دووەمە و مەدام ئەلڤاریێزی داپیرە–مامیتا– سەرگەورەیەکی بێوێنەی بنەماڵەیەکی شاهانەی نائاساییە. بنمیچی ئەپارتمانە بچووکەکەی کە بە هۆی گازەوە ڕەش داگەڕابوو گەلێ جار پێشوازی لە سەردانەکانی گاستۆن لاشێلی دەوڵەمەند و ناسراو دەکرد. ئەشێ هاتنەکەی بۆ خاتری یادکردنەوەی باوکی بێ کە مەدام ئەلفاریێز چاکی دەناسی یان لە پێناو خۆدزینەوە لە دەس خۆ تێهەڵقورتێنەر و زۆربلێیان بێت یاخود گومانی تیادا نیە کە سیحر و جوانی و سەرنجڕاکێشی ژیژی هەستی بزواندبێ. مامیتا چاوەڕوانی ڕووداوەکان دەکات و ژیژی بۆ لای ئەلیسیای خوشکی دەنێرێ. خاتووی بەساڵاچووی قەشەنگ ئەلیسیا جارانی دوور پێشبڕکێی لەگەڵ کارۆلین ئوتێر و لیان دوپوگی دەکرد و پاشان بەردەوام یادەوەرییەکانی ڕۆژانی لاوی و وانە ئەدەبیەکانی بۆ خووشکەزا بچکۆلەکەی دەگێڕایەوە چونکە بە بیروڕای خۆی نەبوونی هەڵسوکەوتی جوان لە کاتی نانخواردن تۆوی دووبەرەکی لە نێو زۆربەی خێزانەکاندا بلاودەکاتەوە–.

دەنگێکی هەرزەکارانە و چرچ و لۆچیەکی لێبردوو و پەمەیی دەردەکەوێ و دانتێلێك قژە سپیەکەی داپۆشیوە، پورە ئەلیسیا ڕۆڵی مارکیزەکانی شانۆ دەگێڕێ. گیلبێغت بە تەواوی ستایشی پووری دەکات. کاتێك کە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشت، تەنوورەکەی هەتاکوو ژێر خۆی ڕاکێشاو هەردوو ئەژنۆی پێکەوە نووسان، ئانیشکی لە نزیك کەمەرەوە جێگیر کرد و ئێسکەکانی سەرشانی پاککردەوەو لە کیژێکی لاو دەچوو[1]. وانەکەی خۆی دەزانی و بە ووردی نانەکەی دەستی پارچە دەکرد و بە بێدەنگی نانی دەخوارد و بە وورياييەوە گۆشتەکەی شی دەکرد و پەنجە دۆشاومژەی دەنایە سەرپشتی کێردەکەوە. کاتاگۆنێکی[2] پێچراو بە ملیەوە ناوچەکانی دەوروبەری تەوێڵ و گوێیەکانی سوورکردبووەوە.

سەروی پشت ملی گەلێ بەهێز و کەمێك لار بوو. بەرگێکی چاککراوی شینی خەماوی و بەروانکەیەکی نووچدراو بەسەر بەشی سەرەوەی تەنوورەکەی هاتبوو کە پارچەیەکی پێوە دوورابوو. زەخرەفەی سێ ڕیز شریتی کوتاڵ لە چمکی تەنوورەکەو سێ کەڕەت سێ ڕیز شریتی دی لەسەر چمکەکانی کراسەکەی لە نێوان مەچەك و سەرشان نەخشێنرابوو. پوورە ئەلیسیا بەرامبەر خوشکەزاکەی وەستابوو، بە چاوە جوانە شین و ڕەشەکەی بە ووردییەوە لێی ڕوانی بێ ئەوەی هیچ شتێك بەدیکات و هیچی پێ بڵێ.

–کتوپڕ لێی پرسی تەمەنت چەندە؟

–وەك ئەو ڕۆژەیە پوورێ: پانزە ساڵ و شەش مانگ پوورێ. لەسەر بردەی تۆنتۆن گاستۆن[3] چۆن ئەگەی؟

–بۆچی بایەخ بەوە دەدەیت؟

–بێگومان پوورێ ئەو مەسەلەیە دڵتەنگم دەکات. گەر تۆنتۆن لەگەڵ خاتوویەکی دی ئاشتبایەتەوە ئەوا نە لە ماڵەوە یاری کاغەزێنی دەکرد و نە کانۆمی[4] دەخواردەوە کە بەلانی کەم ماوەیەك زەرەری پێدەگەیەنێ.

–بێگومان ئەمە بەخۆی بۆچوونێکە. پوورە ئەلیسیا پێڵووەکانی دەتروکێنێ و بە شێوازێکی ڕەخنەئامێز لە خوشکەزاکەی دەڕوانێ.

–لە حەوشەکەتاندا یاری دەکەیت؟ هاوڕێکانت کێن؟ بولبولی جۆ (بلبل الشعير). بیانکەرە دووکەرتەوە بەشێوەیەکی کارامە بە چەقۆ بە مەرجێ ڕووە تیژەکەی لەسەر قاپەکە گیزەی نەیەت. بەجارێك نیوەی قووت بدە چونکە ئێسکەکانی لە ژماردن نایەن. بێئەوەی لە خواردن دابڕێی وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە و هەروەها بە دەمی پڕ لە خۆراك گفتوگۆ مەکە. ڕێکوپێك بە. ئەوەی من دەیکەم تۆش دەتوانی بیکەی.

هاوڕێکانت کێن؟

–کەس پوورێ. داپیرە تەنانەت ڕێگەم پێنادات بچمە ماڵی دایك و باوکی هاوڕێکانم و نان بخۆم.

–هەقیەتی، لە دەرەوە کەست لەگەڵ نیە؟ کارتی شتومەك کڕین لە جزدانەکەتدا نیە؟ نە هاوەڵێك و نە کەسێکی ژیرت لەگەڵە؟ ئاگاداربە گەر درۆم لەگەڵ بکەی، ئەزانم. گیلبێغت لە سیمای درەوشاوەی ژنە بەساڵاچووە دەسەڵاتدارەکە کە بە بێ سۆزییەوە پرسیارەکانی ئاراستە دەکات، وورد دەبێتەوە.

–بێگومان نا پوورێ، هیچ کەس. ئایا کەس لای تۆ بە خراپ باسی کردووم؟ من هەمیشە زۆر بە تەنهام. بۆچی داپیرە ڕێگەم نادات بانگهێشتەکان قبوڵ کەم؟

–هەقی خۆیەتی، ئەمجارەیان. تۆ تەنها لەلایەن کەسانی ئاسایی واتە کەسانی بێ کەڵك بانگهێشت دەکرێیت.

–ئەی ئێمە کەسانی ئاسایی نین؟

–نەخێر.

–کەسانی ئاسایی چیان لە ئێمە کەمترە؟

–مێشکیان پووچ و بەد ڕەوشتن. هەروەها ژنیان هێناوە، بەڵام پێم وانیە لێم بگەیت.

–با، پوورێ، تێدەگەم ئێمە شوومان نەکردووە.

–ئێمە شووکردنمان لێ قەدەغە نەکراوە. لەباتی ئەوەی پێشوەخت شووبکەین، ڕوودەدا کە درەنگ شوو بکەین.

–بەڵام ئەوە ڕێدەگرێ من سەردانی دەستەخوشکانی هاوتەمەنم بکەم.

–بەڵێ. لە ماڵی خۆتان بێزاری؟ کەمێك بێزار بە، شتێکی خراپ نیە. بێزاری یارمەتی دەرکردنی بڕیارەکان دەدات. ئەمە چیە؟ فرمێسك؟ فرمێسکی

دەبەنگێکی بچکۆلە پێشوەخت نیە بۆ تەمەنی تۆ. گۆشتەکەت بخۆ.

پورە ئەلیسیا بە سێ پەنجەی وورشەدار پاژنەی پەرداخەکەی توووند گرت و بەرزی کردەوە:

–نۆشــی گیانمــان بێــت، ژیــژی! لەگــەڵ خواردنــەوەی فنجانــە قاوەکــە خدێویــەك[5] بکێشــە بەمـەرجێك نامـەوێ قنگـە جگەرەکـەت تـەڕ بکـەیت و وەهای بکێشیت بێ ئـەوەی تڵپـی تووتنەکـە بتفێنـی و پتــەپت بکــەیت. هــەروەها پــەیمانی هێنــانی بەرگدروویەکی تایبەتمەندی ماڵی بێشوف دیڤیدت دەدەمێ کە هاوڕێیەکی دێرینـی سـەرنەکەوتوو بـوو. دۆلاّبی جلوبەرگەکەت گۆڕانکاری بەسەردێت. ئـەوی گیانبازی نەکات خاوەن هیچ نیە!

–چــاوە شــینە تاریکــەکانی دەبریســکانەوەو گیلبێغـت لـە خۆشـیاندا قسـەکانی بـە دابچـڕاوی دەردەبڕی.

ژیژی (کتێبخانەی ئاشێت، بلاّوکەرەوە)

حەوڵــە زۆرەکــان بــە فــیڕۆ ناچــن: پــاش دەرکـەوتنی نـاڕەزایی زۆری لاوان و هەنـدێ ڕاڕایـی لـەوان بچوکتر، ژیـژی شـوو دەکـات و دەبێتـە خـاتوو گاستۆن لاشێل.

## کێبڕکێیەکان

هەموو کەسێك دەزانێ کۆلێت گرنگی بە پشیلە دەدا بــەلاّم لێــرەدا بـاس لـە جـوانی و نــەرمونۆڵی ئاژەڵی ناکات. کەمیل کە شوو بە ئالان دەکات غیرە لــە ســاهای پشــیلە دەکـات کـە مێردەکـەی زۆری خۆشــــدەوێت. هــــەردووك لەســــەر بـــالکۆنێکی بەرتەسکی بینایەکی بەرزی نوێ چاودێری یەکدی دەکەن: ئەم دیکۆرە بەشێوەیەکی گشتی و ئاسایی لە پەشێوی ڕێڕەوەکەوە بەرەو جۆرێك –دانیشتنی نهێنـی– تـەواو تراژیـدی ترۆقـە دەکـات. هـەروەها ئـەوەش ڕەچـاو دەکـەین نووسـەر چـۆن لـە ڕێگـەی هەڵبــژاردنی خــودی دەســتەواژەکان ئامادەگیــەکی مرۆیی بە قوربانیە چکۆلانەکە دەبەخشێ.

شــەوێکی تــەمووز کــە هــەردووك چــاوەنواڕی گەڕانـەوەی ئـالان بـوون، کـەمیل و پشـیلەکە لەسـەر هــەمان دیــوار گیرســابوونەوە، پشــیلەکە لەســـەر پەلـەکانی ڕاکشـابوو، کـەمیل خـۆی بەسـەر دەسـت و باڵــە لێکئالاّوەکانیــدا کێشــابوو. کــەمیل حــەزی نەدەکرد پشیلەکە بالکۆنەکە داگیر بکات کە بە دوو بینـای گـەورە پێشـی گیرابـوو و لـە ڕەشـەباو هـەموو پەیوەندیــەك بــە بەشــی پێشــەوەی بالکۆنەکــە دایبڕیبــوو. هــەردووك تێڕوانینێکــی خێــرا و پشـکنینێکی قووڵیـان دەگۆڕیـەوە. کـەمیل قسـەی ئاراستەی ساها نەدەکرد کە لەسەر پەل ڕۆنیشتبوو وەهـا چـەمابووەوە وەك بلێـی بـۆ ژمـاردنی پارچـە پـەردە پرتەقاڵیـە شـۆڕبوەکان سـەرەو خـوار بەسـەر بەشــی پێشــەوەی بینــا سەرســوڕهێنەکە خــۆی مەلاّســداوە. کــەمیل دەســێکی بەســەر پشــیلەکەدا هێنـاو ئەویش بۆ ئەوەی شوێنی بکاتـەوە هەسـتاو کشایە دواوە و لە شوێنێکی کەمێ دوورتـر دووبـارە ڕاکشــایەوە. لــەوەتی کــەمیل تەنیایــە زۆر لــەو کیژۆڵەیــە دەچــوو کــە حــەزی لــە ڕۆژبــاش کــردن نەدەکرد. لە ڕێگەی دەربڕینێکی بێگـەردی نـامرۆیی و خۆڕاگری فریشتەییانە کە سیما مناڵیەکان بەرز ڕادەگرێ، دەموچاوی دەگەڕێتەوە قۆناغی مناڵی. لە ئاسمانێـك کـە ڕۆژانـە ڕۆشـناییەکەی گەلـێ خێـرا دەکێشێتەوە. بە تێڕوانینێکی بێ لایـەنی قـووڵ کـە ئەشــێ ڕەخنــەو سەرزەنشــتی هیچــی پێوەنــەبێ گەشـتێك بـە نێـو پـاریس دەکـات. بـە تـوڕەیی باوێشــکی داو ڕاوەســتا بــێ ئاگایانــە چــەند هــەنگاوێکی هــەڵنا و ســەرلەنوێ چــەمایەوە و پشــیلەکەی ناچــار کــرد لــە شــوێنی خــۆی

هەڵبەزێتەوە. ساها بە نەفسێکی بەرزەوە دووردەکەوێتەوە و وای بەچاك ئەزانێ بگەڕێتەوە ژوورەکە. بەڵام دەرگا سێ گۆشەییەکە داخرابوو و ساها بەسینگ فراوانیەوە دانیشت. ساتێك دواتر دەبوو ڕاڕەوەکە بۆ کەمیل جێبێڵێ کە لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی دی بە هەنگاوی درێژو کتوپڕ هاتوچۆی دەکرد. پشیلەکە بەسەر دیوارەکە قەڵەمبازی دا. کەمیل لەسەر کەشکە ئەژنۆ وەك فەرمانێك قاوی داو ساها هەمدیس لە دەرگا داخراوەکە خۆی پاراست. کەمیل بە جێگیری و دووربینانە پشتی تێکرد، پشیلەکە لەگەڵ ئەوەش بە خێرایی هەناسەی دەداو لە پشتەوە دەیڕوانیە کەمیل. هەستاو سێ چوار کەڕەت بە دەوری خۆی سوڕایەوە و لە دەرگا داخراوەکە ووردبووەوە. کەمیل لە شوێنەکەی خۆی سەقامی گرتبوو. ساها کوونە لووتەکانی فش کردەوە و حەسرەتێکی هەڵکێشا کە لە هێڵنج دانەوە دەچوو. میاواندنێکی درێژ و پڕ لە داخ و وەڵامێکی نائومێدی نزیك و پەنهان دەربازی کرد، کەمیل ڕووی وەرچەرخاند. کەمێك زەردهەڵگەڕابوو، ئەمە وا دەگەیەنێ کە سووراوە دیار و ئاشکراکەی وێنەی دوو مانگی بازنەیی لەسەر گۆناکانی کێشابوو. بێ ئاگا خۆی دەرخست هەروەك ئەوەشی لە سایەی ڕوانینێکی بێگیان ئەنجام دابێ. بەدەم داخراوی دەستی بە مینجە مینج کرد و لەسەر ڕەزمی گۆرانیەکەی لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی دی کەوتە هاتووچۆ بەڵام بە دەنگێکی کزەوە. پشیلەکەی کە خەریکبوو بریندار بێت ناچار کرد بە قەڵەمبازێك بگاتە چاودێرگە بەرتەسکەکە و پاشان خۆی بە دەرگاکە بلکێنێ.

ساشا دەستی بەسەرگیرا و لە بری ئەوەی بقیژێنێ ترس دایگرت. کەمیل زۆر بە ئەسپایی هاتووچۆی دەکرد، بە دوای پشیلەکە کەوت وای پیشان دەدا کە نایبینێ. ساها بەسەر دیوارەکە بازی نەدا ئەوکاتە نەبێ کە قاچەکانی کەمیل کەوتنە سەری. پەی بە زەوی بالکۆنەکە نەبردەوە و بۆ دوورکەوتنەوە لە دەسدرێژیکردنەکە بە هەڵەداوان خۆی بەسەر پەردە تازەکاندا هەڵدا. بەڕێکوپێکی هەڵات و بە وورياییەوە قەڵەمبازی دا و چاوە تیژەکانی لە دوژمنەکەی وەها بڕیبوو نە خۆی بە دەستی تووڕەیی نە پاڕانەوە نەدا. ئەوپەڕی شڵەژاوی و ترسی مردن ژێر پێیە هەستیار و پەلوپۆی لە ئارەقەدا تەڕکرد و ئاسەواری کۆمەڵێ گوڵی لە توێی خانەکانی مەڕمەڕە گەچکراوەکان تۆمارکرد. کەمیل یەکەمجار لاواز دەرکەوت و هێزە تاوانکارییەکەی لەناوچووبوو و دووچاری هەڵەبوو. کە تێبینی خۆرئاوابوونی کرد، بروسکە نیگایەکی ئاراستەی سەعاتە زنجیردارەکەی کرد و گوێ قوڵاغی دەنگ و هاڕەی شووشە و بلووری نێو ئەپارتمانەکە بوو. دوای چەند ساتێك چیتر حەوسەڵەی نەما وەك چۆن خەو بە بێگەردی و لاوازییەوە – خەوگەڕێك، مسرنم – بەرەڵا دەکات.. ساها هەست بە تێکشاندنی خۆڕاگری دوژمنەکەی دەکات و لەسەر دیوارەکە سەقام دەگرێ و کەمیل هەردوو دەستەکانی بۆ دەبات بەرەو بۆشایی پاڵی پێوە دەنێ.

پشیلە (گراسێ، بڵاوکەرەوە).

پەردەیەکی ئاسمانی پشیلەکە دەگرێتەوە. بەڵام ئالان لە غیرەی سڵ دەکات بۆیە وازی لێدێنێ و بە سەرکەوتووییەوە ساها لەگەڵ خۆی دەبات.

## سیدۆی سۆزاوی

لە سایەی ڕووناکی ئاسمانی سانت تروپێز کۆلێت ڕۆمانی دەرکەوتنی بەربەیان دەنووسێ، ئەو کتێبەی بەیەکجار هەم زوهد و هەم سەرسامی

دەخاتە ڕوو. نووسەر لێرەدا لە بارێکی ئاڵۆزی ناخی خۆی باسی کەسایەتی دایکی دەکات و هەمیشە دەیزانی ڕۆحی خۆی کە لە میانڕەوی و پاکژبوونەوە بەدوور بوو بپارێزێ.

گومانی تیانیە دایکم وەك خۆی دەڵێ هیچی نەخوێندبوو بەڵام دەیزانی کە لە ڕێگەی – خۆسوتاندن– تەنها بێبەریبوون و خۆ خواردنەوەمان دەست ئەکەوێ. گوناهەکە تەنها بە قورسی لەسەر گەورە شەیدایانی وەك خۆی و ئێمە دەکەوێتەوە. لای هاوسەرەکەی هێمن و ڕووخۆش بوو و لە کاتی بینینی ئەو بوونەوەرانەی کە ساتە مەزنەکانیان بەسەر دەبرد بەهۆی سۆزێکی پەنهانەوە دووچاری شڵەژان و سەرنگوومی دەبوو. لە گووندەکەیدا دیلی دەستی نێوان دووهاوسەری دوابەدوایەك و چوار منداڵ بوو. لە هەموو شوێنێك ڕووبەڕووی شتی چاوەڕواننەکراوی ورووژێنەر یان خۆی دەیورووژان و لووتکەکان و دەرکەوتنی بەربەیان و گۆڕانکاری و تەقینەوەی موعجیزەکان دەبوو کە بەهەموو نرخێك پێشوازی لێدەکردن. ئاژەڵی بەخێودەکرد و چاودێری منداڵی دەکرد و فریای کێڵگە و ڕووەکەکان دەکەوت. هەر کە دەیزانی چی ئاژەڵێك خەریکە دەمرێ و کەی منداڵە خۆپیسکردووەکەی پێویستی بە پاککردنەوەو کەی گوڵەکان پێویستە بەهێزکرێن بە هەڵەداوان بە دەمیانەوە دەچوو. هێزێکی نەزانراو پاڵی پێوەدەنا کە سەر لە شانەی هەنگ بدات و مشك ڕاوبنێ و تازە لەدایکبووان لە دارەکان دەربێنێ و لە هەژارێکەوە ڕوو بکاتە لای کەسانی هەژارتر و لە پێکەنینەوە ڕووبکاتە ئازار و ئەشکەنجە. پاکژی هەموو ئەوانەی هێز و توانایان دەخەنە گەڕ تیادا دابوو! لە ژیانیا هەرگیز بیرەوەری تاڵی لە مەڕ خانەوادەکەی نەگێڕابووەوە. گەر لە دەوروبەری گوڵێکی نەپشکووتوو و متبوویەکی پێچ خوراو هەروەها قۆزاخەیەکی وورشەدار بە جەستەیەکی پڕ لە هیوا داچڵەکایە، ئەوە هەرنەبێ بە ئەوپەڕی ڕێزەوە چاوەڕوانی کاتی دیاریکراوی دەکرد. چ پاکژی کەسانێکە کە هیچ شکستێکیان ئەنجام نەداوە!

ئەوەتا ناچارم خۆمی پێوە گرێدەم و بگەڕێمەوە ئەو کاتانەی کە دایکم بەشێوەیەکی کاریگەر خەونی بە سەراپای تافی هەرزەکاری کوڕە گەورە هەرەجوان و سەرنجڕاکێشەکەی دەبینێ. لەو ساتانە پێشبینی دڵرەقی کەسێکی تەنراو بە ڕووخۆشیەکی دزێو و نەفرەت و ساویلکەیی و شێواندن دەکرد. ئای کە بە چاوێکی نزم لێمدەڕوانی کاتێ کە گۆناکانی لە ئاکامی توڕەیی و غیرەکردن سوور هەڵدەگەڕا! و بە جۆرێك دەمبینی کە چاك تێدەگەیشت لێم لەوەی خۆی لە توێی بەهێزترین نەفرەتدا دۆزیوەتەوە! بەهۆی زیرەکیمەوە بۆم دەرکەوت من پۆخڵەواتی چی پاشماوەو وێنەی زبر و ساویلکەی کارەکەرێکی دڵسۆزی پێویستیە پڕوپووچەکانیم! بەیانی باشی لێدەکردم و هەموو کاروبارەکانی پێدەسپاردم. وەك شاعیرێك چۆن لە کاتی پەیبردن بە پارچە ئاوازێکی سەرهەڵداو بیرۆکەکانی دەستەمۆو دەستەبەر دەکات، گەشتی بە نێو مەوداکاندا دەکرد.. بەڵام میلۆدی چی بایەخێکی هەیە، دارکەمان ڕەدووی کێ و دەستی کێ وێڵە؟

شانبەشان گەورەبوونی غەم و دڵەڕاوکێ بەرەو کۆتاییە بێگەردەکان هەنگاودەنێ. زوو لە خەو هەڵدەستێ، پاشان زووتر و ڕۆژی دوایی زۆر زووتر. دەیویست جیهان بێتە موڵکی خۆی و بیابان لە شێوەی زەوییەکی شوورەدار بە پەرژین و ئاسمان سەربانێکی دانەویو بێت. خوازیاری دارستانێکی فەریکی ئەوتۆ بوو کە بولبول و پشیلە

و مێش هەنگ و جاڵجاڵۆکەی گەورە دووبارە لەسەر ئەو عارەبانەیەی ڕابوەستن کە شەوانە بە دانتێلی زیویین دەیڕازێنێتەوە. جیڕەی دەرگای ماڵە دراوسێ لەسەر دیوارەکەوە هەرەسی بە خەونە دروستکراو و ناجێگیرەکانی دەهێنا کە هەموو ڕۆژێك لە ساتێکی دیاریکراودا سەریهەڵدەدا. کە ئاورینگی ساردوسڕ لە شێوەی تنۆکی گەورە و بچووکی زرنگاو لە دەنووکی ڕیشۆڵەکان خەریکبوون بەردەبوونەوە. کاتژمێر شەش جێگەی نووستنی بەجێدەهێشت. پاشان کاتژمێر پێنج و لە کۆتایی ژیانیدا چرایەکی بچووکی سوور زستانی بەئاگا هێنایەوە ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی نوێژی موژدەدەر –صلاة التبشیر– تاریکی ڕاگەیەنێ. لەم ساتە تاریکانەدا دایکم هەمدیس گۆرانی دەچڕی بۆئەوەی بێدەنگ بین و بتوانین گوێبیستی بین. هەروەها باڵندەی کلاوکوڕە –قبرە – بە ئەندازەی ڕووناکترین شوێن هەڵدەفری و ڕووی لە نزمترین مەنزڵگەی ئاسمان دەکرد. دایکم سەرئەکەوت و سەرئەکەوتە سەر پێپلیکانەی کات و لە هەوڵدابوو بۆ دەسگیرکردنی سەرەتای سەرەتاکان. دەمزانی ئەم تەکاندانەی لە پێناو چی بوو. بەڵام ئەو خۆی بە دوای تیشکێکی ئاسۆیی سوور و ڕەنگێکی گۆگردی زەرد دەگەڕا کە پێش تیشکە سوورەکە دەهات. پێویستی بەو باڵە تەڕە بوو کە یەکەم قۆناغی لەدایکبوونی مێش هەنگ وەکو دەست بە کاری دەهێنێ. لە ڕەشەبای هاوین کە دەبووە هۆی خولقاندنی هەمان گەرمای دەوروبەری خۆر سەرەتاکانی بۆنی ڕووەکی ئەکاکیا و دووکەڵی دارستانەکەی دەسگیر دەبوو. پێش هەموو شتێك لە تەویلەی هاوسێکەیانەوە بەدەم خشپەی پێو و نیوە دەنگی حیلەی ئەسپێکەوە دەچوو. بە نینۆك لەسەر سەتڵی بیرە ئاوەکەدا یەکەمین بازنەی سەهۆڵینی لێدەکردەوە کە لە بەرەبەیانێکی پاییزدا خۆی تیا دەبینیەوە.

دەرکەوتنی بەربەیان (فلاماغیۆن، بڵاوکەرەوە)

## وەرزەکانی ڕابردوو

گومانی تیادا نیە کۆلێت لە ڕێگەی نووسینی سیدۆ درەوشاوەترین شاکاری بە ئەنجام گەیاند. لەم کورتە باسەی کە دەیخوێنین پەی بە دوو لایەنی بەهرەمەندێتی دەبەین: خستنەڕووی وەرزێك تا ڕادەی هەستپێکردن تەنانەت لە بەرزترین پلەی ونبوونیدا و ڕەشەبایەك لەیەك کات گوڵێك بۆ کایەیەکی دی دەگوازێتەوە کە کایەی ڕابردووی ڕەهەندەکانی بیرەوەرییە و بە جۆرێك و یەکجار بوونی جوانکراوی ئەدگاری دایکانەی لەبیرنەچووی تیا دەردەکەوێ.

لە سەردەمێك کە زستانی درێژخایەن و هاوینی پڕوکێنەر بوو، بمرم ئەوەم لە یادە کە ڕەنگی هاوینان لە ڕەنگی ئەو خاکە سەوزە درزبردووەی ژێر قەدەکانی گەنم و چەترە مەزنەکانی ڕووەکی گێزەری سپی –*panais*–ی کێوی و ڕەنگی خۆڵەمێشی و شینی ڕووباری دەچوو. هیچ هاوینێك جگە لە هاوینی ماوەی منالێم ڕووەکی خرنووکی ئەرخەوانی و ڕازییانە (شمراخ)ی داگیرساو بە گوڵە – قوچەك، *digitale* – نەدەهێنایەوە یاد. هیچ زستانێك بەشێوەیەکی ئەوتۆ وەك بنچینەی ئاسمانێکی پڕ لە هەوری شین هەڵگەڕاو سپی و سۆڵ نەبوو کە پێشبینی ڕەشەبایەك لە کوڵە پەمووی ئەستوور و پاشان بەفرتوانێکی ڕۆشن لە هەزاران تنۆك ئاو و خونچەی نووکدار دەکرد.. ئەو ئاسمانە گوشاری دەخستە سەر سەربانی پڕ لە بەفر و حەشارگەی دانەوێڵە و ئاڵف و دارگوێزی ڕووت و ئامێری هەوا سوڕێن و گوێی پشیلەکانی

بادەدا.. کەوتنی شاقوولی و هێمنی بەفرەکە لار دەبووەوەو هاژە و خورەی کزی ڕووبارە دووردەستەکە شاڵاوی بۆ سەر سەری داپۆشراوم دەهێنا، لە کاتێکدا من لە نێو باخچەکەدا هاتوچۆم دەکرد و چنگم لە بەفرە فڕیوەکان گیردەکرد.. بە هۆی چزوولەکانیەوە وەئاگادەهاتم، دایکم لەسەر سەکۆکەوە هاتە پێشێ و چێژی لەو کاتە وەردەگرت و هاواری بۆ کردم: گەردەلوولی ڕۆژئاوا هەڵیکرد! ڕاکە! کلاوڕۆژنەی ژووری دانەوێڵەکەو دەرگای ترومبێلە گەورەکەو پەنجەرەی ژووری دواوە دابخە!

جۆش و خرۆشی کەشتی شوێنی لەدایکبوون تافەی دەهات و من بەدەم تەقوهوڕی پێڵاوەکانم تەکانم بەخۆم دەدا و لە ناخەوە تامەزرۆی ئەو کۆکتێلە سپی و ڕەش و شین و ئاوازە فرە ڕۆشن و بریسکاویە کوورتە بووم. مناڵانی ڕۆژئاواو مانگی شووبات هەردووك بە یەکێك لە زەمەنە ڕەهاکانی ئاسمان دەتەنرێن.. من هەوڵی خۆترساندن و بڕواکردنم بە کۆتایی گەردوون دەدا. بەڵام لە بۆتەی دەنگ و ژاوەژاوێکی گەلێ سامناك دایکم بە چاوی سەرسامیەوە لە ڕوانگەی گەورەکەرەوەیەکی بازنەیی مسین کریستاڵە ووردبووەکانی تووێی مشتێك بەفری دەژمارد کە لە خودی پەلەکانی ڕەشەبای ڕۆژئاوای ڕاگوزار بەسەر باخچەکەماندا چنگی کەوتبوو..

سیدۆ (کتێبخانەی ئاشێت، بڵاوکەرەوە).

## پەراوێزەکان

1–نووسەر لە تەواوی دەقەکە زۆر بە ڕاشکاوی ووتوویە: لە تیرهاوێژ یان فریشتەیەکی سەرسەخت یاخود لە کوڕێکی تەنوورە لە پێ دەچێ.

2–جۆرە ئارایشتێکە کە لە سۆنگەیەوە قژ دەخرێتە نێو کلاوێك لە شێوەی تۆڕ یان بە شریتێك گرێدەدرێ.

3–گاستۆن دەسبەرداری لیان دێکزیلمانی دۆستی دەبێ و هەوڵ دەدات بە گیراوەی ئەفیون بە شێوەیەکی ئاسایی خۆی بکوژێت.

4–(کانۆمی *canomille*): بابونج، ڕووەکێکی گیایی کێوییە کە سوودێکی زۆری هەیە و یارمەتی هەرسکردن دەدات و سووکە کۆکە لادەبات (وەرگێڕ. فەرهەنگی المنهل)

5–خدێوی: جۆرێك جگەرەیە کە تاموبۆیەکی ڕۆژهەڵاتیانەی هەیە.

## سەرچاوە

*XX^e Siecle/ collection litteraire lagarde et michard*

*colette*

*Page: 523-531.*

# کورتەیەک دەربارەی ژیانی لاش ئالین

لە سویدییەوە: عەبدوڵا قادر دانساز و هیوا قادر

لە ساڵی 1915 لە شاری سوندسڤال لە سوید لەدایک بووە و لە 11ی ئازاری ساڵی 1997 کۆچی دوایی کردووە.

یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی لە ساڵی 1943دا بوو کە ڕۆمانی "تۆب لەگەڵ مایفێستدا"ە دواتر کۆمەڵێ ڕۆمانی تری بڵاوکردۆتەوە. هەروەها چوار کۆمەڵە چیرۆکی هەیە، کە دوانیان ڕۆڵی گرنگ و تایبەتیان هەیە لە ئەزموونەکانی ساڵانی چلی چیرۆکی سویدیدا، کە ئەوانیش کۆمەڵە چیرۆکی "*Inga ogon vanter mig*" "هیچ چاوێك چاوەڕوانم نییە" کە لە ساڵی 1944دا بڵاوبۆتەوە، وە ئەم دوو چیرۆکەش لە نێو ئەو کۆمەڵە چیرۆکەدا هەڵبژێردراون. ئەوی تریشیان کۆمەڵە چیرۆکی "شادمانی بەندکراوێك"ە کە لە ساڵی 1947دا بڵاوکراوەتەوە.

لاش ئالین بە ئەزموونگەریترین ڕۆمان نووسی سەردەمی خۆی دادەنرێت، بە قاڵ بوونەوە و شارەزایی تەواوی سەبارەت بە شیکردنەوە و خوێندنەوەی ئازاری مرۆڤی سەردەم و باری ژیانیان. ئەو گرفتانەی کە ئەو لێیان دەدوێ ڕۆچوونە نێو ناخی مرۆڤەکانە، لەگەڵ پرسیارکردن دەربارەی هەست بە گوناه کردن و گوناهباری و ڕووبەڕووبونەوە بەرامبەر بە مردن، چڕبوونەوەی ئەم حاڵەتانە زیاتر لە چیرۆکەکانیدا بەرجەستە بوون.

ئالین شێوازی نووسینی باوی ڕۆمانی وەلا ناوە بەوەی کە دەڵێت بەشی ئەوە ناکات کە بتوانم ئەوەی دەمەوێت تیایدا بیڵێم.

هەروەها ئالین ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە تازەکردنەوە و پیشاندانی شێواز و زمانی نووسینی ڕۆمان و چیرۆکی سویدیدا. کە بە پێشڕوترین و ڕچەشکێنترین نووسەرانی ساڵانی چلی ئەدەبی سویدی دادەنرێت.

## دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە

ئەو دەمەی سوێرین هێلگرێن کەمێ بەسەرحاڵیەوە گەڕایەوە ماڵ تەنها (گالۆش)ەکانی[1] لەبەر دالانەکەدا لەپێ داکەند. شەبقەکەی بە پشتی ملیا شۆڕکردەوە، دوگمەکانی پاڵتۆکەی ترازاندو هەنگاوی بەرەو ژوورەوە هەڵێناو هەوڵیدا خۆی بە ئاگا و شادمان نیشان بدات.

—وا هاتمەوە، ئایە چاوەنۆڕ کراوبووم؟ سوێرین ئەمەی بە گاڵتەجاڕیەوە ووت.

کیسەیەکی ڕووەو ژنەکەی ڕاگرتبوو.

ژنەکەی سەرقاڵی ماڵ پاککردنەوە بوو. نهۆ گەلێ شتی لەناو کاوەنتەرەکە دەرهێنابوون و خستبوونیە سەر مێزەکە. تەنها دەقەیەك پێش ئێستا پەڕۆی تۆز پاککردنەوەکەی بەدەستەوە گرتبوو، بەڵام ئێستا وای پیشاندەدا هەروەك دەمێك بێت خەریك بووبێت. لێ هەر ئێستا بەر پەنجەرەکەی بەجێهێشتبوو. چەند سەعاتێك بوو لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو و چاوی بۆ سوێرین دەگێڕا.

—خۆ تۆ دەبوایە تەنها بچویتایەتە ئەوێ و بگەڕایتایەوە، هەنوکە وای پێووت.

—منیش تەنها چووم بۆ ئەوێ و گەڕامەوە، بە بزەیەکی گاڵتەجاڕانەوە سوێرین ووتی.

—تۆ دەبوایە دواکات پێش کاتژمێری یەك بگەڕایتایەتەوە، ئەو ووتی.

—وە ئێستاش کاتژمێر شەشە، سوێرین ووتی.

—بۆ قسەی خۆت ناهێنیتە جێ؟

—ناتەوێ سەیرێکی نێو کیسەکە بکەیت؟

—دەکاری کیسەکە لەوێدا دابنێی، پێیووت. نابینی وا سەرقاڵی ماڵ پاککردنەوەم.

—حەز بە زایەڵەی دەنگت ناکەم، سوێرین ووتی.

—باشە بۆ پاڵتۆکەت لەبەرداناکەنی؟ ئەو ووتی.

—باشە ئەی تۆش بۆ سەیرێکی نێو کیسەکە ناکەی؟

—دایکەنە لەبەرت، ئەو وای ووت و لەگەڵ ئەوەشدا سەیرێکی نێو کیسەکەی کرد.

کیسەکە چەند سێوێك، دوو پرتەقاڵ و بۆڵێکی بچوکی ترێ شینکەی تێدا بوو.

—چی دەڵێی بیڵێ، بەڵام تۆ پیاوێکی میهرەبانت چنگ کەوتووە، وای ووت و ژێرچەنەی ژنەکەی گرت.

ژنەکە پاشەکشێی کردو گەڕایەوە دواوە.

—ئا، دەقاودەق ئەم شێوەیەم بە دڵە. سوێرین، دایکەنە لەبەرت!

خۆی وا پیشاندەدا گوێی لە ژنەکەی نیە، بەڵکە کەوتە سوڕاندنەوە بە دەوری مێزەکەداو دەستی کرد بە فیکە کێشان.

—نامە هیچ نەهاتووە؟

—نەخێر، ژنەکە ووتی.

سوێرین لە تەنیشت مێزی نووسینەکەوە ڕاوەستاو دەستی کرد بە هەڵگرتنی چەند پەڕە کاغەزێك، بەردەوام فیکەی دەکێشا و بە دەوری مێزەکەدا دەهات و دەچوو. بە فیزەوە لەسەر پاژنەی پێڵاوەکانی دەڕۆشت و لە پاشان نوکی پێڵاوەکەی ئەدا بە ئەردا. ژنەکە بێ خۆ تێگەیاندن لێی بەردەوام بوو لە ماڵ پاککردنەوە. کاتێ سوێرین گەیشتە پشتی ژنەکەی دەستی کرد بە (ستێپ)[2] کردن. سوڕێکی بچکۆلەی خوارد. ئەمەش جۆرێك بوو لە داخوازی کردن.

—ناژنەویت؟ وای ووت و سێ جاری تر سوڕایەوە بە دەوری خۆیدا.

بەڵام ئەو بەردەوام بوو لە ماڵ پاککردنەوە و پشت تێکردن لە مێردەکەی. ئەو کاتە سوێرین کەمەری ژنەکەی گرت و هەوڵیدا ماچێکی گەردنی بکات. بەڵام ئەو پاڵێکی پێوە ناو هاواری کرد:

—وازبێنە لەم کارانە!

—ئاوەها، وا پێدەچێت، وای ووت. پیاو ڕووی پێنادرێت. باشە باشە، کەوابێت مرۆ دەتوانێ دووبارە بڕواتەوە.

سوێرین گەلێ بەزاڵیەوە دەمووچاوی دا بەیەکداو جەستەی بەرەودواوە چەماندەوە.

—مرۆ دەکارێ دووبارە بڕوات..

—بمێنەوە! ئەو بانگی کرد و خولایەوە بە دەوری خۆیدا، تۆ پێویستە بمێنیتەوە!

بە نیگایەکی ڕەشبین و نائومێدەوە سەیری سوێرینی دەکرد.

ژنەکە قژێکی زەرد و لەشێکی پتەوی هەبوو. بە کراسە شین و بەروانکە سپییەکەیەوە گەلێك گرد دیار بوو. بازوویەکی پڕو و بەهێز، دەم ڕەق و چەناگە پان. ژنەکانی هاوەڵی گەلێك جار پێیان دەگووت کە دەبێ بە (ژیری) هەڵسوکەوت لەگەڵ سوێریندا بکات. لەوە گەیشتبوو کە ئەوان مەبەستیان چییە، بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی ئەو شێوە ژیر ڕەفتاریە بە کردەوە ئەنجام بدا. نەیدەتوانی نەرم بێت و قایل خۆی نیشانبدا. هەروەها ئەوەش فەرامۆش بکات کە پیاوەکەی سەرخۆشە و هەڵەی کردووە.

—ماچێکم بدەرێ، سوێرین ووتی.

—تکایە سوێرین، تۆ ئەزانی من تەنها چاکەی تۆم دەوێت. دایکەنە لەبەرت!

—ماچێکم بدەرێ، سوێرین ووتی.

ژنەکە خۆی توڕە کرد و لە سوێرین چووە پێشەوە، شەبقەکەی لە ملی کردەوە و دەستی بە قژیدا هێنا. ئەویش چەناگەی ژنەکەی بەرزکردەوەو ماچێکی نێودەمی کرد. ژنەکە نەیتوانی ڕێگە لەوە بگرێ کە دوو دڵۆپ فرمێسك بە گۆناکانیدا بڕژێنە خوارێ.

—بۆچی دەگریت؟ سوێرین ووتی. سامن وا گەڕاومەتەوە ماڵەوە و میهرەبانم.

—دەبوایە هەروا بگەڕایتایەتەوە ماڵ وەك دەڵێی، وای ووت و دەستێکی بەسەر سینگی سوێریندا هێنا. ئالێرەدا وەستابووم و چاو لە ڕێت بووم..

—باوەڕم پێ ناکەیت؟ سوێرین پێیووت.

—بۆم هەیە پاڵتۆکەت لەبەرداکەنم؟

—پەلە مەکە.

—بەڵام ئەمە هیچ مانایەکی نییە پاڵتۆکەت لەبەردابێت، ژنەکە ووتی. دایکەنە لەبەرت و ڕاکشێ و پشوویەك بدە. بەڕاستی چێشتێکی بەلەزەتت بۆ لێدەنێم.

—برسیم نییە، سوێرین پێی ووت.

—تێگەیشتم، دووبارە ژنەکە گرژبووەوە. بێگومان تۆ لە (ڕۆنان)(3) دانیشتویت و خواردوتەو خواردوتەتەوە.

—بەڵام من ئێستا گەڕاومەتەوە ماڵەوە و میهرەبانم، سوێرین ووتی.

—چەندت پارە بەزایەداوە؟

سوێرین بەیەکجاری سەرودڵی گیراو هەنگاوێك لە ژنەکەی کشایەوە. مستێکی بەسەر مێزەکەدا کێشاو نەڕاندی:

—کاتێ بە میهرەبانی دێمەوە ماڵ دەمەوێت ڕوویەکی گەش ببینم، دەنا جارێکی تر دەچمەوە دەرێ. حاڵی بوویت؟

دایکەنە لەبەرت، ژنەکە داوای لێکرد و چووە بەردەمی و هەوڵیدا پاڵتۆکەی لەبەرداکەنێ، بەڵام ئەو کێشای بە دەستیاو لە خۆیی دورخستەوە.

—مرۆ دێتەوە ماڵەوە و میهرەبانە، بەڵام بە ڕووتاڵی پێشوازی لێدەکرێ! نەڕاندی. سەیر نییە کە کەسێکی وەك من ژنێکی وەك جەنابتم هێناوە و سەرباری ئەوەش خۆم دوورەپەریز دەگرم. گەر بێت و من کەسێکی خراپتربم وەك لەوەی هەم ئەوا هەرگیز جارێکی تر لەم ماڵەدا چاوت بە چاوم ناکەوێتەوە. بەڵام من، دەگەڕێمەوە ماڵ و میهرەبانم و میوەشم بۆ کڕیویت، بەڵام تۆ تەنانەت سەیرێکی نێو کیسەکەش ناکەیت.

—سەیری نێویم کرد، ژنەکە ووتی.

—بەڵام شەیتان بمباتەوە سوپاسیشت نەکردم. نەڕاندی.

—سوپاست دەکەم، ژنەکە ووتی و دەستی بۆ درێژکرد، بەڵام کێشای بە دەستیاو دووری خستەوە لە خۆی.

—تاکە ئاسەوارێکی سوپاس لەلای تۆوە بەدی ناکەم، ئاژاوەچی نەفرەت لێکراو! سوێرین نەڕاندی.

—چۆن دەخوازی با وابێت، ژنەکە وتی و هەستی بەوە کرد کە ئیدی لەوە زیاتر لە توانایدا نەماوە.

ئاه، ژنەکە بیری کردەوە، هەرچۆنێ بێت گەرمن بە جۆرێکی تر بخوڵقامایە! پێویست بوو هەروەك ئانا بوومایە. ئەو بەهەر شێوەیەك پیاوەکەی بگەڕێتەوە ماڵ پێدەکەنێ و شادمانە. بە نەرمی هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکات و ڕێگای پێ دەدرێ جلەکانی مێردەکەی داکەنێ و بیخاتە نێو جێگاوە. هەندێ جار مێردەکەی دارکاریشی دەکات، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو هەر زەردەخەنەی بۆ دەکات. مرۆ دەگات بەو بڕوایەی ئانا هەست بە هیچ شتێك ناکات، بەڵام ئەو هەست پێدەکات. ئازاریش دەچێژێ. من دەیناسم. ئاه پێویست بوو منیش وەك ئانا بوومایە.

ژنەکە چووە چێشتخانەکەوە. سوێرینیش دووبارە شەبقەکەی بەلاری کردەوە سەری. قژە زەردەکەی بە تەوێڵیدا هاتبووە خوارێ. ژنەکە لە ڕادەبەدەر مێردەکەی خۆشدەویست. دەیویست مێردەکەی بگوشێ بەخۆیەوە. ئەوەی بۆ باس بکات کە قینی لە خۆی هەڵدەستێ چونکە ناتوانێ بێ هەست بێت هەروەك ئەوەی سوێرین لێی دەویست.

—پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە، سوێرین وای ووت و لەسەر تووڵی ئەردی ژوورەکە و چێشتخانەکەدا وەستابوو.

—پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە، سوێرین جارێکی تر ووتیەوە.

سوێرین بەم ووشانە گەلێك خۆشحاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەی تا ئێستا ئەم ووشانەی چەندین جار ووتبوونەوە هەروەك ئەوەی هەتا ئێستا ئەو وشانەی کە نەناسیبن، وای بۆ دەچوو. لەم وشانە ڕاستەقینەتر نییە! ئەم وشانە پڕ بە پێستی خۆیانن! بیری کردەوە، سوێرین وشەکانی بە بنمیچەکەدا بزمارڕێژ کرد و وشەکان بوونە (لەیلوك)ێك[4] بە چەشنێ سوێرین دەیتوانی هەموو زیندەگی خۆی پیادا هەڵبواسێت لەگەڵ ئەوەشدا لەیلوکەکە دەیتوانی هەڵیانگرێت.

—پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە، سوێرین ووتی. ئایە تۆ دەزانی کە من دەمتوانی گەلێك لەوە زیاتر لە شاردا بمێنمەوە؟ دەمتوانی ئێستا گەلێك خۆش ڕابوێرم. لەبری ئەوەی پیاو دەگەڕێتەوە ماڵەوە و میهرەبانە بەرامبەر ژنێکی وەکو تۆ. بە جەهەنم چم کە چەندە میهرەبان و گەمژەم!

ژنەکە کەوتبووە هاتوچۆکردن بە ناو چێشتخانەکەدا بێئەوەی بزانێت بەرەو کوێ پەنا بەرێت.

-"لەگەڵمان بمێنەوە" ریکارد پێی ووتم. "بە ماڵ ڕادەگەیت". نەخێر، من ووتم، ژنە قشتیلانەکەم چاوەنۆڕمە. دەخوازم بگەڕێمە ماڵەوە بۆ لای ژنە قشتیلەکەم. "چییە لە نەعلی ژنەکەت دەترسی؟" ریکارد هاواری کرد. مەگەر لە جەهەنم. بەڵام من حەز دەکەم لە ماڵەوە بم. من ژنە قشتیلەکەم خۆش دەوێت چونکە گەلێك نیانە. "هەر نەبێ تا مەیخانەکەی (گامبرین)[5] لەگەڵم وەرە"، ئەو ووتی. نەخێر، بەسە، من ووتم. من دەچمەوە ماڵ بۆ لای ژنە قشتیلەکەم. "پوکاویتەتەوە"، ئەو ووتی. "نهۆ گەلێ خۆش بۆ خۆمان ڕادەبوێرین، تاڕادەیەك قاپێ عارەقم مەیسەر کردووە. زۆریش دڵنیام لەوەی کە پێش ئێوارە چنگ لە قاپە عارەقەکە گیردەکەم". ئەو ووتی. "سوێرین، دەتوانی لەگەڵما بێیتەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵەکەی مندا مەگەر خوا بزانێت چەندە خۆش بۆ خۆمان ڕادەبوێرین"، ئەو ووتی. نەخێر، من ووتم. هەر ئێستا بەرەو ماڵ دەگەڕێمەوە. دەڕۆم بۆ (بێریس)[6] و کەمێ میوە بۆ ژنەکەم دەکڕم، من ووتم. ژنەکەم بۆ ڤیتامین باڵ دەگرێتەوە، من ووتم، من تەنها هەر قسەی باشم سەبارەت بە تۆ کرد نەفرەتت لێبێت ژن.

ژنەکە بەدیار تەباغەکەوە وەستابوو و پشتی کردبووە مێردەکەی.

-پیاو دەگەڕێتەوە ماڵەوە و میهرەبانە، هەمدیسان وای ووتەوەو گەلێك شادمان بوو بە دۆزینەوەی ئەم وشانە. وشەکان وەکو لەیلووکێك بەسەر سەریەوە هەڵواسرابوون، سوێرین بەرەو سەرەوە خۆی هەڵداو دەستی لە لەیلووکەکە گیرکرد، دەیتوانی گەلێك تەقلەی سەرسوڕهێنەر لێبدات. هەروەها گەلێك ڕووداوی هێنان و فڕێی دانە سەر لەیلووکەکە، لەگەڵ ئەوەشدا لەیلووکەکە زۆر باش خۆی ڕادەگرت. هەندێ جار خۆی بەلایەکی لەیلووکەکەدا هەڵدەواسی، کەچی لەیلووکەکە هەر خۆڕاگیر بوو.

-پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ! سوێرین تەنها هێندەی ووت.

سوێرین زۆر سەری لە خۆی سوڕما کە لە ماڵەوەیە. وەستانی ئەو لەو جێیەدا شتێکی هێجگار سەیر بوو هەروەك ئێستا کە وەستاوە.

-هەی خوای گەورە! هاواری کرد. خۆ من دەمتوانی لەگەڵ ریکارددا بڕۆیشتمایە. ئەو بەڕاستی بەڕەڵایەکی ڕاستەقینە و شادمانە. ئۆهۆی ئێستا لەگەڵ ئەو بوومایە دەبوو چەند خۆشم ڕاببواردایە! ئێستا پیاو دەیتوانی قاپێ عارەقی تەواوی دەستکەوتایە، ریکارد ئەوکات دەیتوانی سۆزانیش پەیدا بکات. پیاو دەیتوانی لەم ساتەدا لەگەڵ کچێکی حەشەریدا بنووستایە. لەبری ئەوەی پیاو دەگەڕێتەوە ماڵەوە بۆ ئێرە.

-سوێرین، ژنەکە وتی و هاتە پێشەوە و دەستی خستە سەر شانی. تۆ دەزانی کە من تەنها چاکەی تۆم دەوێت. دایکەنە لەبەرت. سبەینێ تەنها پەشیمانی دەنۆشیت گەر جارێکی تر بچیتەوە بۆ شار. گەر بیر لە من ناکەیتەوە، ئەوا بیر لە پارەکانت بکەرەوە.

سوێرین پاڵێکی بە ژنەکەیەوە ناو گەزێك دووری خستەوە لە خۆی.

-کاتێ کە سەیری تۆ دەکەم، سوێرین ووتی، زیاتر و زیاتر سەرم لەوە سوڕدەمێنێ کە گەڕاومەتەوە ماڵێ. بە جەهەنم چم، من دەبێ چەندە

میهرەبانبم! کاتێ کە لە تۆ دەڕوانم دەگەمە ئەو ڕایەی، من دەبێت میهرەبانترین پیاو بم لەم گۆی زەوییەدا.

ژنەکە سوێرینی بەجێهێشت و نەیدەزانی چی بکات.

–بە جەهەنم کە چەندە میهرەبانم! سوێرین هاواری کرد.

ژنەکە تەمەنای دەخواست بیتوانیایە زەردەخەنەیەك بیگرێت و گاڵتە لەگەڵ سوێریندا بکات. ئانا دەیتوانی کاتێك مێردەکەی بە سەرحاڵی بۆ ماڵ دەگەڕایەوە لەگەڵیا بکەوێتە گاڵتەوگەپ کردن. سەرباری ئەوەش ئانا دڵی ژانی دەکرد کەچی پێدەکەنی و زەردەخەنەی بەڕوودا دەکرد. مێردەکەی بە هیچ جۆرێ دەرکی بەوە نەدەکرد کە ئانا چەند پەرێشان بوو. ئانا ژنێکی ئێجگار مەزن بوو. ئەم هەرگیز ناتوانێ بگات بەو پایە بەرزەی ئانا. نەیدەتوانی بێ هەست بێت. نەیدەتوانی حەقیقەت و ڕاستی بکوژێت و بێدەنگ بێت. ئەم مرۆڤێکی بێ چارە و کۆیلەیە، خۆی ئەمەی دەزانی، بەڵام بەرامبەر ئەمە بێ دەسەڵات بوو.

ژنەکە چووە ناو گەنجینەکە و پڕ مەنجەڵێکی دەستی پەتاتەی هێنا. پاشان مەنجەڵە دەستییەکەی برد بۆ لای بەلوعەکە و دەستی کرد بە شۆردنەوەیان. ئەمانە هیچی پێویست نەبوون. بۆ خۆی چێشتی نەدەویست و سوێرینیش هەروەها. بەڵام خۆ خەریك کردن بە شتێکەوە سەبوری پێدەدات.

–پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە، جارێکی کەش ووتیەوە، بەڵام ئێستا وەکو کەمێك پێش لە ئێستا هەستی بە شادمانی نەدەکرد.

بە سیمایەکی بەتاڵ لە دەربڕین سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. لەوە بەدوا وشەکان لەیلووکێك نەبوون بەسەر سەریەوە. وشەکان پەرژینێك بوون لە نێوان سوێرین و ژنەکەیدا. ئەگەر بهاتایە و ژنەکە ئەوەی لەبەرچاو بگرتایە کە ئەم هەرچۆنێك بێت گەڕاوەتەوە ماڵێ! سوێرین وای بیر دەکردەوە. گەر بهاتایە و بەهایەکی بۆ کیسە مێوەکەی ئەم دابنایە. ژنەکەش لەوە بگەیشتایە کە ئەم تەنها فریوی نەخواردووە بەڵکو بەسەر گەلێ شتدا زاڵ بووە، بەڵێ، ئەو بەسەر سەختترینیاندا زاڵ بووە، نەدەبوو بە پاڵتۆ و شەبقەکەیەوە ڕابوەستێ، لەبری ئەوە دەبوو ئێستاکە ژنەکەی لە ئامێزدا بوایە.

–پیاو دەگەڕێتە ماڵەوە و میهرەبانە، وای ووت.

بەڵام هەنووکە هیچی بەم ووشانە دەستگیرنەبوون. نائومێد بوو. خوای گەورە، بیری کردەوە، ژن و مێردایەتی ئێمە چەندە سەرنەکەوتووە. من چەندێ گێل و دۆڕاوم. دەبوو من بە جۆرێکی تر بوومایە. تیوراش دەبوو پیاوێکی کەی بە نسیب ببوایە، هەموو کەس دەڵێن کە تیورا ڕێك و پێکترین ئافرەتە لەم دەوروبەرەدا. تیورا ماڵداری دەزانێ، ئەمان ماڵداری! باشە بەجەهەنم بۆچی من هێندەی ئەو ڕێکوێك نیم؟ باشە تەنها تۆزقاڵێ ڕێکوپێکی ئەوم بۆ بەرناکەوێت؟

سوێرین سەیرێکی تیورای کرد. تیورا بەروانکەیەکی پیسی خەت خەتی بەسەر بەروانکە سپییەکەیەوە بەستبوو دواتر لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و مەنجەڵە دەستییە گەورەکەی خستبووە سەر کۆشی. بە تەنیشتیەوە لەسەر زەوییەکە تۆزێ ئاوی لە لەگەنێکی چینی سپیدا دانابوو، پەتاتە پاککەرەیەکی زەردی بەدەستەوە

گرتبوو. پێشتر گەلێ سەلکە پەتاتەی پاک کردبوون. پاش هەر تۆزێک و سەلکێ پەتاتەی سپی نوقمی نێو ئاوی لەگەنە چینیەکە دەکرد. زۆر بە وریاییەوە توێکڵی بە تەنکی پەتاتەکانی پاک دەکرد، هەموو چاوە ڕەشەکانی سەلکە پەتاتەکانی بە نووکی پەتاتە پاککەرەوەکە هەڵدەکۆڵێن و فڕێی دەدان. بەو زووانە توێکڵی پەتاتە پاککراوەکان سەری پەتاتەکانی نێو مەنجەڵە دەستییەکە دادەپۆشن. ناچاربوو تا دەهات زیاتر دەستی ڕووەو قوڵایی بەرێ بۆئەوەی دەستی لە سەلکە پەتاتەکان گیر ببێت.

سوێرین دەمێک بوو وەستابوو و لە تیورای دەڕوانی. تا دەهات بێ ئومێدی باڵی بەسەردا دەکێشا. بە ناچاری نەبوایە ئەم بارگرانیەی بۆ هەڵنەدەگیرا.

–پیاو دەگەڕێتە ماڵەوە و میهرەبانە! دیسان هاواری کرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەی پیاو بە میهرەبانی دەگەڕێتەوە کەچی ڕووبەڕووی ژنێکی نەفرەتی دەبێتەوە کە ناتوانێ دڵی کەسێ بۆ تەنها هەناسەیەک ڕابگرێت. کە هاتمە ئەمدیووی دەرگاکەوە تەنها پێویستیم بە بینینی سپێتی چاوی تۆ بوو بۆئەوەی تێبگەم کە: خوایە چەند گێلم، کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای ئائەمە و میهرەبانیشم.

ژنەکە پەتاتەی پاک دەکرد و بێدەنگ بوو. ئیدی لەوە حاڵی بووبوو کە سوێرین جارێکی تر دەچێتەوە بۆ شار. بەردەوام دەبێت لە خواردنەوەو پارە سەرف کردن و تێکدانی جەستە و ویژدانی خۆی. دەیەوێت لەگەڵ ئا ئەو ریکاردەدا بچێتەوە ماڵ. هەردووک تا لە ووزە دەکەون دەخۆنەوەو ئافرەتی تریش پەیدا دەکەن.

ئاه! ناخی جۆشی سەند. ئەم بۆچی نەبوو بە کەسێکی جوودا؟ بۆچی نەیدەتوانی ئاواتی چوونە ژێر ڕکێفی مێردەکەی یەکالا بکاتەوە؟

–پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە! هاواری کرد. بەڵام پیاو ناتوانێ لە ماڵەوە بمێنێتەوە. خوات لەگەڵ!

سوێرین بەسەر پەرژینی ووشەکانیدا لە دەرگاکەوە بەرەو ژووری چێشتخانەکە خۆی چەماندەوە. هەستی بەوەکرد گەیشتۆتە ئەوپەڕی نالەباری، بەڵام نەیدەتوانی ڕێگە لەو پێکدادانەی سیمای و بە سوک سەیرکردنی ڕاگرێت بەرامبەر ژنەکەی.

–خوات لەگەڵ، ژن! هاواری کرد.

سوڕێکی ڕووەو دواوە خوارد و دەستی کرد بە فیکە کێشان. چەند جارێک بە دەوری مێزەکەدا سوڕایەوە. ڤێجا بۆ ستێپ کردن خۆی ئامادەکرد. ئەمەیان بۆ ماڵئاوایی بوو.

ترارارەپ رەپ رەپ! ترارارەپ رەپ رەپ!

ژنەکە دەستی لە پەتاتە پاککردن هەڵگرتبوو. چاوی لەسەر توێکڵی پەتاتە باریک و بۆرو لوول خواردوەکانی ناو مەنجەڵەکە بڕیبوو. لە ناکاودا وا هاتە پێش چاوی کە ئەمە مێشکێک بێت، مێشکی مرۆڤێک، یا وەکو لەوانەیە مێشکی خوا بێت، یان لەوانەیە مێشکی (بوون) بێت، کە لە ناو مەنجەڵەکەی سەر کۆشیدا پەرش و بڵاوبۆتەوە.

نائومێدیەکانی ژنەکە تێکڕا یەکیان گرت و بۆ یەکجاری جێگیربوون. بە جۆرێ سنووری دەرەوەی کەسایەتی ئەویان بڕی. ئەو بێئومێدیە هەموو ڕاستییەکانی گرتەوە. هیچ شتێک بەرەو لایەکی ڕۆشن ڕانەدەبوورد. ئەوەی کە بەهێزترین بنەمای

هەبوو هەرەسی دەهێنا. هەموو شتێ شایستەی بێئومێدی بوو.

ئەو ژانەی کە تووشی هات نزیك بوو لە سڕبوون. ژانەکە ژنەکەی لەناو تەمێکی ڕەشدا دەپێچایەوە. ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بوایە ئەوا تیورا زایەدەبوو. پاشان بیری کردەوە. نەیدەتوانی لەناو ئەم چوارچێوە ترسناکەدا بوونێکی هەبێت. دوور، گەلێگ دوور گوێی لە دەنگی ستێپە گاڵتەجاڕی و ماڵئاوایی کەرەکەی سوێرین بوو. دەنگی ستێپەکە زیاتر و زیاتر نەدەما و دەگەیشتە توێی دەرەوەی بێدەنگی.

ڤێجا لەناکاو ژنەکە لە جێگەی خۆی ڕاپەڕی و لە چێشتخانەکەوە ڕایکرد بۆ ژوورەکەو پەلاماری سوێرینی دا.

–سوێرین! من لە ڕادەبەدەر دەترسم! هاواری کرد. پێویستە تۆ یارمەتیم بدەی!

ژنەکە خۆی نوساند بە سوێرینەوەو توند دەمی نا بە دەمیەوە.

ئای، چەندم خۆش دەوێیت، چەندێ مەزن خۆشم دەوێیت! ژنەکە بەبەر گۆنایدا دەیچرپاند. بمبەخشە. ئەمە هەڵەی منە. لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم پێبکە. بێ هاوتا تۆم خۆشدەوێت. من دەمەوێت بە تەواوەتی بەو جۆرەبم کە تۆ دەخوازیت.

سوێرین خەریك بوو بە تەواوی نەشئەی سەرخۆشیەکەی بەریبدا. وەك بەوەی کوتەکێك بەر ناوقەدی کەوتبێت. هێند شەرمەزاری دایگرت تفی بۆ قوت نەدەدراو نەیدەتوانی هەناسە بدات. هەستی دەکرد گەر ژنەکەی لە چرپاندنی ئەو ووشانە نەوەستێ ئەوا دەست دەکات بە گریان. ئاه ئەو دەیتوانی ژیانی لە پێناوی ژنەکەیدا بەخت بکات بۆئەوەی بە گەشاوەیی بیبینێت. دەیزانی خۆی بۆ هیچ شتێکی تر بەهای نییە. ڕامووسانی، ماچ کردنی: هەموو شتێکی لەو بابەتانە مەحاڵ و بێ لێبوردن بوو، ئەو دەیتوانی لە پێناویدا بمرێت، دەنا هیچ شتێکی تر گوناهەکانی لەناو نەدەبرد.

ئەم بەربادە لەپێکە، بە دەنگێکی گڕ سوێرین ووتی. وازی لێبێنە با بۆگەن کات.

کەچی تیورا سوێرینی بەرەو تەختە درێژەکە ڕاکێشا. تـوانی پاڵتۆو چاکەت و یەخەکەی بەر لاملی دابکەنێ. هەردووك ڕاکشان و چەندین سەعات بە بێدەنگی خۆیان بە یەکتریەوە دەگوشی. ئازاری ناو دەرونی هەردووکیان ڕەوییەوە. سوێرین دەرکی بەوە دەکرد کە نەبۆتە کەسێکی جیا، ژەنەکەشی بەهەمان شێوە. هەردووکیان دەیانزانی ئەوەی ئەمشەو ڕوویدا دووبارە دەبێتەوە، لەوانەیە شەممەی داهاتوو بێت، یاوەکو ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی تر. بەڵام ئەم دەرك پێکردنە نەبووە بەربەستێك لە نێوانیاندا. بەڵکو بە پێچەوانەوە بووە هۆی ئەوەی کە بە قوڵی و تەواوی چێژی یەکتری بکەن.

## پەراوێز

1–گالۆش: جۆرە نایلۆنێکە دەکرێتە بەرگێك بۆ پاراستنی پێڵاو لە ئاو.

2–ستێپ: جۆرە سەمایەکە، کە ناسراوە بە دەنگ و خێرایی پێ کوتان بە زەویدا.

3–ڕۆنان: ناوی مەیخانەیەکە.

4–لەیلووك: جۆلانەی سێرك.

5–گامبرێن: ناوی مەیخانەیەکە.

6–بێریس: ناوی بازاڕێکی میوە فرۆشتنە.

## سەرچاوە

*Lars Ahlin، Inga Ogon Vantar Mig، Kommer hem och ar snall، P.5-16.*

# شیکردنەوەی چیرۆکی "دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە"ی لاش ئالین

نووسینی: نیلس ئۆکێ خوێستراند

دووهەم پەرتووکی لاش ئالین، کۆمەڵە چیرۆکی هیچ چاوێك هیچ چاوەڕوانم نییە (1944)، بە چیرۆکی دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە دەسپێدەکات. خودی سەرناوی بەرهەمەکە رووی دەرەوەی ناواخنی چیرۆکەکە دەخاتەڕوو. ئەگەر ئەمە کارەکتێرێك بێت بۆ فۆرمی هونەری چیرۆك جیاواز لە ڕۆمان ئەوە دەردەخات کە چیرۆك لە تەنها یەك ڕوداودا کۆدەبێتەوە، ئەمەش نموونەی کورتە چیرۆکە: چیرۆکەکە تەنها باس لەوەوە دەکات کەچی ڕوودەدات لە کاتێکدا کە ڕۆژێك سوێرین هێلگرێن "دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە". سوێرین کەمێ زیاد لە ڕادە لە مەیخانەکە ماوەتەوە: کاتێك هەنوکە دەگەڕێتەوە ماڵ کیسەیەك مێوەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، لەوانەیە بۆئەوەی بێت تا ژنەکەی پێ ئەهوەن بکاتەوە، ئەوەی کە سەرنجی دەدەین لە چیرۆکەکەدا پێشوازی کردنەکەیەتی لە کاتی گەیشتنەماڵەوەیدا. ئامادەکردنی ئەم دیمەنە تەنها کەسایەتی سوێرین هێلگرێن و ژنەکەی نادات بەدەستەوە. بەڵکو هەروەها لاش ئالین شیکردنەوەیەکی خۆشەویستی و مەرجەکانی پێکەوە ژیانیش دەدات بە دەستەوە کە ڕوانگەی بینین زیاتر واڵا دەکەن.

لەخۆگرتنی شێوەی (بابەتیانە) زاڵە بەسەر تەکنیکی گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا: چیرۆکنووس ئەوەی کە ڕوودەدات دەیدا بەدەستەوە و دیالۆگی کەسەکانیش دووبارە دەکاتەوە. مۆنۆلۆژی دەرونی چاوەڕوان ناکرێت، بە پێچەوانەی ئەمەوە چیرۆکنووس دەربڕینێکی شارەزایانە دەدات بەدەستەوە لە سەرچاوەی بیروبۆچوون و پێناسەکردن لەگەڵ ئەوەی کە چی لە ناخی مرۆڤدا ڕودەدات. ئەم تەکنیکی دیمەنە بابەتیە دەتوانرێ بە دێڕەکانی سەرەتا بهێنرێتەوە:

ئەو دەمەی سوێرین هێلگرێن کەمێ بە سەرحاڵیەوە گەڕایەوە ماڵ تەنها (گالۆش)ەکانی لە بەردالانەکەدا لەپێداکەند. شەبقەکەی بە پشتی ملیا شۆڕکردەوە، دوگمەکانی پاڵتۆکەی ترازاند و هەنگاوی بەرەو ژوورەوە هەڵێناو هەوڵیدا خۆی بەئاگاو شادمان نیشان بدات.

–وا هاتمەوە. ئایە چاوەنۆڕکراو بووم؟ سوێرین ئەمەی بە گاڵتەجاڕیەوە ووت.

کیسەیەکی ڕووەو ژنەکەی ڕاگرتبوو.

ژنەکەی سەرقاڵی ماڵ پاککردنەوە بوو. نهۆ گەلێ شتی لەناو کاوەنتەرەکە دەرهێنابوون و خستبوونیە سەر مێزەکە. تەنها دەقەیەك پێش ئێستا پەڕۆی تۆز پاککردنەوەکەی بەدەستەوە گرتبوو، بەڵام ئێستا وای پیشاندەدا هەروەك دەمێك بێت خەریك بووبێت. لێ هەر ئێستا بەر پەنجەرەکەی بەجێهێشت. چەند سەعاتێك بوو لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو و چاوی بۆ سوێرین دەگێڕا.

هەروەها لەم سیتاتەدا[1] دەردەکەوێ کە چۆن یەکەی کاتیش دەستەبەر کراوە. بەسەرهاتەکە لە چیرۆکەکەدا بەشێوەیەکی بەهێز لەسەر پلانی هەنوکەیی چەقی بەستووە، هەنوکەیی کاتەکە پاش گەیشتنە ماڵەوەی سوێرینە، بەڵام هەروەها باگراوندێکی کورت لە دوو جێدا دەبینرێت: "تەنها دەقەیەك پێش ئێستا". ئەو باگراوندانە بە زۆری لە کاتی باگراوندی ژنەکەدا دەبینرێت بۆ کەسایەتی خۆی هەروەها لە دیالۆگەکانی سوێریندا دەربارەی هاتووچۆکردنەکانی بۆ مەیخانە. لەوەبەدوا پلانی ئێستا زاڵ دەبێت بەسەریدا.

بەڵام هەروەها سیتاتی ئەو دەستپێکردنەی کە هێنراوەتەوە بۆچوونێکی تری کات لە هۆشمەندیدا بەرەو داهاتوو لە خۆ دەگرێت. چیرۆکنووس سەرنجڕاکێشانێك دەخاتەڕوو کە داڕوخان دەسەپێنێ. ئەو دوو کەسەی کە سەودای ڕێککەوتن دەکەن یاخود خۆ ئامادەدەکەن بۆ ڕووبەڕوبونەوەکەیان: پیاوەکە تەنها گالۆشەکانی لە پێ دادەکەنێ و جلی چوونەدەرەوە لەبەرخۆیدا دەهێڵێتەوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پیاوەکە دووبارە بیر لە دەرچوون دەکاتەوە یاوەکوو لەوانەیە ئەوە تەنها بۆ هەڕەشەکردن بێت بۆ دووبارە چوونە دەرەوەی، ژنەکەش لەلای خۆیەوە "وای پیشاندەدا" کە دەمێکە لەگەڵ ماڵ پاککردنەوەکەیدا خەریك بووە، لەوانەشە بۆ ئەوەبێت تا ئەوە بشارێتەوە کە چەندین سەعات وەستاوە و چاوەڕوانی پیاوەکەی بووە یاوەکوو بۆ ئەوەی ئەوە نیشان بدات کە کاری کردووە لە کاتێکدا کە مێردەکەی خەریکی سەرگەرم کردن بووە. ئەوە ئاشکرایە کە هەردووکیان خۆ ئامادە دەکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەکە تا لەڕێی ئەوەوە پێناسەی خۆیان بکەن. سوێرین "هەوڵیدا خۆی بە ئاگا و شادمان نیشان بدات" لەگەڵ ئەوەشدا سوێرین ناڕەحەتە لەبەرئەوەی کە چاوەڕوانی ناڕەزاییە و هەروەها کاری گسکدانەکانی تیوراش جۆرێکە لە ماسك بەکارهێنان. یەکەم حیواری سوێرین "گاڵتەجاڕی" بوو و لەوانەیە بەرابەری کردنێك بگەیەنێ – هێرش بردن باشترین خۆپاراستنە.

یەکەمین دەمەقاڵێیان لەلایەن ئەو پایانەوە نیشان دەدرێ کە لە دەستپێکردنەوەکەدا نەخشەی بۆ دادەنرێت: ژنەکە پیاوەکە دەخاتە بەردەم بەرپرسیاری "بۆ قسەی خۆت ناهێنیتە جێ؟"، پیاوەکە بەدوای پەیوەندیدا دەگەڕێ (کیسە مێوەکە ئامڕازە)، پیاوەکە ستێپ دەکات و "سوڕێکی بچکۆلە" دەخوات – وەکو داخوازیی کردنێك. ژنەکە لە پاڵ گسکدانەکەیدا و پشت کردن لە پیاوەکە حەربایانە ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت. کاتێ پیاوەکە کەمەری ژنەکەی دەگرێت و هەوڵ دەدات ماچی بکات ژنەکە ڕاستەوخۆ بەرپەرچی دەداتەوە ئەمەش بەوە کۆتایی دێت کە پیاوەکە هەڕەشەی دووبارە چونەدەرەوە دەکات. ئەو هەڕەشە ڕاستەوخۆییە خاڵی وەرچەرخان دەستنیشان دەکات: ژنەکە لە خۆپیشاندانی گسکدان دەست هەڵدەگرێ و هەوڵی ئەوە دەدات کە وا لە پیاوەکە بکات بمێنێتەوە. چیرۆکنووسەکە چەقی کێشەکە پیشاندەدات بە بەجێهێشتن و سازکردنی دیمەنەکان کە دواتر دێت کەمێ باسی تیوراش دەکات، شێوەی ڕوخساری، دەربارەی هاوڕێکانی کە زۆربەی جار ڕێنمایی تیورایان کردووە کە بە "ژیری" ڕەفتار لەگەڵ سوێریندا بکات و بەدوا وشەش بە ساکاری باگراوندی ئەو دیمەنانەی کە ئێستا بینەری بووین

دەدات بەدەستەوە: "نەیتوانی نەرم بێت و قایل خۆی نیشانبدا. هەروەها ئەوەش فەرامۆش بکات کە پیاوەکەی سەرخۆشە و هەڵەی کردووە." ژنەکە هەمان ئاکار و ڕێکوپێکی بەو شێوەیەش کە لە خۆی داوا دەکات و هەر ئەمەشە کە بۆتە بەربەستێك لە نێوانیاندا.

دوای ماوەی گفتوگۆی نێوان هەردوکیان شێوازێك وەردەگرێت کە ژنەکە بەدوای نزیك بوونەوەیەك لە پیاوەکە دەگەڕێت بەڵام ئەمە بە دۆڕانێکی تر کۆتایی دێت. کاتێك پیاوەکە داوای ماچێ لە ژنەکەی دەکات، ژنەکە توندوتیژی بەکاردەهێنێ و ڕێگە بە پیاوەکە نادات ماچێکی بکات. بەڵام ژنەکە ناتوانێ ڕێ لە فرمێسکەکان بگرێ کە بە گۆناکانیدا برژێنە خوارێ، هەر ئێستا کێشەکە دەست بە گرژییەکی توند دەکات. ساتێ ژنەکە هەوڵی ئەوەیدا پاڵتۆکە لەبەر پیاوەکە دابکەنێ و لە هەمان کاتدا پشوویەك بدا "بەڕاستی چێشتێکی بەلەزەت" بۆ پیاوەکە لێدەنێ، پیاوەکە وەڵام دەداتەوە کە برسی نییە. لەپڕدا توند و تیژی دەگەڕێتەوە بۆ ژنەکە: ژنەکە وای دێنێتە پێش چاو کە پیاوەکە لە مەیخانەکەدا خواردوویەتی و خواردوویەتیەوە. حیواری ژنەکە: "چەندت پارە بە زایە داوە؟" وا لە پیاوەکە دەکات بۆکسێ بەسەر مێزەکەدا بکێشێ و ژنەکە بانگ کات بە "ئاژاوەچیی نەفرەت لێکراو" هەروەها بکێشێ بە دەستی ژنەکەدا و دووری بخاتەوە لە کاتێکدا ژنەکە سوپاسی دەکات بۆ کیسە مێوەکە بەبێ ئەوەی پیاوەکە بە هیچ جۆرێ نیشانەی سوپاسکردن لەلای ژنەکەی بەدیبکات. ژنەکە هەست دەکات کە ئیتر لەوە زیاتر لە توانایدا نەماوە.

بەو جۆرە چیرۆکنووس بەردەوام دەبێت لە سەرچاوەی بیروبۆچونێکدا تا ڕێگە بە تیورا بدا باری خۆی شیبکاتەوە. تیورا خۆی دەچوێنێ لەگەڵ هاوڕێیەکیدا کە لە هەمان باری وەکو خودی ئەودایە بەڵام ئەو ژنە توانای هەیە کە لەسەرخۆ و هێمن بێت لەگەڵ مێردەکەیدا، هەتاوەکو لەو کاتەی مێردەکەی دارکاریشی دەکات زەردەخەنەی بە ڕوودا دەکات. "مرۆ دەگات بەو بڕوایەی ئانا هەست بە هیچ شتێك ناکات، بەڵام ئەو هەستی پێدەکات. ئازاریش دەچێژێ. من دەیناسم. ئاه پێویست بوو منیش وەك ئانا بومایە." و تیورا قینی لە خۆ هەڵدەستێ لەبەرئەوەی کە ئەو ناتوانێ "بێ هەست" بێت بەو شێوەیەی کە سوێرین لێی دەخوازێت.

کاتێ دیالۆگەکە بەردەوام دەبێت گۆشەی وەرچەرخانی بینینێکی تر دەردەکەوێت: ئەوە تاڕادەیەك تەنها سوێرینە کە دەپەیڤێ و چیرۆکنووس باسی دەکات کە بیر لەچی دەکاتەوە و چۆن دەژێ. جار بەدوای جار سوێرین ئەو حیوارەی خۆی دووبارە دەکاتەوە: "پیاو دەگەڕێتەوە ماڵەوە و میهرەبانە" و سوێرین هەرچی هەیە بەشێوەی ستایش کردنی درێژ دەریدەبڕێ، ئا لەوێدا سوێرین هێڵ بەژێر ئەوەدا ڕادەکێشێ کە چەندێ خۆش دەیتوانی ڕاببوێرێ ئەگەر بهاتایە و هاوڕێکەی مەیخانەی جێنەهێشتایە و لەجیاتی ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی "میهرەبانە بەرامبەر ژنێکی". چیرۆکنووس وێنەیەك بەکاردەهێنێ کە زۆر بە ئاشکراو ڕوون نیشانی دەدات کە چۆن سوێرین بە تەواوی خۆی دەنوسێنێت بە کەوانی حیوارە گێڕەکانییەوە و هەموو هەڵسوکەوتی خۆی لەسەر ئەوەدا بنیاد دەنێ:

سوێرین بەم ووشانە گەلێك خۆشحاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەی تا ئێستا ئەم وشانەی چەندین جار ووتبونەوە هەروەك ئەوەی هەتا ئێستا ئەم وشانەی نەناسیبێت، وای بۆ دەچوو. لەم وشانە ڕاستەقینەتر نییە! ئەم وشانە پڕ بە پێستی خۆیانن! بیری کردەوە، سوێرین وشەکانی بە بنمیچەکەدا بزمارڕێژ کرد و وشەکان بوونە لەیلووکێك بە چەشنێ سوێرین دەیتوانی هەموو زیندەگی خۆیی پیادا هەڵبواسێت لەگەڵ ئەوەشدا لەیلوکەکە دەیتوانی هەڵیانگرێت.

پێچاوپێچی لەیلووکەکە دەبێت بە وێنەیەکی زۆرباش بۆ دووبارەکردنەوەی ئەو ڕستەیەی کە لە ژێر کاریگەری نەشئەی خواردنەوەکەیدایە وە ئەو هەست بە شادمانی کردنەش پەیوەستە بەوەی کە چی لە دڵدایە بیڵێت. وە هەروەها بەشێك لە فشەکردنیشی لەگەڵدا دێت: ژنەکە هێڵ بەژێر ئەوەدا ڕادەکێشێ کە پیاوەکەش سەربەخۆ لە بابەتی ڕابواردن لەگەڵ ریکارد و نیوەقاپە عەرەقەکەی وازی هێناوە و پیاوەکە سەری سوڕدەمێنێ دەربارەی ئەوەی کە خۆی چەندە میهرەبانە: "بەجەهەنم چم، من دەبێ چەندە میهرەبانبم! کاتێ کە لە تۆ دەڕوانم دەگەمە ئەو ڕایەی، من دەبێت میهرەبانترین پیاوبم لەم گۆی زەوییەدا".

تیورا تەنها یەك قسەی پێ دەبڕێ لە ماوەی هەموو مۆنۆلۆژەکانی سوێریندا بە ئامۆژگاری کردنێك کە پێویستە بیربکاتەوە پێش ئەوەی جارێکی کە بچێتەوە بۆ شار.

کەچی پیاوەکە تەنها ژنەکە لە خۆی دووردەخاتەوە. کاتێ گۆشەی بینین بۆ چاوتروکاندنێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکە، بەشێوەیەکی گشتی ژنەکە خۆی لەگەڵ خۆیدا ڕێککەوتنەکانی دووبارە دەکاتەوە: ژنەکە ئاواتی ئەوەی دەخواست کە بتوانێ "گاڵتە لەگەڵ سوێریندا بکات". بەڵام ژنەکە نەیدەتوانی بێهەست بێت، "نەیدەتوانی بێ هەست بێت. نەیدەتوانی حەقیقەت و ڕاستی بکوژێت و بێدەنگ بێت". سەرچاوەی بیروبۆچونێك هێڵ بە ژێر وەڵامی پێشووی ئاکارخوازی ژنەکەدا ڕادەکێشێ. کە لەهەمان کاتدا سوێرین بە شادمانییەوە پێچ دەخواتەوە بە نێو لەیلووکی وشەکانیدا و هێرش دەباتە سەر ڕووی ترشی ژنەکە، تیورا هەموو کاتەکە هۆشمەندە بە پابەندی و ژێردەستەیی لە هەڵوێستیدا بەرامبەر پیاوەکە و تەمەنایەکی بێچارە و نەگونجاوی هەیە تا خۆی ببێتە جۆرە کەسێکی تر. بۆئەوەی تیورا کارێك بە ئەنجام بگەیەنێ کەچی زۆر بێمانایانە دەست بە پاککردنی پەتاتە دەکات، سوێرین بەردەوام دەبێت لە دووا پێکادانی لەناو لەیلووکی ووشەکانیدا: "پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە"، بەڵام ئێستا لەلای سوێرین گۆڕانکارییەکی پەلە لە دۆخەکەدا دەردەکەوێت. چیرۆکنووسەکە ئەمە بە وێنەیەکی نوێ فۆرمولە دەکات: "لەوە بەدوا ووشەکان لەیلووکێك نەبوون بەسەر سەریەوە. وشەکان پەرژینێك بوون لە نێوان سوێرین و ژنەکەیدا".

چیرۆکەکە ئێستا لە دواهەمین قەیران – و خاڵی گۆڕان زۆر بە پەلە نزیك دەبێتەوە. ئێستا دیالۆگە ڕاستەوخۆکان کەمتر ڕۆڵی کاریگەر دەبینن لە کاتێکدا چیرۆکنووسەکە زیاتر ڕۆڵی سایکۆلۆژی سەرچاوەکان و کۆمینتارگێڕی دەبینێت.

لە سەرەتادا ڕێگەمان دەدرێت بەدووی سوێرین بکەوین. سوێرین لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ ووشەکانی

خۆیدا بژیەتەوە کەچی بە نوچدا دێت. سوێرین ئێستا بە هەمان خۆ داچونەوەدا دەڕوات وەکو ئێستا تیورا هەیبوو: "بەڵام هەنوکە هیچی بەم ووشانە دەستگیر نەبوون. نائومێد بوو. خوای گەورە، بیری کردەوە، ژن و مێردایەتی ئێمە چەندە سەرنەکەوتووە. من چەندێ گێڵ و دۆڕاوم. دەبوو من بە جۆرێکی تر بوومایە. تیوراش دەبوو پیاوێکی کەی بە نسیب ببوایە. هەموو کەس دەڵێن کە تیورا ڕێکوپێکترین ئافرەتە لەم دەوروبەرەدا". سوێرین ماوەیەکی درێژ ڕادەوەستێ و سەیری تیورا دەکات کە چۆن خۆی خەریکی پەتاتە پاککردنەوە کردووە و بێئومێدی سوێرین قوڵتر دەبێتەوە کە تەنها لە نێو نوچدانێکی نوێدا دەتوانێ ڕای خۆی دەربڕێ: پیاوەکە پاش یەکانگیربونێکی نوێ دژی ژنەکەی هاوار دەکات خوات لەگەڵ. هەردووکیان ئێستا نزیک بە جۆرێك لە نزمترین ئاست دەبنەوە — مرۆ دەتوانێ هێمای ئەوە بکات کە چۆن کۆمینتارگێڕە سایکۆلۆژییەکە گۆشەنیگا و پێناسەکردنی پایەی هەردووکیان دەسوڕێنێتەوە بە حیواری ماڵئاواکردنی سوێرین:

ئاه! ناخی جۆشی سەند. ئەم بۆچی نەبوو بە کەسێکی جوودا؟ بۆچی نەیدەتوانی ئاواتی چوونە ژێر ڕکێفی مێردەکەی یەکالا بکاتەوە؟

–پیاو دەگەڕێتەوە ماڵ و میهرەبانە! هاواری کرد. بەڵام پیاو ناتوانێ لە ماڵەوە بمێنێتەوە. خوات لەگەڵ!

سوێرین بەسەر پەرژینی وشەکانیدا لە دەرگاکەوە بەرەو ژووری چێشتخانەکە خۆی چەماندەوە. هەستی بەوەکرد کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی نالەباری، بەڵام نەیدەتوانی ڕێگە لەو پێکدادانەی سیمای و بەسوك سەیرکردنی ڕاگرێت بەرامبەر ژنەکەی.

–خوات لەگەڵ، ژن! هاواری کرد.

بەڵام جیاوازیی هەیە لە نێوان پایەی سوێرین و تیورادا: سوێرین بەهۆی نائومێدی بوونیەوە ناچار دەبێت کە حاڵەتەکە بکات بە کێشەیەك، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە سوێرین ژنەکەی خۆش دەوێت کەچی بەردەوام دەبێ لە هێمای سوکایەتی کردن و هێرشکردنە سەر ژنەکەی وە هەروەها ئەگەر بێت و سوێرین هۆشیاری دەربارەی ئەوە هەبێت کە وشەکانی خۆی ڕۆڵی پەرژینێك لە نێوانیاندا دەبینێ، بەڵام ئەو بەربەستە سایکۆلۆژیە لەلای سوێرین نییە بۆ ئەوەی بەڕاستی بە یەکتری بگەن لەم هەنوکەییەدا.

گرنگترین بەربەست لەوێدایە کە تیورا هێشتا بە هەمان شێوە لە پایەی خۆیدا چەقیوە کە بەشێوەیەکی گشتی هەموو کاتەکە لەوێدا تیورا گیری خواردووە. چۆن گرێکە لەلای تیورا دەکرێتەوە ئەوا لەم پارچەیەی کە دێت ڕوندەکرێتەوە — مرۆ هێما بەوە دەکات کە کلیلی وشەکە لێرەدا هەمان کلیلی وشەیە وەك هەمان ڕونکردنەوەی گۆڕانکاری لەلای سوێرین: نائومێدی.

ژنەکە دەستی لە پەتاتە پاککردن هەڵگرتبوو. چاوی لەسەر تویکڵی پەتاتە باریك و بۆر و لوول خواردووەکانی ناو مەنجەڵەکە بڕیبوو. لەناکاودا واهاتە پێش چاوی کە ئەمە مێشکێك بێت، مێشکی مرۆڤێك، یاوەکو لەوانەیە مێشکی خوا بێت، یان لەوانەیە مێشکی (بوون) بێت، کە لە ناو مەنجەڵەکەی سەر کۆشیدا پەرش و بڵاوبۆتەوە.

نائومێدیەکانی ژنەکە تێکڕا یەکیان گرت و بۆ یەکجاری جێگیربوون. بەجۆرێ سنووری دەرەوەی کەسایەتی ئەویان بڕی. ئەو بێئومێدیە هەموو ڕاستییەکانی گرتەوە. هیچ شتێك بەرەو لایەکی ڕۆشن ڕانەدەبوورد. ئەوەی کە بەهێزترین بنەمای هەبوو هەرەسی دەهێنا. هەموو شتێ شایستەی بێئومێدی بوو.

ئەو ژانەی کە تووشی هات نزیك بوو لە سڕبوون. ژانەکە ژنەکەی لەناو تەمێکی ڕەشدا دەپێچایەوە. ئەگەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بوایە ئەوا تیورا زایەدەبوو. پاشان بیری کردەوە.

نەیدەتوانی لەناو ئەم چوارچێوە ترسناکەدا بوونێکی هەبێت. دوور، گەلێك دوور گوێی لە دەنگی ستێپە گاڵتەجاڕی و ماڵئاوایکەرەکەی سوێرین بوو. دەنگی ستێپەکە زیاتر و زیاتر نەدەما و دەگەیشتە توێی دەرەوەی بێدەنگی.

ڤێجا لەناکاو ژنەکە لە جێگەی خۆی ڕاپەڕی و لە چێشتخانەکەوە ڕایکرد بۆ ژوورەکە و پەلاماری سوێرینی دا.

–سوێرین! من لە ڕادەبەدەر دەترسم! هاواری کرد. پێویستە تۆ یارمەتیم بدەی!

ژنەکە خۆی نوساند بە سوێرینەوەو توند دەمی نا بەدەمیەوە.

زۆر سەختە دیاریکردنی ئەو پنتەی کە زیاتر دەبێتە چەق لەم ڕونکردنەوەدا. کلیلی وشە سایکۆلۆژیەکان ئەمانەن بێ ئومێدی، ئازار و ترس. بەڵام مەبەست چییە لە دەستپێکردن بۆ تێفکرین لە مێشکێك، مێشکی مرۆڤێك یاوەکو هی خوا، یاوەکو لەوانەیە مێشکی بوون بێت، کە تیورا وا هەست دەکات لە نێو ئەو توێکڵە پەتاتە ئاڵۆزکاوانەدا دەژی؟ پارچەکە وەك خۆئامادەکردنێك دێت بۆ بەشی داهاتوو کە دەرباری گەشەکردنی هەمان شێوەی گەردونییە: نائومێدبوونی خودی تیورا قوڵدەبێتەوە، لە هەمان کاتدا دەچێتە ناو "دەرەوەی کەسایەتی" تا دەگاتە ئەوەی کە "هەموو ڕاستییەکان" دەگرێتەوە. تیورا بە تەواوەتی گەیشتۆتە نزمترین ئاستی بێ ئومێدی: هەموو شتێ دەچێتە ژێر ڕکێفی نائومێدییەوە، تیورا هەست بە ژانێکی سڕکەر دەکات، هەستی بەوە دەکرد کە لەلایەن "تەمێکی ڕەش" دەپێچرێتەوە، هەست بەوە دەکات کە نزیك بووەتەوە لە فەنابوون. ئەوە لەو بارودۆخەدا، لەو نزمترین ئاستەدا، ڕچە شکاندنەکە لەلای تیوراوە ڕوودەدات: کاتێ کە تیورا لە حەژمەت و ترسدا هاوار دەکات و پەنا بۆ سوێرین دەبات بۆ یارمەتی، ئەوا تیورا بە یەکجارەکی دەستبەرداری ڕێکوپێکی و ئاکار بەرزی خۆی بووە و هەموو تاوانەکان دەخاتە ئەستۆی خۆی. بەبێ ئەوەی ئەمە بە ڕاستەوخۆی بوترێت، ئایە ژن و پیاوەکە مەرج و داخوازییان هەیە کە ژنەکە بەسەر سوێریندا بیسەپێنێ ئەمەش لە بەرامبەر ئەو ڕاستیەدا کە تیورا مێردەکەی خۆش دەوێ فەرامۆش دەکرێ:

ئای، چەندم خۆش دەوێیت، چەندێ مەزن خۆشم دەوێیت! ژنەکە بەبەر گۆنایدا دەیچرپاند. بمبەخشە. ئەمە هەڵەی منە. لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم پێبکە. بێ هاوتا تۆم خۆشدەوێت. من دەمەوێت بە تەواوەتی بەو جۆرەبم کە تۆ دەخوازیت.

لە هەمان کاتدا ملدان لەلای ژنەکەوە و هۆی گۆڕانکاریەکی خێرا لەلایەن سوێرینەوە: پیاوەکە لە نێو شەرمەزاری و ناشایستەیی خۆیدا دەژێت. پیاوەکە هەستی بەوە کرد کە دەبێت ئەوە "مەحاڵ و بێ لێبوردن بوو" بێت بە ڕاموسان و ماچ کردن

باربووی ئەو ووشە خۆشەویستییانەی ژنەکەی بداتەوە: "دەیتوانی لە پێناویدا بمرێت، دەنا هیچ شتێکی تر گوناهەکانی لەناو نەدەبرد". ئەو وشانەی پیاوەکە ئاراستەی ژنەکەی دەکات ئەوە دەگەیەنێ کە پیاوەکە نوچ دەهێنێ: "ئەو بەربادە لەپێکە، بەدەنگێکی گڕ سوێرین وتی. وازی لێبێنە با بۆگەن کات".

دوا ووشەی چیرۆکەکە سەرئەنجامێکی کورت بە دەستەوە دەدات کە چۆن بەربەستەکە شەقی برد و خۆشەویستی و هاوبەشی سەرکەوتن بەدەست دێنێ:

هەردووك ڕاکشان و چەندین سەعات بەبێدەنگی خۆیان بەیەکتریەوە دەگوشی. ئازاری ناودەرونی هەردووکیان ڕەوییەوە. سوێرین دەرکی بەوەدەکرد کە نەبۆتە کەسێکی جیا، ژنەکەشی بەهەمان شێوە. هەردووکیان دەیانزانی ئەوەی ئەمشەو ڕوویدا دووبارە دەبێتەوە، لەوانەیە شەممەی داهاتوو بێت، یاوەکو ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی تر. بەڵام ئەم دەرکپێکردنە نەبووە بەربەستێك لە نێوانیاندا. بەڵکو بە پێچەوانەوە بووە هۆی ئەوەی کە بە قوڵی و تەواوی چێژی یەکتری بکەن.

چیرۆکەکە بە شێوەیەکی نائاشکرا هەروەك پێناسەکردنی دیمەنێکی سادەی ژن و مێردایەتییەکی ئاسایی دەخاتە ڕوو. بەڵام ئالین دیمەنەکە بەکاردەهێنێ بۆئەوەی کە ئەوە نیشانبدات کە چی دەوری ئەوە دەبینێ لە هەموو هاوبەشی و بناغەکانی خۆشەویستیدا لەلای ئالین، گەشەی بە بیروبۆچوونی خۆی داوە لەم بابەتەدا لە چەندین پەیوەندی جیاوازدا، لەوانەیە ئەو بەرامبەرکێیەی لە پشتی چیرۆکەکەوەیە سادەترین ڕونکردنەوە بخاتە ڕوو. ئەگەر مرۆ سیتاتێك لە پەرەگرافێکی ساڵی 1949 بێنێتەوە، "لە شێوەی ساکارترینیان"، کە دووبارە چاپکراوەتەوە لە "باوەڕکردن و باوەڕنەکردن"دا (چاپکراوە لەلایەن ئا. فاگەشتریۆم "*A. Fagerstrom 1950*" ئالین بۆچونی خۆی لە ژێر کارتێکردنی ڕاڤەکەری مەسیحی ئەندەش نیوگرێن "*Anders Nygren*"ەوە فۆڕمی وەرگرتووە. بەڵام "لە شێوەی ساکارترینیان" بیروبۆچونەکانی خۆی پەیوەست دەکات بە چەقی بەرامبەرکێی لەلای کیرکیگارد "*Kierkegaard*":

سەختییەکان ئەمانەن: ئەوانەی کە جیاوازن لە یەکتری چۆن بتوانن بەبێ ئازار و سوکایەتی پێکردن یەکترییان خۆشبووێت، لە کاتێکدا کە چەقی خۆشەویستی لەیەکتری تێگەیشتنەکە بەبێ لەیەکچوون مەحاڵە مانایەکی ڕاستەقینەی هەبێت؟ – هەیبەتی سوکرات مانایەکی گەلێك زۆر گەورەی هەبووە بۆ کیرکیگارد، وە کیرکیگارد جار بە دوای جار دانی بە "حەکیمە بێئاوەزەکە"دا دەناو سەری نەوازشی بۆ دانەواندووە. /.../

باشە چەند کەس دەتوانێ پارە لەگەڵ سوکراتدا بگۆڕێتەوە؟ بۆ ئەوەی پەیوەندییەکە نەبێت بە سوکایەتی پێکردن، بۆ ئەوەی هەردوو لایەنەکە تووشی گەندەڵی نەبن، پێویستە سوکرات و قوتابیەکەی لەسەر هەمان پایەی چینایەتی ڕابوەستن. پێویستە لەیەکچونێك لە نێوانیاندا فەراهەمبێت. ئەگەر ئەمە نەکرێت. ئەگەر ئێستاکە مامۆستاکە و قوتابیەکە گەلێك جیاواز بن. ئەگەر قوتابیەکە ساکار بێت و مامۆستاکە زانا بێت، باشە ئەو کاتە مامۆستاکە چۆن هەڵس و کەوت بکات؟ ئایە مامۆستاکە قوتابیەکە بگەیەنێتە ئاستی "شکۆی خۆی"؟ لەوانەیە قوتابیەکە لە گەمژەیی

خۆی بەمە ڕازی ببێت، بەڵام مامۆستاکە مەحاڵە ڕازی بکرێت بەوە. لەبەرئەوەی مامۆستاکە شکۆی خۆی ناوێت، بەڵام هی قوتابیەکەی دەوێت. مامۆستاکەی نایەوێت وەك خێرخوازێك بوەستێت، لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی دروستکردنی دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات لە نێوانیاندا.

وە سەرەڕای ئەوەش ئا ئەمە ڕێگەی قوتار بوون نیە، وە ئا ئەمەیە تراژیدیا و تراژیدیاکەی سوکرات لە هاوبەشی مرۆڤایەتیماندا. دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات هاوبەشێتیمان لەسەرەوە و لە خوارەوە ژەهراوی دەکەن. "بۆیەکە هەرگیز باوەڕم بە سوکرات نەبووە، ئەمە هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووە"، کیرکیگارد نووسیویەتی. بۆ ئەوەی کە تراژیدیا لە جیهاندا خاشەبڕبکرێت داخوازی ئەوەمان لێدەکرێت بچینە ناو جیهانێکی نوێوە. ئەمەش بەبێ سوکایەتی کردن بە کەرامەتمان ناکرێت ڕووبدات جیا لە شێوەیەکی تر کە خوا دادەبەزێتە خوارەوە و خۆی دەگۆڕێت بەشێوەی ساکارترینیان.

وە ئەمەش شتێکی بێ وەڵامە لە خۆشەویستی خوادا. کە خوا خۆبەکەمزانین پوچەڵ دەکاتەوە، خوا دەیەوێت خۆی بچوێنێت بەوەی کە خۆشیدەوێت. "سەیرکە، ئەوەتا ئا لەوێدا وەستاوە — خوا" کیرکیگارد دەنوسێ. "لە کوێ؟ ئا لەوێ، چییە ناتوانی ببینی؟ ئەوە خوایە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خوا هیچ جێیەکی نییە کە بتوانی سەری تێدا بحەوێنێتەوە".

کەرەکتێری بیروبۆچوونی خۆشەویستی لای مەسیحییەت، بەو جۆرەی کە نیوگرێن و کیرکیگارد لێی تێگەیشتوون، ئەوەی کە خوا، شکۆدارترینە کە، "خۆی دەکا بە شێوەی ساکارترینیان". لەو سیتاتەی کە هێنراوەتەوە ئەم بیروبۆچونە چارەسەر دێنێتەکایەوە بۆ ئەو گرفتەی کە هەیە دەربارەی کە چۆن ئەوانەی جیاوازن لە یەکتری بەبێ ئازار و سوکایەتی کردن بتوانن یەکترییان خۆش بووێت. بەر لە هەموو شتێك لە چیرۆکەکەدا ڕووبەڕووی گۆڕانکاری حکمەی لاهوت دەبین لەسەر ئاستێکی مرۆڤایەتیدا: مەرجەکانی هاوبەشی لە نێوان دوو مرۆڤدا ئەوەیە کە ئەوەی کە "شکۆترە" لە پایەی خۆی دابەزێتە خوارەوە و واز لەوە بێنێ کە ئەوی تر بەرز بکاتەوە "بۆ ئاستی شکۆی خۆی". ئەمە شارەزاییەکی قوڵی سایکۆلۆژی مرۆڤایەتییە کە لە چیرۆکەکەدا شێوە وەردەگرێ — ئەوەش هیچ گۆڕانێك ناهێنێتە کایەوە چونکە لە سیستەمی لاهوتیشدا بوونی هەیە. وە لەوانەیە زیاتر نزیکبووبینەوە لە دەستهەڵگرتنی لە شیکردنەوەی چیرۆکەکە. سەرەڕای ئەوەش ئەوە ڕونە کە پێداچوونەوەکە لە "لە شێوەی ساکارترین" بە ڕوانگەی سایکۆلۆژی یەکە ڕازی نابێ بەڵکو بە ئاشکرا تێڕوانینی ئاینیشی تێدا بەکاردەهێنێ: تراژیدیاکە ئەوەیە کە هاوبەشی مرۆڤایەتی ئێمە ژەهراوی دەبێت لەلایەن دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتەوە بۆ ئەوەی ئەم تراژیدیایە لە جیهاندا خاشەبڕبکرێت داخوازی ئەوەمان لێدەکرێت "کە بچینە نێو جیهانێکی نوێوە"، ئەوەش تەنها بەشێوەیەك ڕوودەدات بەوەی کە خوا خۆی بکات بە "لە شێوەی ساکارترین". ئەم ڕوانگە ئاینییە لە چیرۆکەکەدا نادیارە، بەڵام مرۆ دەتوانێ پرسیار لە خۆی بکات دەربارەی ئەوەی کە ئایا لە ڕاستیدا ئەو شتە نەخراوەتە ڕوو لە چیرۆکەکەدا. قوڵترین بێئومێدییە لەلای کیرکیگارد ئەو خاڵەیە کە لەوانەیە

باوەڕی تێدا بێتە ڕوخاندن، وە لە کاتێکدا تیورا لە بێئومێدی خۆیەوە لەو باوەڕەدایە کە مێشکی خوا لە نێو توێکڵە پەتاتەکاندا دەبینێ لەوانەیە جۆرێکی نائاسایی بێت لە بینینی خوادا کە کیرکیگارد زۆر بە توندی پێی لەسەر دادەگرێ هەروەها ئالینیش لە دوا ووشەکانیدا "لە شێوەی ساکارترینیاندا": پێوەی دەبەستێ "سەیرکە، ئەوەتا ئا لەوێدا وەستاوە – خوا" – "لە کوێ؟ ئا لەوێ، چییە ناتوانی بیبینی؟" ئەو پەیوەندییە سەیرە لە توێکڵی پەتاتەوە بۆ خوا یاوەکوو لە مێشکی بوون لەوانەیە ڕونکرابێتنەوە بەرامبەر ئەو بیروبۆچونانەی کە وا ئالین لێرەدا گەشەی پێداوە.

## پەراوێز

1– سیتات: هێنانەوەی ووشە، ڕستە یا پەرەگراف لە بەرهەمێکدا.

## سەرچاوە

*Nils Sjostrand*

*Novelanalyser: vivi Edstrom & Per-Arne Henricson، Bockforlaget Prisma، P.116-124.*

# ڕێبەری گەل

**جان ئیشتاین بەك**

**لە ئینگلیزییەوە: حوسێن مەردانی**

لە ئێوارەیەکی شەممەدا "بیلی باك"ی گاوان وێنجەو گژوگیای ساڵی پاری کۆدەکردەوە و دەیخستنە سەریەك و بە شەنەیەکی بچووکی دانسقە کەمێکیشی دەخستە ئەودیو پەرژینەکە بەردەم گاڕانێك کە وازیان لێی بوو. ئەو هەورە بچووکانەی ناو ئاسمان دەتگووت چڕە دووکەڵن کە بای بەهاری (مانگی مارس) بەرەو ڕۆژهەڵات ڕایدەماڵین. دەنگی بایەکە لە بێشەڵانەکانی سەرەوەی تەپۆڵکەکە دەبیسترا کەچی لە لەوەڕگاکانی خوار تەپۆڵکەکە هیچ خەبەرێك لەبای نەبوو.

کوڕێژگەیەك بە ناوی "جودی" کە لە ماڵ دەهاتە دەر بابۆڵەیەکی سەربەکەرەی بە دەستەوەبوو و دەیخوارد. چاوی بە "بیلی" کەوت کە خەریکی کارکردن بوو لەسەر پاشماوەی وێنجەکە. جودی بە زەحمەت بە ڕێگەدا دەڕۆیشت و کەوشەکانی لە عەرزی دەخشاند، هەرچەن زۆری بیستبوو کە ئەم جۆرە ڕێگاو ڕۆیشتنە بۆ کەوشەکانی باش نییە و تەختی بنیان زوو لێوە دەبێت. کە جودی لە درەختێکی ڕەشی سەر و تێپەری پۆلێك کۆتری سپی لێ دەرپەڕین، بە دەوری درەختەکەدا سووڕان و ئینجا نیشتنەوە. بێچووە پشیلەیەك لە ڕەنگی قاوغی کیسەڵ لە سەرووی هەیوانی ئاغڵەکە خۆی هاویشتە خوارێ. خێرا ڕایکرد بۆ ئەولای ڕێگەکە، سووڕایەوە و هەمیسان گەڕایەوە. جودی بەردێکی دەستدایە کە کایەکە خۆشتر بێت، کەچی درەنگ ببوو و پشیلەکە بەرلەوەی کە جودی بەردی پێدادا، خۆی خزاندە ژێر هەیوانەکە. بە ناچار جودی بەردەکەی بە دارسەروەکەدا داو سەرلەنوێ کۆترەکان هەڵفڕینەوە.

کوڕێژگەکە کاتێ گەیشتە نزیك گژوگیایەکە پاڵی بە پەرژینەکە داو پرسی: "گوتت هەر ئەوەندەیە؟" جووتیاری بەساڵاچوو دەستی لە کارکردن هەڵگرت و شەنەکەی لە عەرزی ڕاکرد. کڵاوە ڕەشەکەی لەسەری لابرد و قژی ڕێك کرد.

گوتی: "نمی نەکێشاوە، شتێکی وای نەماوە تەواو بێت". لەسەر ڕاوە کڵاوەکەی لەسەری ناو دەستە پینە لێدراوەکانی لێکخشاند.

جودی گوتی: "دەبێ پڕ لە مشك و جرِوجانەوەر بێت".

بیلی گوتی: "لە دەس ئەم دەعبایانەوە زاڵە هاتووم".

–"باشە، بەشکەم بتوانم کاتێ کارەکەت تەواو بوو سەگەکانم بێنم تێیان بەردەم".

بیلی باك گوتی: "ئەرێ، دەتوانی" و ئەوسا شەنەیەکی پڕ کرد لە گژوگیای نم کێشاو و بەبای کرد.

سێ مشکی ڕەنگ خۆڵەمێشی لەبن گژوگیاکە دەرپەڕین و لە پاشان خێرا چوونەوە بۆ ژێر گژوگیاکە.

جودی لە خۆشیان ئاخێکی هەڵکێشا. ئەو مشکە قەڵەو و لەخۆباییانە دەبوایە بتۆپان. هەشت مانگی ڕەبەق لە ناو کۆگای گژوگیاو وێنجەدا ژیابوون و بێچوویان هەڵێنابوو و بەدوور لە زەڕی پشیلە، ژەهر و جودی بوون و ئەم شتەش قەڵەو و لووت بەرزی کردبوون. ئێستاکەش کاتی چارەڕەشی هاتبوو؛ و سبەی ڕۆژێیان نەدەیت.

بیلی ڕوانییە ژوور ئەو زوڕگانە کە لەوەڕگاکەیان داگرتبوو و گوتی "واباشترە پرسێك بە بابت بکەی".

–"ئەرێ، لە کوێیە؟ هەر ئەلحان لێی دەپرسم".

–"دوای خواردنی فراوێن (نانی نیوەڕۆ) بە ئەسپ چوو بۆ لەوەڕگا. ئەلحان دێتەوە".

جودی خۆی خستە سەر ئەستوندەکی دارینی پەرژینی (حەوشەکە) و گوتی: "نا، پێم وانێ شتێك بڵێن". بیلی لە کاتێکدا خەریکی کارکردن دەبۆوە بە نابەدڵی گوتی: "واباشترە لێی پرسی. بۆ خۆت دەزانی کە چۆنە".

جودی دەیزانی. باوکی، کارل تیفلین، سوور بوو لەسەرئەوەی کە لە هەر کارێکی پێوەندیدار بە مەرتەع و لەوەڕگا جا چ گرنگ بێت یان بێ بایەخ، دەبێ ئیزن لەو وەربگرن. جودی ئەوەندە پاڵی بە ئەستوندەکی دارینی پەرژینی حەوشەکە هێنا کە هێندەی نەمابوو بگاتە عەرزی. سەیری ئەو گەواڵە هەورانەی کرد کە با ڕایدەماڵین. "بیلی، دەیهەوێ بیبارێنێت؟"

–"لەوانەیە. بایەکە تەئسیری هەیە، بەڵام زۆر نییە."

–"باشە بەشکەم تاکوو ئەم مشکە لەحنەتییانەم نەکوشتووە نەبارێت." جودی لەسەرشانییەوە چاوێکی لە بیلی کرد تاوەکوو بزانێت لە لاتاوەکەی گەیشتووە یان نا. بیلی بێ قسەکردن سەرقاڵی ئیشی خۆی بوو.

جودی گەڕایەوە و ڕوانییە قەراغ تەپۆڵکەکە، ئەو شوێنەی کە جادەیەك لە جیهانی دەرەوە دەهاتە ژوور. تەپۆڵکەکە لە ژێر تیشکی بێتینی ڕەشەممە (مانگی دیسامبر)دا شۆردرابۆوە. دڕوەڵانی زێوین، باقلەی فەرەنگی شین و گڵووکی خونچە دەرکردووی خەشخاش لەناو دەوەنەکانی گوڵی مریەم دەهاتنە بەرچاو. جودی لە ناوەڕاستی جادەی تەپکەکەدا، "دەبلتری مت" سەگە ڕەشی دەدیت کە هێلانەی سمۆرەیەکی هەڵدەکەند. سەگەکە ماوەیەك هەوڵی دەدا، لە پاشان ئەو خۆڵەی کە هەڵیکەندبوو دەیخستنە ناو لاق و لەتەری، و بەجۆرێ ئەو زەوییەی هەڵدەکەند دەتگووت تاکو بە ئێستا هیچ سەگێك ئاوەها سمۆرەی ڕاونەکردووە.

جودی ئاگای لەو سەگە ڕەشە بوو، لەپڕ دیتی کە قیت و قۆز بۆوە، لەلان هاتەدەر و ڕامایە ژوور

تەپکەکە کە جادەکە لەوێوە تێپەڕدەبوو. "جودی"یش سەیری ئەوێی کرد. هەرئەوەندەی دیت کە کارل تیفلین بە سواری ئەسپ لە ژوور تەپکەکەوە دیارکەوت و بەرەو ماڵ تێهەڵبوو. شتێکی سپیی لە دەستیدا بوو.

کوڕیژگەکە لەسەرڕێ وەستا. هاواری کرد: "کاغەزێك لەدەستیدایە". بۆ لای ماڵ ڕای کرد، چونکو لەوانەبوو نامەکە بە دەنگی بەرز بخوێندرێتەوە و دەیهەویست کە لە کاتی خوێندنەوەیدا لەوێ بێت. بەر لە باوکی گەیشتەوە ماڵێ و خۆی دەژوورێ هاویشت. گوێی لە دەنگی دابەزینی کارل لەسەر زینی ئەسپەکە و ئەو زەبرەی کە لە قەپرغەی ئەسپەکەی دابوو تاکو بۆ تەویلەکەی بچێت، بوو. ئەسپەکە ڕۆیشت تاوەکو بیلی رووتی بکاتەوە و دەدەرێی بکات.

جودی غاری دایە ژووری چێشت لێنان. هاواری کرد: "کاغەزێکمان بۆ هاتووە!"

دایکی سەری لەسەر تاوەی فاسولیا هەڵگرت و گوتی: "بەکێیە؟"

ئەو کات کارل هاتە چێشتخانە و دایکی جودی پرسی: "کارل، کاغەزەکە ئی کێیە؟"

کارل دەسبەجێ دەموچاوی تێکناو گوتی: "چووزانی کاغەزمان هەیە؟"

ژنەکە سەری بۆ لای کوڕەکەی ڕاوەشاند: "ئەو هەتیوە دەم ڕووتە جودی پێی گوتم".

جودی حەبەسا بوو.

باوکی بە سووکایەتیی سەیری دەکرد. کارل گوتی: "دەم درێژی زۆر دەکات، کاری بە هەموو کەسە، جگە لە خۆی. جێگا نەماوە نەچێت".

دایکی تۆزێ خاو ببۆوە. "ئەمەش لەبەر بێ کارییە. کاغەزەکە ئی کێیە؟"

کارل هێشتا لەتەك جودی مۆن و گرژ بوو. "ئەگەر هەدا نەدات، کارێکی بۆ دەبینمەوە."

کاغەزێکی پێچراوی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: "پێموایە ئی باوکتە."

خاتوو تیفلین دەرزییەکی سەری لێوەکرد و نامەکەی پێ کردەوە. دەمی زۆر جوان وەکو خونچە لێهات. جودی ئاگای لە چاوی دایکی بوو کە بە کاتی خوێندنەوە پاش و پێشیان دەکرد.

دایکی گوتی: "دەڵێت، دەڵێت، شەممە دێت ماوەیەك لێرە بێت. چۆن شتی وا دەبێت، ئەمڕۆ شەممەیە. کاغەزەکە درەنگ هاتووە". سەیری ئادرێسی پۆستی کرد و گوتی:

"پێرێ پۆستیان کردووە، دەبوایە دوێنێ گەیشتبایە." جۆرێکی سەیر چاوی لە شوویەکەی کرد و لە پاشان سیمای گرژ بوو و گوتی: "ئێستا ئەوە بۆ دەم و چاوت ئاوا تێك ناوە؟ هەمیشە کە نایەت."

کارل ڕووی لە سیمای گرژی ژنەکەی وەرگەڕاند. هەموو کات توندی لە ژنەکەی دەگرت، بەڵام کاتێ ژنەکەی قەڵس دەبوو، نەی دەتوانی خۆی لەبەر ڕابگرێ.

ژنە هەمیسان لێی پرسی : "بۆچی ناڕەحەتی؟"

کارل بە وەستانێکەوە گوتی: "ئەو هەر قسان دەکات، هەر قسە." جۆری قسەکردنەکەی ئاوێتەی لێبوردنێك بوو کە شایانی جودی بوو.

-"باشە، دەی جا چێ؟ بۆ خۆشت هەر قسە دەکەی؟"

-"دروستە. بەڵام باوکت دایمە و سەعات هەر باس لە شتێك دەکات."

جودی بە هەست و هەژانەوە هەڵیدایە: "سوورپێستەکان! سوورپێستەکان و هاتن بە دەشتەکاندا."

کارل خێرا بۆی گەڕایەوە: "بڕۆ دەرێ دەم ڕووت! یاڵڵا وەدەرکەوە.

جودی بە سەرشۆڕی لە دەرگای پشتەوە چووە دەرو دەرگای تۆڕی بە هێواشی داخست. لە ژێر پەنجەرەی چێشتخانە چاوە شەرمن و نەوییەکانی بە بەردێکی لێك و لووس کەوت. بەردەکە وەها جوان بوو کە جودی داهاتەوە و هەڵیگرت و لە دەستیدا سووڕاندی.

دەنگەکان لە پەنجەرەی ئاوەڵای ماڵێ بە هاسانی دەبیستران. گوێی لە دەنگی باوکی بوو کە دەیگووت: "هەتیوە جودی راستی وت، هەر باسی سوورپێستەکان و تێپەرین لە دەشتەکان! هەزار جار زیاتر گوێم لە قەیاتی دزینی ئەسپەکان بووە. هەر دەیڕێسێ و دەیڕێسێ، قەتیش وشەیەکی لێ غەڵەت نابێ."

کاتێ دایکی جوابی دەداوە، دەنگی بە جۆرێ گۆڕابوو کە جودی لە دەرەوە وازی لە سەیرکردنی بەردەکە هێنا. دەنگی دایکی نەرم و نیان و لەسەرخۆ بوو و شتەکەی بۆ شی دەکردەوە. جودی دەیزانی کە دایکی چەند بە زەحمەتەوە ئاوا قسان دەکات. بە نەرمی دەیگوت: "چاولێکە کارل، ئەوە گەورەترین کار لە ژیانی باوکمدابوو. کاروانێکی لەناو دەشتەکان بۆ کەناری زەریا برد، کە ئەم کارە تەواو بوو، ژیانی ئەویش بەسەرهات. کارێکی مەزن بوو، بەڵام ئەوەندە کە دەبوایە نەیخایاند." ژنەکە درێژەی دا: "چاولێکە، دەتگووت بۆ ئەو کارەی سازکرابوو. کە کۆتایی هات هیچی بۆ نەمابۆوە؛ جگە لەمە کە هەر بیر لەم کارە بکاتەوە و هەمیشە باسی لێوە بکات. ئەگەر پێی کرابا لە ئاسۆ واوەتر چووبا، چوو بوو. بۆ خۆی پێی وتم. بەڵام ئۆقیانووس بوو. ئێستاش هەر لەو شوێنەی کە بەناچار ماوەتەوە، ژیان دەکات."

ژنەکە بەسەر شووەکەیدا زاڵ ببوو، بە زمانی نەرم و نیان لە داوی هاویشتبوو.

بە لەسەرەخۆیی قسەی ژنەکەی وەرگرت: "دیتوومە، دەڕواتە قەراخ ئۆقیانووس و لە ئاسۆ رادەمێنێ." ئینجا قسەکەی تۆزێ بە تەوسەوە درێژە داو گوتی: "دوایەش دەچێتە یانەی ناڵ کردنی ئەسپ لە پاسیفیك گرۆ[1] و لە بۆ خەڵکی باس دەکات کە سوورپێستەکان چلۆن ئەسپەکانیان رفاند."

ژنەکە هەمیسان گەرەکی بوو شووەکەی قانع بکات: "باشە، هەر ئەوەی بۆ ماوەتەوە. دەبێ تاقەتت هەبێ و وانیشان بدەی کە گوێت لەوییە."

کارل بەبێ وازی دوور بۆوە و بە توندی گوتی "باشە، ئەگەر زۆریش پێی نارەحەت بووم، دەتوانم بچمە ئاغلی بیلی و لەوێ بمێنمەوە."

چووە ماڵێ و درگای توند پێوەدا.

جودی سەرقاڵی کاری خۆی بوو. دانەوێڵەی بۆ جووجکەکان فرێدا بێئەوەی کە وەشوێنیان بکەوێت. هێلکەکانی لە هێلانەکان هێنادەر و کۆی کردنەوە. ئاوردووەکەی بەڕاکەڕاك بۆ ناوماڵ برد و بەجۆرێ لەناو سیپەیەکدا (جەعبە) هەڵیچنین کە سیپەکە بە دوو باوەش ئاوردوو پڕ دیاری دەکرد.

لەوکات، دایکی لووبیایەکەی سوور کردبۆوە و خەریك بوو و جاغەکەی دادەگیرساند. جودی بە پارێزەوە سەیری کرد تاوەکو بزانێت دایکی هێشتا بە دەستی تووڕەیە یان نا. ئەوسا لێی پرسی، "ئەوڕۆ دیت؟"

-"وای نووسیبوو."

-"پێت چۆنە بچمە پێشوازی لە جادە؟"

دایکی درگای وجاغی داخست و گوتی: "باشە، کاتێ بزانێ بەرەو پیری چوون، پێی خۆش دەبێت."

-"کەوایە هەر ئێستا دەچم."

جودی لە دەرەوەی ماڵێ، بە فیتوویەکی بەرز سەگەکانی بانگ کرد. ئەمری پێکردن:

" وەرن بۆ سەر تەپکەکە." هەرتك سەگەکە کلکیان ڕاوەشاند و غاریان دایە. لەناو جادەکەدا، گوڵە مریەم چرۆیان دەرکردبوو. جودی دووسێ دانەیانی هەڵکەند و ئەوەندە لە ناو دەستیدا ڕێکی گووشین تاوەکو بۆن و بەرامەیان هەوای داگرت. سەگەکان دەوریان هەڵگرت و لە جادەوە بازیاندایە ناو دەوەنەکان بۆ ئەوەی کە وەشوێن کەروێشکەکان بکەون. دوایین جاربوو کە جودی دەیدیت چونکو سەگەکان کەروێشکیان وەچنگ نەکەوتبوو، دەگەڕانەوە ماڵێ.

جودی بە سەختی لە هەورازی تەپکەکەوە سەردەکەوت. کاتێ گەیشتە ئەو دۆڵە باریکە کە جادەکە لێی تێدەپەڕی، بای دەمەو شەو قژی ئاڵۆز کرد و لۆچ و گنجی خستە سەر کراسەکەی. سەیری تەپك و زورگەکانی خوارەوەی کرد و لە پاشان چاوی بە گەلی مەزن و شیناوەردی سالیناس کەوت. لە دوورەوە، شاری سپیی سالیناسی دەدیت کە جامەکانی لەبەر تیشکی دەمەو ئێوارە دەدرەوشانەوە. ڕاست لە ژێر پێی، لەسەر دارە بەڕوویەك، قشقەڵەکان هەڵنیشتبوون. دارەکە لە ڕەنگی ڕەشی قاژووەکان ڕەش هەڵگەڕابوو و قشقەڵەکان بەیەکەوە دەیانقیراند. ئەو کات جودی سەیری ئەو جادەیەی کرد کە لەو تەپکەی لەسەری بوو دادەگەڕایە خوارێ، لە پاش تەپکەیەکی دی لەبەرچاو ون دەبوو و لەولاتر وەدیار دەکەوت. لە مەودایەکی دوور، چاوی بە داشقەو ئەسپێکی سوور کەوت کە بە ئارامی ڕای دەکێشا. داشقە و ئەسپەکە لە پاش زورگێك ون بوو. جودی لەسەر ئەرز دانیشت و زەینی ئەو شوێنەی دا کە هەمیسان دەبوایە داشقەکە لەوێ بە دیار کەوتبا. شنەی با لە ژوور تەپکەکان هاشەهاشی دەهات و هەورەکان خێرا بۆ لای ڕۆژهەڵات دەچوون.

ئەوسا داشقەکە وەدیار کەوت و وێستا. کابرایەکی جل ڕەشی لێدابەزی و چوو بۆلای سەری ئەسپەکە. هەرچەن مەوداکە زۆر دوور بوو، جودی تێگەیشت کە چونکو شوێنەکە لێژاییە کابراکە لغاوی ئەسپەکەی بە دەستەوە گرتووە. ئەسپەکە بەزەحمەت لە تەپکەکەوە سەردەکەوت و پیاوەکەش لەلای بوو. جودی لە خۆشیان زیقاندی و لە جادەکەدا بۆ لایان ڕایکرد. لە ئاخیری جادەکە، سمۆرەکان پێکەوە هەڵدەپرژان، کۆترە شینکەیەك کلکی ڕاوەشاند و بەرەو تەپکەکە چوو و بە وێنەی فڕۆکەیەکی بێ ماتۆر وەفڕین کەوت.

جودی گەرەکی بوو وەناو سێبەرەکەی خۆی کەوێت. لاقی لە بەردێکی هەڵەنگووت و کەوتە سەر ئەرزی. گەیشتە سەر قەدپاڵێکی بچووك، باوە گەورەو داشقەو ئەسپەکەی دیت کە لە بەرامبەریدا بوون. کوڕیژگەکە دەستی لە ڕاکردنە ناشیرینەکەی هەڵگرت و بە شەقاوی پتەو بۆ لای باوەگەورەی چوو.

ئەسپەکە بە خلیسکان و بەزەحمەت خۆی دەکێشایە سەر تەپکەکە و پیرە پیاویش لە پەنای ئەودا سەردەکەوت. لە پاش سەریان، سێبەری زلیان لەبەر گزنگی زەردەپەر دەلەرییەوە. باوەگەورە کراسێکی لە ماهووتی ڕەش لەبەرکردبوو و زەنگاڵێکی بوزووی لەپێدا بوو و بۆینباخێکی ڕەشی لە یەخەی کراسەکەی بەستبوو. کڵاوێکی چەماوەی ڕەشی بە دەستەوە بوو. ردینی چەرمووی پڕی کورت بوو و برژانگە سپییەکانی وەك سمێڵ، ژوور چاوی داگرتبوون. چاوە شینەکانی حاڵەتێکی

مۆنی شادیان هەبوو. ئەو سەنگینییەی لە سیما و جەستەیدا دیاری دەکرا ئەگەری هەر چەشنە جووڵەیەکی لێ بڕیبوو. بە کاتی پشوودان دەتگووت بەردێکە قەت نابزوێت. هەنگاوەکانی پتەو و هێواش بوون. کە ڕووی لەلایەك دەکرد، قەت ڕێگەکەی نەدەگۆڕی و لە خێراییەکەی کەم نەدەکردەوە.

کاتێ جودی لە قۆرتی تەپۆڵکەکە لایدا، باوە گەورەی بە هێواشی کڵاوەکەی بە نیشانەی بەخێرهاتن ڕاوەشاند و هاواری کرد: "جودی! بەرەو پیری من هاتووی؟"

جودی خۆی گەیاندێ و خۆی وەرسووڕاند و هەنگاوەکانی ڕێکی هەنگاوەکانی پیرەمێرد کرد و لە کاتێکدا خۆی قیت ڕاگرتبوو و کەمێك لاقی لە عەرزی دەخشاند گوتی: "بەڵێ نامەکەتان ئەمڕۆ بە دەستمان دەگەیشت."

پیرەمێرد گوتی: "دوێنێ دەبوایە گەیشتبایە، دوێنێ. دەی باشەماڵێ چۆنن؟"

-"هەموویان باشن." کەمێك وێستا و ئەو کات بەشەرمەوە پرسی: "پێتان خۆشە بەیانی بچین بۆ ڕاوەمشك؟"

پیرەمێرد پێکەنی: "جودی! ئەوە دەڵێی چی ڕاوە مشك؟" ئەو خەڵکە وایان لێهاتووە کە دەچن بۆ ڕاوەمشك؟ ڕاستە کە لاوانی ئەم سەردەمە هێز و بڕستی باشیان نییە کەچی لام وابوو کە ئەم گەنجانە ناتوانن مشك ڕاوبکەن."

-"نا، بابە، واش نییە. ئەمە هەر گەمەیە، کۆگای گژوگیای وشکی پارەکە تەواو بووە. گەرەکمە سەگەکان لەو مشکانە بەردەم. ئێوەش دەتوانن سەیری بکەن، یان ئەگەر پێتان خۆش بوو، کەمێکیش تفاقەکە[2] وەسەریەك نێن."

چاوە مۆنە شادەکان تێی ڕامان. "ئاوا، کە وایە نایانخۆن، هێشتا واو لێنەهاتووە کە بیانخۆن."

جودی بۆی باس کرد: "سەگەکان دەیانخۆن بابە. پێموایە زۆر لە ڕاوی سوورپێستەکان ناچێت."

"نا، زۆر نا، بەڵام کاتێ سەربازەکان سوورپێستەکان و مناڵەکانیان لە دار دەبەست و خێوەتەکانیان ئاور تێبەردان، زۆر لەگەڵ مشك کوژییەکەی ئێوە جیاوازی نەبوو."

کاتێ گەیشتنە دوندی تەپکەکە و لەوێڕا بەرەو مەرتەع و لەوەرگاکان تێهەڵبوون، ئیتر تیشکی هەتاو وێیان نەدەکەوت. باوەگەورە گوتی: "هەڵتداوە. ها، لەوانەیە نیوبست بالآت بەرزتر بووبێ."

جودی لە خۆی فشی و گوتی: "زیاتر، لە ڕۆژی جێژنی "سپاس" کە لە کن درگاکە ئەندازەیان گرتم زیاتر لە نیو بست هەڵمداوە."

پیرەمێرد بە دەنگی بۆر و بەرز گوتی: "حەتمەن کەش و هەوای ئێرەت پێ دەکەوێ کە ڕۆژ لە ڕۆژێ زیاتر کەڵەگەت و بەخۆوەتر دەبی. پێم بڵێ کە گەورەتر بووی دەبی بە چی. چ کەسایەتییەکت لێ دەردێ."

جودی خێرا سەیری سەروچاوی پیرەمێردی کرد تاوەکو بزانێت کە ناڕەحەت بووە یان نا، بەڵام لەو چاوە شینە مەندانەدا هیچ خەبەرێك لە بڵێسەی تووڕەیی نەبوو. جودی گوتی: "لەوانە بوو بەرازێك بکوژم."

-"ئاخ، نا! نەمدەهێشت. پلانت بۆ داناوە! دەزانی کە تەنیا پلان نییە."

-"بابە، ئەو بەرازە زلەت وەبیردێ کە ناوی ریلی[3] بوو؟"

-ئەرێ، چاك لە بیرمە."

-"ریلی، باقەیەك لە خوار گیشەی تفاقەکە هەڵخلیسکاو گیشەکەی بەسەریدا کەوت و تۆپاندی."

باوەگەورە گوتی: "بەرازەکان هەر کاتەی لە دەستیان بێت، لەو کارانە دەکەن."

"ریلی لەناو بەرازەکاندا، بەرازێکی باش بوو. جاری وایە کە سواری دەبووم، هیچ نەدەترسا."

درگایەك لە خانووەکەی خوار زورگ بە ڕمبەوە داخرا، چاویان بە خاتوو تیفلین کەوت کە لە هەیوان ڕاوەستاوە و بەرەڵبێنەکەی بۆ پێشوازی ڕادەتەکێنێ. ئەوان کارل تیفلینیشیان دیت کە لە تەویلەکە دەچێتەوە بۆماڵێ تاکوو بە کاتی هاتنیان لە ژووری بێت.

ئیتر هەتاو ئاوا ببوو. ئەو دووکەڵە شینەکە لە دووکەڵ کێشی خانووەکە دەهاتەدەر وەك گەواڵی گەورە لەسەر لەوەرگا سووڕەکە پیشی دەخوارد. هەورەکان بەدوور لەو بایەی کە دەهات، بە چەشنێکی ناڕێك لە ئاسماندا بڵاوببونەوە.

بیلی باك لە تەویلە هاتەدەر و قاپێکی پڕ لە کەفاوی بە عەرزیدا کرد. لەبەر باوەگەورە، ردێنی لە ناوەڕاستی هەفتەدا تاشیبوو. باوەگەورە دەیگوت: "بیلی یەکێ لەو پیاوە هەڵکەوتانەی ئەم ڕۆژگارەیە کە هیچ ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەهاتووە. هەرچەن بیلی بە تەمەن بوو، بەڵام باوە گەورە وەك مناڵی سەیر دەکرد. لەو کاتەدا بیلیش بە پەلە دەچووە بۆ ماڵێ.

کاتێ جودی و باوەگەورە گەیشتنەوە، هەرسێکیان لەبەردەم حەوشەکە چاوەڕێیان بوون.

کارل گوتی: "سڵاو، چاو لە ڕێتان بووین."

خاتوو تیفلین لاڕوومەتی باوکی ماچ کرد و هەروا کە ئارام وێستابوو، پیرەمێرد دەستی بە شان و پیلی دادەهێنا. بیلی بە پێکەنین و ماقووڵانە دەستی لەگەڵ لێداوە و گوتی: "ئەسپەکەتان دەبەستمەوە." لغاوی ئەسپەکەی گرت و بردی.

باوە گەورە سەیری ڕۆیشتنەکەی دەکرد. ئەوسا ڕووی لە جەماعەتەکە کرد، هەروەك چۆن زیاتر لەسەد جار گوتبووی، دووپاتی کردەوە: "کوڕێکی باشە. باوکیم دەناسی، "باکی کلك هێستری پیر" هێستروان بوو، بەڵام قەت لەوە نەگەیشتم کە بۆچی پێی دەڵێن "کلك هێستر."

خاتوو تیفلین ڕووی لە ماڵێ کرد و گشتیان بە شوێن ئەودا.

-"بابە، دەتانەوێ چەند ماوە لێرە بن؟ لە نامەکەتدا نەتنووسیبوو."

-"بەچاکی نازانم. دەڵێم لەوانەیە دوو حەوتوو بمێنمەوە. بەڵام قەت ئاوا زۆر لە هیچ شوێنێك نامێنمەوە."

کەمێك دواتر لە پشت مێزێك کە بە مشەمایەکی سپی داپۆشرا بوو، دانیشتبوون نانی شەویان دەخوارد. چرایەك بە ڕووپۆشی تەنەکە سەرووی مێزەکە بە میچ هەڵواسرابوو. لە دەرەوەی پەنجەرەکانی هۆدەکە، پەپوولەکان سەریان بە نەرمی دەکووتایە شووشەکان.

باوە گەورە گۆشتەکەی ورد دەکرد و بە کاوەخۆ خەریکی خواردن بوو. گوتی:

"برسیمە، ئەو ڕێگایە شەکەتی کردم و بەڕاستی ئیشتیاشمی کردەوە. وەکو ئەو کاتانە کە لە دەشتەکان هاتووچۆم دەکرد، شەوانە بە جۆرێ برسیم دەبوو کە ڕانەدەوەستام گۆشتەکە بگاتێ و بکووڵێت. هەموو شەوێك بە قەرا پێنج بۆند گۆشتی گامێشم دەخوارد."

بیلی گوتی: "وەکو ئێمە. باوکم هێستروانی دەوڵەت بوو. کاتێ مناڵ بووم کۆمەگم دەکرد. بە

هەردووكمان دەمانتوانی لاڕانێكی ئاسكێك بە تەواوی بخۆین."

باوە گەورە گوتی: "بیلی، باوكتم دەناسی. پیاوێكی باش بوو. پێیان دەوت "باكی كلك هێستر[4]"، نازانم بۆچی، جگە لەمە كە هێستروانی دەوڵەت بوو."

بیلی بۆی لەمل دا. "دروستە، هێستروانی دەوڵەت بوو."

باوە گەورە كێرد و چەنگاڵی لەسەر مێز داناو چاوێكی لە دەوروبەری كرد: "باش لەبیرمە سەردەمێك بوو كە گۆشت وەچنگ نەدەكەوت..." دەنگی حاڵەتێكی رێك و غەریبی بەخۆوە گرت و شێوەزاری بەسەرهات گێڕانەوەی پەیدا كرد و درێژەی پێدا: "نە گامێش بوو، نە بزنی كێوی، تەنانەت كەروێشكیش، راوچییەكان نەیاندەتوانی چەقەڵێك ڕاوبكەن. كاتی وەبوو كە ڕێبەر ئاگای لە خەڵك بێت. من ڕێبەر بووم و باش ئاگام لە خەڵك بوو. دەزانن بۆ؟ كە خەڵكی برسییان دەبێ دەست دەكەن بە كوشتنی گایەكان. باوەڕ دەكەن كە من بیستم تەنانەت هەندێ كەس چوارپێشیان خواردبوو؟ لە كلكەوە دەستیان پێكردبوو، لە ئاخیریدا، وەرگەڕابوونە سەر پێش ئاهەنگەكان و داشقەكێشەكانیش."

پەپوولەیەكی گەورە هاتە ناو ژوورەكە و بە دەوری چرا نەوتییە هەڵواسراوەكە خوولایەوە. بیلی هەستایە حەوا و هەویستی بەشێوەی چەپڵەلێدان بیگرێت. بەڵام كارل دەستی پێداكرد و پانی كردەوە. دوایە بە پەنجەرەدا فرێیدایە خوارێ.

باوەگەورە سەرلەنوێ قسەی كرد: "دەم گووت كە..."

بەڵام كارل هەڵیدایە ناو قسەكەی: "كەمێكی دیش گۆشت بخۆن ئێمە چاوەڕێی شیرنێكەمانین."

جودی هەستی بە قەڵس بوون و تووڕەیی كرد لە چاوەكانی دایكیدا. باوە گەورە كێرد و چەنگاڵی هەڵگرت و گوتی: "ئەرێ، زۆرم برسییە، دوایە بۆتان دەگێڕمەوە."

كە خواردنی نانی شەو (شێو) تەواو بوو، ئەندامانی بنەماڵە و بیلی باك لە ژوورەكەی دیكەدا، لە كن سۆبە (سۆپا) دانیشتن. جودی بە حەزەوە چاوی لە باوەگەورە بوو. سەیری نیشانە ناسیاوەكانی دەكرد. سەروچاوی ریشنی باوە گەورە بۆ پێشەوە شۆڕ بۆوە، حاڵەتی مۆنی لە چاوەكانی لاچوون و بە سەرسووڕمانەوە لە ئاگر ڕاما و بە قامكە كز و درێژەكانی پتەی لەسەر چۆكەكانی دەدا. دەستی بە قسەكردن كرد و گوتی: "نازانم، باشم لەبیرنێ، ئەرێ بۆتانم باس كرد كە ئەو پیووتە[5] دزانە سی و پێنج ئەسپی ئێمەیان دزی؟"

كارل پڕی دایە ناو قسەكەی: "پێموایە باستان كرد، لێرەدا نەبوون كە دەتانهەویست بچن بۆ گوندی تاهوو[6]؟"

باوە گەورە بە توندی ڕووی لە زاوایەكەی كرد و گوتی: "ڕاستە، دەبێ بۆتانم باس كردبێت."

كارل بە شێوەیەكی وەحشییانە گوتی: "ئەویش چەندین جار" و خۆی لە ڕوانینی چاوەكانی ژنەكەی دزییەوە. بەڵام دەیزانی كە چاوە تووڕەكانی ئەویان گرتۆتە ژێر چاوەدێری و درێژەی دا: "بەڵام حەز ئەكەم لەسەرڕاوە بیبیسم."

باوە گەورە سەیری ئاگری كرد و قامكەكەیان جووڵەیان لێ بڕاو هەمیسان پەنجەكانی خەریكی پتەلێدان لەسەر چۆكی بوو. جودی دەیزانی كە باوە

گەورەی چ هەستێکی هەیە و لە دەروونەوە چەندە ڕووخاو و داماوە. هەر چەن ئەو ڕۆژە بە جودیان وتبوو دەم ڕووت، بەڵام بەو حاڵەش ئازایەتی لە خۆی نیشاندا و مەتڵەبی نەبوو کە پێی بڵێن دەم ڕووت. لەسەرەخۆ گوتی: "باسی سوورپێستەکان بکەن."

چاوەکانی پیرە پیاو سەرلەنوێ حاڵەتی مۆنیان بەخۆوە گرت. گوتی: "کوڕەکان هەموویان حەزیان لە باس و خواسی سوورپێستەکانە. ئەوە دەبوایە پیاوەکان حەزیان لەم شتە بایە، بەڵام لەباتی کوڕەکان گەڕەکیانە بیبیسن. باشە، ڕاوەستە بزانم. ئەرێ بۆم باس کردن کە چلۆن دەمهەویست کە هەر داشقەیەك وەرەقەیەکی ئاسن لەگەڵ خۆی ببات؟"

گشتیان جگە لە جودی بێدەنگ مانەوە.

جودی گوتی: "نا، نەتانوتووە."

-"بەڵێ، کاتێ سوور پێستەکان پەلاماریان دەهێنا، ئێمە داشقەکانمان لە دوورەوە ڕادەگرت و لە نێوانیاندا شەڕمان دەکرد. بیرم کردەوە ئەگەر لە ناو هەرداشقەیەك وەرەقەیەکی گەورەی ئاسنی لێ بێت و جێگەی بۆ لوولەی (بۆری) چەك هەبێت، دەکرێ مەتاڵ و لەمپەرێکی باشی لێ دروست بکەی. ئەم کارە گیانی خەڵکی رزگار دەکرد و لەجیاتی یان هەڵگرتنی کێشی ئیزافی ئاسن بایەخی هەبوو.

-هەڵبەت کەسەکانی گروپ ئەم کارەیان نەدەکرد. هیچ گروپێك تاکوو ئێستا ئەم کارەی نەکردبوو و ئەوان نەیاندەزانی کە بۆچی دەبێ ئەم هەموو خەرجە زۆرەی بکەن. ئەوانەش کە زیندوو دەمانەوە داخی ئەوەیان دەخوارد کە بۆچی ئەم کارەیان کردووە."

جودی چاوی لە دایکی کرد و لە ناوچاوانی ڕا زانی کە هەر گوێ ناداتێ. کارل خۆی بە پینەو پەڕۆی قامکییەوە خەریك کردبوو و بیلی باك چاوی بەو جاڵجاڵۆکەیەوە بوو کە لە دیوار دەچووە سەر. دەنگی باوە گەورە لە سەرڕاوە چەشنی گێڕانەوەی بە خۆیەوە گرت. جودی بەرلەوەی کە باوە گەورە زار لێك بکاتەوە دەیزانی دەڵێت چی و هەموو شتەکانی لەبەر بوو. چەشنی گێڕانەوەی هەقایەتەکە یەك دەست بوو، بە کاتی هێرشەکان حاڵەتی گشتی (توند) بەخۆوە دەگرت، بە کاتی بریندار بوون خەماوی و کاتی گێڕانەوەی ڕێ و ڕەسمی ناشتن لە دەشتەکان، وەك سروودی ماتەم و تازیە دەچوو. جودی ئارام دانیشتبوو و چاوی بە باوە گەورەوە بوو کە دەتگووت چاوە شینە مۆنەکانی لە شوێنێکی دیکە دەفکرن. وا دیار بوو بۆ خۆشی زۆری حەز لەم چیرۆکە نییە.

کاتێك کە قسە و باسەکەی پیرەمێرد کۆتایی هات، و دووبارە بێدەنگی ژوورەکەی داگرت، بیلی باك هەستایە حەواو پانتۆڵەکەی ڕێك و پێك کرد و گوتی "من ئەوە دەڕۆم." لە پاشان رووی لە باوە گەورە کرد و گوتی: "من لە ئاغڵ جێگە باروتێکی کۆنە و دەمانچەیەك و کڵاوێکم هەیە. نازانم پێتانم نیشانداوە یان نا؟"

باوەگەورە هێواش سەری ڕاتەکاند و گوتی: "ئەرێ، پێم وایە پێت نیشان داوم بیلی. ئەو دەمانچەیە وەبیر ئەو کاتم دێنێتەوە کە ڕێبەری خەڵك بووم و دەمانچەیەکی ئاوەهام بوو." بیلی ماقووڵانە ڕاوەستابوو تاوەکوو قسەکەی تەواو بێت، پاشان گوتی شەوتان خۆش و ڕۆیشت.

کارل تیفلین دەیهەویست باسەکە بگۆڕێت. "ئەو گوندەی لەناو ئێرە و مۆنتریدایە وەزعی چۆنە؟ بیستم لە بێ ئاوییان قڕانیان تێکەوتووە."

باوە گەورە گوتی: "وەزعیان زۆر شڕە. لە "لاگۆناسیکا[7]" دڵۆپێک ئاو وەدەست ناکەوێ. بەڵام هەرچی بێت، لە ساڵی 1887 باشترە. ئەو ساڵە دێیەکە زۆر وشك و بێ ئاو بوو. ساڵی 1861 پێموایە تەواوەتی چەقەڵەکان لە بێ ئاوی تۆپین. بەڵام ئەمساڵ سی و هەشت سەنتی میتر باران باریوە."

"بەڵێ، بەڵام زوو باری. ئێمە ئێستا بارانمان دەویست."

کارل چاوی بە جودی کەوت و گوتی "وا باشتر نەبوو ئەلحان لەناو جێگا و بانەکەتدا بای؟"

جودی زۆر بە جوانی هەستاو گوتی: "بابە، دێڵن مشکەکانی ناو گیشەکەی گژوگیای پارەکە بکووژم؟"

-"مشکەکان؟ ئەرێ هەموویان بکوژە."

بیلی دەیگووت: "نەختێ وێنجەی ساغیان بۆمان نەهێشتۆتەوە."

جودی بە دزی و لە رووی ڕەزایەتەوە سەیرێکی باوە گەورەی کرد و بە متمانەوە گوتی: "سبەینێ هەموویان دەکووژم."

جودی لە جێ و بانەکەیدا ڕاکشاو بیری لە دونیای تاقەت فروکێن و سەختی سوورپێستەکان و بوفالۆکان (گامێشەکان) کردەوە، بیری لەو دنیایە کردەوە کە بەرەو فەوتان دەچوو. حەزی دەکرد خۆزگە لەو سەردەمە پڕ لە شانازی و قارەمانەتییەدا ژیابایە؛ هەرچەن دەیزانی کە لە جێدا بۆ قارەمان دروست نەکراوە. ئیتر جگە لە بیلی باك کەس شایانی ئەوە نەبوو کە ئەو شتەی کە پێشینیان کردوویانە لەسەرڕاوە بیکەنەوە. لەو سەردەمەدا تۆڕەمەیەك لە خەڵکانی بەهێز و نەترس و کۆڵنەدەر دەژیان کە ئەلحان هیچ شوێنەوارێکیان لێ بەجێ نەماوە. جودی لە فکری ئەو دەشتانەدا بوو کە ئارەبانەکان وەك هەزار پێ تێیدا دەسووڕانەوە. ئینجا بیری لە باوە گەورە کردەوە کە بەسواری ئەسپێکی سپی، خەڵکی ڕێنوێنی دەکرد، و لە خەیاڵیدا هێندێ تاپۆی گەورە بەلایدا تێپەڕین و لە زەوی دوورکەوتنەوە و لەناوچوون.

لە پاشان بۆ ساتێك بیری لە مەرتەع و لەوەڕگا کردەوە. گوێی لەو هەراوزەنایە بوو کە کەش و هەوا و بێدەنگی سازدەدا. بیستی کە سەگێك لە دەرەوەی ماڵێ، لە لانەکەیدا دەیهەوێ بە پەنجۆڵی کێچێك بگرێت و هەر جارەی لاقی وەعەرزی دەکەوێت و دەنگ دەداتەوە. ئەوسا هەمیسان لوورەی بای هات و درەختی سەروی ڕەش ناڵەی لێ بەرزبۆوە و جودی خەو بردییەوە.

نیوسەعات بەرلەوەی کە جەرەسی نانی بەیانی لێ بدەن، لەخەو هەستابوو. کاتێ چوو بۆ متبەق (ژووری چێشت لێنان). دایکی خەریکی داگیرساندنی ئاگری وەجاغەکەبوو. دایکی گوتی:

"زوو لە خەو هەستای، بۆ کوێ دەچی؟"

-"دەچم، گۆپاڵێکی باش وەدۆزم. گەرەکمانە ئەورۆ مشکەکان بکوژین."

-"لەگەڵ کێ؟"

-"من و باپیرم."

-"ئاخری ئەویشت تێوەردا. هەمیشە پێت خۆشە لەو کارانەی کە شەڕ هەڵایسێنە، کەسێکت لەگەڵدا بێ."

جودی گوتی: "زوو دەگەڕێمەوە، تەنیا دەمەوێ دوای خواردنی نانی بەیانی گۆپاڵێکی باشم وەدەست بکەوێت."

درگای سیمی پێوەدا و لەو بەیانییە فێنك و خۆشەدا چوو بۆ دەرێ. مەل و باڵندەکان جریوە

جریویــان بــوو و پشــیلەکانی دەشــت و مــەزرا، بەشــێوەی مــاری گــێڵ و گەمــژە، لــە زورگەکــە دادەکشانە خوار. ئەو پشیلانە لە ڕاوی جرجە مشك دەگەڕانەوە بەو بوومەڵێلە. هەرچەن زگیان تێر بوو، کەچــی هەمیســان لەبــەردەم دەرگــای پشــتەوەی خانووەکە بەشێوەی نیم بازنە هەڵتڕووشکابوون و بــۆ وەرگرتنــی شــیر دەیــان ناڵانــد. دەبلــتری مــت و ئیساشـە لـە پـاڵ پەرژینەکـە دەڕۆیشـتن. زۆر پـیس خـەریکی بـۆن پێـوەکردن بـوون، کـە جـودی فیتـەی کێشـا، سـەریان هـەڵبڕی و کلکیـان ڕاوەشـاند. بـە غـاردان خۆیـان گەیانـدێ و لـە تەنیشـتی خۆیـان لـە عـەرزی گەوزانـد و دەمیـان لێـك کـردەوە. جـودی دەستی بەسەریاندا هێناو لەگەڵ خۆی بۆ لای کەل و پەلی کۆنەی بردن. لەناو کەلوپەلەکان دارەگەسکێکی کۆنە و تەختەیەکی پانی هەڵبـژارد. قەیتانێکی لـە گیرفـانی هێنایــەدەر و وەکــوو ئــامێری گیشــەبڕ بەیەکەوەی گرێدان. ئەم چەکە نوێیەی لـە حـەوادا سـووڕاند و بـۆ تاقیکردنـەوە لـە عـەرزی کووتـا. سەگەکان خۆیـان دوور ڕاگرتبـوو و بـە پەشـۆکاوی نووزەیان دەهات.

جودی گەڕایەوە و لەلای ماڵێ تێپەڕی و چوو بۆ شــوێنی پێشــووی گیشــەی گژوگیاکــە تــاوەکوو سەیری کوشتارگە بکات، بەڵام بیلـی بـاك کـە، بێ خــەیاڵ لەســـەر پلیکانـــەکانی پشــت ماڵـــەوە دانیشـتبوو، قـاوی کـرد: "وا باشــە بگەڕێیــەوە. هێندەی نەماوە بۆ نانی بەیانی."

جـودی لـە ڕێگەکـەی لایـدا و بـۆ لای ماڵــێ گــەڕاوە. ئـامێری گیشــەبڕی بــە پلیکانەکانــەوە وەنـــا و گـــوتی: "ئـــەوە بـــۆ هێنانـــەدەری مشـــــکەکان لـــــە کونەکانیانـــــە. حەتمـــــەن هـــەموویان قەڵـــەون و هـــیچ کامیـــان نـــازانن ئەوڕۆ چ باسە."

بیلی بەشێوەی فەیلەسووفان گوتی: "نا، تۆش نازانی، منیش نازانم، کەس نازانێت."

جـودی دووشـك بـوو. تێگەیشـت کـە هـەق بـە بیلییـە. لـەپڕ بـیری کوشـتنی مشـکەکانی وەلانـا. پاشـان کـە دایکـی بـۆ هـەیوان هـات و جەرەسـی بەرکوتی[8] لێدا، گشت خەیاڵەکانی ئاڵۆزکان.

کاتێ لەسەر کورسی دانیشتن، هێشتا باپیری نـەهاتبوو. بیلـی بەلەقانـدنی سـەری ئامـاژەی بـەو کورسـییە بەتاڵـە کـرد و پرسـی "وەزعـی باشـە؟ نەخۆش نییە؟"

خاتوو تیفلین گوتی: "جل لەبەرکردنەکەی ماوە دەخایـەنێ. قـژی شـانە دەکـات، جلـەکانی مـاهووت لێدەدا، کەوشەکانی خاوێن دەکاتەوە."

کــارل، لــە کاتێکــدا شــەکری دەکــردە نــاو دانوولەکــەی، گــوتی: "کەســێك کــە چاوســاغی کاروانێك بووە لـە دەشـتایی، دەبـێ لـە جل پۆشـینا گورج و گۆڵ بێت."

خـاتوو تـیفلین لای لـێ کـردەوە و گـوتی: "کـارل وا مەکـــەداوات لێدەکـــەم وا مەکـــە!" لـــەحنی قسـەکردنەکەی زۆرتـر بـۆنی هەڕەشـەی لـێ دەهـات تاوەکو خوایشت و پارانەوە، ئەم هەڕەشەیەش کارلی والێکرد کە زوو هەڵبچێت.

–"ئەخـە چـەند هـەزار کـەڕەت دەبـێ گوێمـان لـە قەیاتی وەرەقـەی ئاسـن و سـی و پێنج دانـە ئەسـپ بێـت؟ ئـەو سـەردەمە بەسەرچـوو. بۆچـی لـە بـیری ناکات؟ کە قسەی دەکرد تووڕەتر دەبوو و دەنگی بـەرزتر دەبـۆوە. (مـەجبوور نییـە کـە لەسـەرڕاوە هەموومان بۆ وەگێڕێت؟ زۆر باشە ئەوە لە دەشت تێپـەڕیئـیتر تـەواو بـوو. ئـیتر کـەس نایـەوێ گـوێ بداتە ئەم شتانە).

درگای متبەق لەسەرەخۆ قەپات کراو ئەو چوار کەسـەی نـاو متبـەق واقیـان وڕمـا. کـارل تـیفلین

کەوچکی پڕ لە دانووڵەی لەسەر مێزەکە داناو بە قامکی خەریکی خوڕاندنی چەنەگەی بوو.

ئەوکات دەرگای ژووری چێشت لێنان کرایەوە و بـاوە گـەورە وەژوور کـەوت. بزەیـەك لەسـەر لێـوانی بـوو و لـە بنـەوە دەیڕوانـی. گـوتی: "بەیانیتان باش." دانیشت و سەیری دەورییەکەی کرد. کارل نەیتوانی وازی لـێ نەهێنێت: "گوێتان لێ بوو چم وت؟"

پیرەمێرد هێواش سەری ڕاوەشاند.

-"نـازانم چ بـووە، مەبەسـتم ئـەوە نـەبوو، شێت ببووم."

جودی لە بنەوە چاوی لە دایکی بڕیبوو. ئاگای لێبوو کە چاو لە کارل دەکات و دەتگووت هەناسە دەرنـادات. کـارل زۆر بـە زەحمەتـەوە ئـەو قسـانەی دەکـرد. لـە بـۆی سـەخت بـوو کـە قسـەکەی وەربگرێتـەوە، بـەڵام لـەوە سـەختتر ئـەوە بـوو کـە قسـەکەی بـە شـەرم و ئـابڕوو چوونەوە وەردەگرت.

باپیرە لە دەوروبەری ڕاماو لەسەرەخۆ گوتی: "هەمیشە هەوڵم دەدا کە ڕاست بم. شێت نەبووم لاشم گرینگ نییە کە ئێوە چ دەڵێن. بەڵام پێم خۆش بوو کە بەلامەوە گرینگ بایە "گاس" ئێوە ڕاست دەکەن من ئەو جۆرەم."

کارل گوتی: "نا ڕاست ناڵێم. ئەوڕۆ کۆك نیم. بمبورە کە ئەو قسانەم کرد."

-"نارەحـەت مەبـە کـارل پیرەمێردێکـی وەك مـن لـە زۆر شـت تێناگـات. ڕەنگـە تـۆ ڕاسـت بکـەی، ڕەت بـوون لـە پێدەشـتەکان دەورانـی بەسەرچـووە. "گـاس"م چـونکو تـەواوبووە دەبـێ لەبیر بکرێ."

کارل لە جێگەکەی هەستا. "تێر بووم. گەرەکمە بچمە سەرکار. بیلی خێراکە." وە دەسـبەجێ لە ژوورەکە وەدەرکەوت. بیلی نانەکەی خـوارد و بـە شوێنیدا چوو، بەڵام جودی نەیتوانی کورسییەکەی بەجێبێڵێت.

جودی پرسی: "ئیدی هەقایەت ناگێڕێوە؟"

-"بۆچی، دەگێڕمەوە، بەڵام وەختێك بزانم کە بەراستی خەڵك گوێم دەدەنێ."

-"من دەمەوێ گوێ بیس بم."

-"ئاخ، دەزانم، بەڵام تۆ تازە لاوی. ئەو قسانە بۆ گەورەکان باشن، کەچی هەر مناڵەکان دەیانەوێ گوێی لـێ ڕابگرن."

جودی لە کورسییەکەی هەستاو گوتی: "لە دەرێ چاوەڕێتانم. گۆپاڵێکی باشم لە بۆ مشکەکان دۆزیوەتەوە."

لەبـەردەرگا ڕاوەسـتا تـاکو پیرەمێـرد هـات. جودی هاواری کرد: "دەی وەرە ئێستا با بچین بۆ ڕاوە مشك."

-"جـودی دەڵـێم مـن لەبـەر تـاو دابنیشـم. تـۆ بچوو بیانکووژە."

"ئەگـەر پێتـان خۆشـە دەتـوانن دارەکـەی من ببەن."

-"نا من هەر لێرە دادەنیشم."

جودی بە پەشۆکاوی بەرەو کادێنی وشکەگیا و وێنجە چوو. دەیویست بە بیرکردنەوە لەو مشکە خەپەتۆڵانە بەر بە ئاڵۆزکاوی خۆی بگرێـت. بە ئـامێری گیشـەبڕ لـە زەوی دەدا. سـەگەکان لـە تەنیشتی کلکە سووتەیان دەکرد و دەیان ناڵاند، بەڵام ئەو نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێت. گەڕاوە، دیتی کە باپیرە خۆی گرمۆڵە کردووە و لە هەیوان دانیشـتووە. وازی لـە ڕاوەمشـك هێنـاو هاتـە لای باپیرە دانیشێت.

"ئاوا زوو هاتییەوە؟ مشکەکانت کوشت؟"

-"نا، ڕۆژێکی دیکە دەیانکوژم."

مێش و مەگەزی لای بەیانی وزەوزیان دەهات و لەبەردەم پلیکانەکان، مێروولەکان دەجوولانەوە. بۆنێکی تیژ لەلای تەپکەکە دەهات. تەختە دارەکانی بەر هەیوان وردە وردە لە ژێر تیشکی هەتاو گەرم دادەهاتن.

جودی نەیدەزانی کە باپیرەکەی وەدەنگ دێت. بەڵام باپیرە وەدەنگ هات: "بەو حاڵەی من هەم، ئیتر نابێ لێرە بمێنمەوە." دەستی پتەو و گنجاوی تاقی دەکردەوە و درێژەی دا: "پێم وایە تێپەڕبوون لە دەشتەکان بایەخی ئەم هەموو چەرمەسەرییەی نەبوو." چاوەکانی بڕییە ژوور زورگەکە و ماتی ئەو هەڵۆیە بوو کە لە لقەدارێك هەڵنیشتبوو. "من ئەو قەیاتە کۆنانە دەڵێم. بەڵام مەبەستم هەر گێڕانەوە نییە. دەمەوێ خەڵکی لێی تێبگەن. سوور پێستەکان گرینگ نەبوون، ڕووداوەکانیش لە جێدا بایەخیان نییە. گرینگ ئەو کۆمەڵە خەڵکە بوون کە وەکو دەعبایەکی خزۆکیان لێهاتبوو و منیش سەری ئەو دەعبایە بووم کە هەر بۆ ڕۆژئاوا دەچوو. هەرکەسەی شتێکی بۆ خۆی دەوێت، بەڵام ئەم دەعبا زەبەلاحە تەنیا گەرەکی بوو بچێ بۆ ڕۆژئاوا. منیش ڕێبەر و چاو ساغی ئەو خەڵکە بووم، بەڵام منیش نەبوایەم کەسێکی دیکە ئەم کارەی دەکرد. دەعباکە پێویستی بەسەر هەبوو.

لە ژێر ئەو دەوەنە بچووکانەو لەسەر ئەو زەوییەی کە لەبەرگەرمای نیوەڕۆ سپیی هەڵگەڕابوو، سێبەرەکان وەك ڕەشایی دەهاتنە بەرچاو. ئاخرییەکەی، کە گەیشتینە چیاکان، گشتمان بەیەکەوە گریاین، بەڵام گەیشتن بۆ وێ گرینگ نەبوو، گرینگ ڕۆیشتنەکە بوو، ڕۆیشتن بەرەو ڕۆژئاوا.

-"ئێمە هاتین تۆوی ژیانمان لێرە چاند، ئەو جۆرەی کە مێروولەکان هێلکەکان لەگەڵ خۆیان ڕادەکێشن من ڕێبەریان بووم. چوون بۆ ڕۆژئاوا کارێکی مەزن بوو و ئەو هەنگاوە بچووکانەی کە ئێمە هەڵمان دێناوە ئەوەندە لەسەریەك زۆر بوو هەتاوەکو تەواوەتی و شکارۆیەکەمان (قارە) بڕی. ئینجا گەیشتینە زەریا و ئیدی تەواو بوو.

پیرەمێرد بێدەنگ بوو و ئەوەندە چاوی سڕی تاکو سووڕهەڵگەڕان. ئەوسا گوتی: "ئەوە ئەو شتانە بوون کە لەباتی ئەو بەسەرهات و قەیاتانە دەبوایە بمگوتبان."

جودی گوتی: "بەشکەم منیش ڕۆژێك بتوانم ببم بە ڕێبەری خەڵك."

پیرەمێرد پێکەنی و گوتی: " ئیدی هیچ شوێنێك نەماوە کە بچن. ئۆقیانووس پێش ئێوەی گرتووە. لەکن لێوار هەندێ پیرەمێرد هەن کە ڕقیان لە ئۆقیانووس دەبێتەوە چونکو پێشی گرتوون."

-"دەتوانم بە بەلەم بچم."

-"جودی، هیچ جێگایەك نەماوە کە بچی، هەموو جێگەیەکیان گرتووە. بەڵام ئەوە خراپترین شت نییە. خراپترین شت ئەوەیە کە ئیدی چوون بۆ ڕۆژئاوا لە مێشکی کەس دانێ. ئیتر خەڵك وازیان لێی نییە. هەموو تەواو بووە. باوکت ڕاست دەکات. ئیدی تەواو بووە." چنگی لە ئەژنۆی گرت و چاوی لە پەنجەکانی کرد.

جودی زۆر نارەحەت و بەپەرۆش بوو. گوتی: "ئەگەر پێتان خۆشە پەرداخێك شەربەتی ئاو لیمۆتان بۆ ساز دەکەم."

پیرەمێرد دەیویست بڵێ نا، کە چاوی بە قەڵافەتی جیدی جودی کەوت گوتی: "باشە، خواردنەوەی پەرداخێك شەربەتی ئاو لیمۆ زۆر خۆشە."

جودی ڕایکردە ژووری چێشت لێنان. دایکی سەرقاڵی وشك کردنەوەی دەفر و ئامانی بەیانی

بـوو. جـودی گـوتی: "ئـەرێ دەتـوانم پـەرداخێك شەربەتی لیمۆ بۆ باپیرە ساز بکەم؟"

دایکـــی دەمەلاســـکەی کـــرد و گـــوتی: "پەرداخێکیش بۆ خۆت؟"

-"نا دایە، پەرداخێك بەسە."

"جـودی ئـەتۆ ناسـازی! لـە پـڕ قسـەکەی بڕی و بە نەرم و نیانی گوتی: "لیمۆیەك لە یەخچاڵ هـەڵگرە، منـیش دەزگـای ئـاو لیمـۆگرتن دێنمە خوارێ."

## پەراوێزەکان

*1-pacific Grove*

2-تفاق: گژو گیا و وێنجەی وشك كە دەبەر ماڵاتی دەکەن. وەرگێڕ.

*3-Riley*

*4-old muletail Buck*

*5-piute*

*6-tahoo*

*7-laguna seca*

8-بەرکوتە: نانی بەیانی.

## سەرچاوە

کۆمەڵە چیرۆکێکی ئینگلیزی

***Publication Argousy***

***Golden Short Story***

## خۆشەویستی پاکیزە
## لە ئەفلاتونەوە بۆ لاکان

لە عەرەبییەوە: ئاوات ئەحمەد



**ناوی نوسەر: جاك لۆبران**
**بڵاوكەرەوە: سۆیل** – 2002
**ژمارەی لاپەڕە:** 436 **لاپەڕە.**

جاك لۆبرانی نوسەری ئەم كتێبە بەڕێوەبەری لێكۆڵینەوەیە لە دەزگای باڵای لێكۆڵینەوە پراكتیكییەكان لە پاریس، ئەندامیشە لە قوتابخانەی دەرونشیكاریی (سیگمۆند فرۆید)دا. پێشتر چەند كتێبێكی بڵاوكردۆتەوە، هەروەها سەرپەرشتی كۆكردنەوەی نوسینەكانی نوسەری فەرەنسی "فرانسوا فینیلۆن 1675–1715"ی كردووە كە ڕەخنەگران بەو مامۆستایە لە قەڵەمی دەدەن كە دواتر جان جاك ڕۆسۆ شوێن پێی هەڵگرتۆتەوە. كتێبێكیشی دەربارەی "جاك بۆسۆی 1627–1704" نوسیوە.

كتێبی خۆشەویستی پاكیزە لە ئەفلاتونەوە بۆ لاكان لە كرۆكی "پەیوەندییە سۆزدارییە پاكیزەكان" دەكۆڵێتەوە، كە كرۆكی ناكۆكیی نێوان هەردوو نوسەر فینیلۆن و بۆسۆی بووە، دەربارەی سروشتی ئەو تەرزە خۆشەویستییە، لۆبرانیش بەشێوەیەكی سەرەكی لە كتێبەكەیدا بایەخی بەوان داوە. لێكۆڵینەوەكەی لۆبران لەو ژوانەوە دەستپێدەكات كە لە مانگی ئۆكتۆبەری ساڵی 1688دا، فینیلۆن و خاتوو گۆیۆنی پێكەوە كۆكردۆتەوە، ئەو خاتوونە لە ساڵی 1676ەوە بێوەژن بووە. ئیتر لەو پایزەوە، پەیوەندییەكی ڕۆحییانەی قووڵ لە نێوانی فینیلۆن و خاتوو گۆیۆندا سەریهەڵداوە، پەیوەندی نێوانی هەردوو دڵەكە و هەردوو ئەقڵەكە، بێ ئەوەی جەستە هیچ دەستێوەردانێكی هەبێت. چەندان نامەی پڕ لە سۆز و خۆشەویستییان ئاڵوگۆڕ كردووە. خاتوو گۆیۆن فینیلۆنی وەكو ئەو جگەرگۆشە ڕۆحییەی خۆی لەقەڵەمداوە كە خودا پێی بەخشیوە.

گرنگترین خەسڵەتی ئەو خۆشەویستییە ئەوەیە كە خۆشەویستییەكی پاكیزە بووە، هیچ مەرجێكی تێدا نەبووە، لەسەر بناغەی پێوەرێكی گرنگیش دامەزرابوو، خۆ بە دوور گرتن، بگرە ڕەتكردنەوەی هەموو بەرامبەرێك، چونكە چێژی ڕاستەقینە بریتیە لە ڕەتكردنەوەی هەموو چێژێكی سەرپێی و تێپەڕ. نوسەری ئەم كتێبە نمونەكانی خۆی دەربارەی ئەم جۆرە خۆشەویستییە پاكیزەیە لە خەرمانێك نمونەوە وەردەگرێت كە ماوەی بیست و پێنج سەدە بە خۆیەوە بینیویەتی، هەر لە ئەفلاتونەوە تا دەگاتە جاك لاكانی زانای نێوداری سایكۆلۆجیای فەرەنسی و یەكێك لە میراتگرە بنەڕەتییەكانی بیری سیگمۆند فرۆید. ئەو گفتوگۆیانەی نوسەر دەربارەی خۆشەویستی پاكیزە پێشكەشیان دەكات، لەسەر پێشینەی ڕۆشنبیریی خۆراوایی دامەزراوە، بەتایبەتی لەسەر بناغەی ڕەهەندە مەسیحییەكەی. جاك لۆبرانیش خۆی بە پلەی یەكەم مێژوونووسی مەسیحییەتە.

نوسەر ئەم پرسیارە بەرز دەكاتەوە: خۆشەویستی مانای

چیە؟ ئایا خۆشویستنی خودە یان خۆشویستنی ئەویتر؟ پاشان پرسیارێكی تریش دەكات: ئایا خۆشەویستی مانای وەرگرتن دەگەیەنێت یان بەخشین؟ لە میانەی هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە یۆنانییە دێرینەكان، كە لەوێدا خۆشەویستی لە هەمان كاتدا، مانای ئیرادەی ژیان و ئارەزووی مردنیشی دەگەیاند. واتە خۆشەویستی شتێكە و پێچەوانەكەشێتی. ئەفلاتون بە شان و باڵی پاڵەوانێتی لە خۆشەویستی و ئامادەیی خۆشەویست بۆ قوربانیدان بە خۆی لە پێناوی خۆشەویستەكەیدا، هەڵداوەو شكۆداری كردووە. لای ئەو خۆشەویستی نكوڵیكردنە لە خود.

لە بەرامبەریشدا، نوسەرانی وەك رۆشفۆكۆ جەخت دەكەن كە خودی خۆشەویستی بوونی نییە، ئەوەتا دەڵێت: خۆشەویستی وەكو تارمایی وەهایە، هەمووان باسی دەكەن، بەڵام هەرگیز كەس رێكەوتی نەكردووە. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە كە مشتومڕ بگرە ئەو كێشەیەی لە كۆتایی سەدەی حەڤدەیەمدا، لە نێوانی فینیلۆن و بۆسۆیدا هەبوو، دەربارەی چەمكی خۆشەویستی پاكیزە، بووە هۆی ئەوەی پاپای ڤاتیكان بیرۆكەی "خۆبەدوورگرتنی رەها" لە خۆشەویستیدا ببێژرێنێت.. فینیلۆن و بۆسۆیش پیاوی كەنیسە بوون. نوسەر سڵ لەوە ناكاتەوە كە بڵێت ناتەبایی ئەو دوانە دەربارەی چەمكی خۆشەویستی یەكێك بوو لە گرنگترین قەیرانە هزرییەكانی رۆشنبیریی مەسیحی خۆراوایی، دواتر ئەو قەیرانە لە فەلسەفەشدا دەنگی دایەوە, بە تایبەتی لای كانت و شۆپینهاوەر، هەروەها لە كرۆكی بایەخدانەكانی سیمبولەكانی دەرونشیكاریشدا بووە، بەتایبەتی فرۆید و لاكان.

نوسینەكانی فینیلۆن و بۆسۆی و مەدام گۆیۆن — بە تایبەتی نوسینەكانی فینیلۆن — ئەو مادە سەرەكییەیان پێكهێناوە كە نوسەر پشتی پێبەستووە لە گفتوگۆكردنیدا لەسەر چەمكی خۆشەویستی پاكیزە. جەخت دەكات كە ئەو كتێبە رۆحانییە لە نوسینەكانی "چوارلاوەكە"دا دەنگی داوەتەوە كە بە "سۆزێكی هەژاو" و "پوخت" و دوور لە هەموو ئارەزوویەكی جەستەیی، بەرەو رووی چوون و چەشنە ئەزمونێكی سۆفییانەی دروستكردووە، ئەزمونی "خۆشەویستی پاكیزەی پوخت و راستەوخۆ". فینیلۆن بەهۆی نوسینەكانی خاتوو گۆیۆنەوە چۆتە ناو جیهانی رۆحانییانەی خۆشەویستی پاكیزەوە.

نوسەر دەقەكانی فینیلۆن بە چەشنە هەوڵێك دادەنێت بۆ داڕشتنی تیۆرییەكی تایبەت بە خۆشەویستی پاكیزە، كە لەوێدا ئەو بیرانە دەنگدانەوەی زۆریان هەبووە، لەسەر ئاستەكانی ئەدەب و دەرونشیكاریی بەشێوەیەكی تایبەتی. یەكێك لە گرنگترین ئەو خەسڵەتانەی لە خۆشەویستیدا جەختی لەسەركراوە، بریتیە لە نەشیانی ئاشتكردنەوەی لەگەڵ "حەزی موڵكایەتیكردندا".. وا رۆیشتووە كە بە خۆشەویستی پاكیزە بوترێت خۆشەویستی ئەفلاتون، كە تێیدا حەزلێكەر دەیەوێت لە زۆرترین بڕی شیاو لە بیرۆكەی ئیدیاڵی خۆشەویستی نزیك ببێتەوە.

## سەرچاوە

البیان ژمارە 251ی 24ی شوباتی 2003.

# گوتار و توندوتیژی سەرنجێك لە فەلسەفەی لیوتار

مەسعود راحل
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی



شانۆی فەلسەفی فەڕەنسی لە سێ دەیەی دواییدا، شایەتی رووداوی فەلسەفی گەورە بووە کە قووڵایی و پانتاییەکەی تا ئەمڕۆش بە دروستی نەدۆزراوەتەوە.

رووداوەکانی بونیادگەری، پاش بونیادگەری و پۆستمۆدێرن، بە وتەی یەکێك لە گەورەترین نەیارەکانی ئەم رووداوانە (یۆرگن هابرماس) داهێنەرترین رووداوی بیرکردنەوەی هاوچەرخ بوون و هەن.

ئەم دیدانە نەك تەنها لە پانتایی فەلسەفەدا، بەڵکو کاریگەرییەکی قووڵی لە پانتای هونەرە وێنەییەکان، ئەدەبیات و ئەندازیاریشدا کردووە.

دیدی پۆستمۆدێرن، نزیکییەکی رەخنەگرانەی لەگەڵ فەلسەفەی دوایی ئەڵمانیادا هەیە، واتە فەلسەفەی نیچە، هایدگەر و ئەدرنۆ(1).

فەلسەفەی ئەڵمانیا بەپێچەوانەی ئەو هەوڵەیە بۆ تێپەڕین لەم ئاستی نمونەی فەلسەفیە.

فەلسەفەی ئەڵمان پاش ئەزموونەکانی جەنگی جیهانی دوهەم، بەدوای گەڕان بۆ دۆزینەوەی دوبارەی دیاردەکانی رۆشنگەری، مۆدێرنە و پەیوەندی سەرلەنوێی بە بنەماکانی نمونەیی دیاردەی دیموکراسیەوە.

دەکرێ یۆرگن هابرماس بە فەیلەسوفی رۆحی تازەی ئەڵمانیای پاش جەنگی جیهانی دوهەم بزانرێ. وەك چۆن هاینریش بیل ئەم دەورەی لەبواری ئەدەبیاتدا دەبینی.

لەم بوارەدا هانز بلمنبرگ لایەنگری رەوایەتی رۆشنگەریە و یۆرگن هابرماسیش دەستدەکات بە درێژەدانی "پرۆژەی ناتەواوی" مۆدێرنە.

هابرماس پۆستمۆدێرن بە دیدی فەلسەفی "عیرفانی نوێ" دادەنێ(2).

دیدی پۆستمۆدێرن نەك لەرووی خاڵی دەرچوونەوە جیاوازە، بەڵکو جیاوازی و "ئەویدیبوون" گرنگترین بابەتەکانی ئەم دیدگایەن(3).

بابەتی سەرەکی ئەم نوسینە هێنانە ئارای مەسەلەی توندوتیژیە لە ئاستی جیاکەرەوەی نێوان گونجاندن و نەگونجاندا.

دیدی پۆستمۆدێرن رێکخستنێکی تازە بۆ جێنشینی رێکخستنی کۆن پێشنیار ناکات، بەڵکو خودی دیاردەی رێکخستن دەخاتە ژێر پرسیارەوە و ئەو دیاردانە دەهێنێتە ئاراوە کە لە چوارچێوەی سیستەمی دەربڕین و گوتاردا، ناتوانرێت پێشکەش کرێن.

مێژووی فەلسەفە و مێژووی هونەر لەسەدەی بیستدا، بەگشتی مێژووی قەیرانی دڵنیایی و رەوایەتی مۆدێرنە بووە. دیدی پۆستمۆدێرن ئەوەی کە لە مۆدێرنەدا بە بەڵگەنەویست دادەنرێ.. واتە سەرجەمیگەری ئەم دیدە.. دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

پۆستمۆدێرنە رەخنەیەکە لە تاك دیدی، تاك بینی و سەرجەمیگەری مۆدێرنە.

ئەم دیدە رەخنەیەکە لە گوتارە هاوتا و چونیەك و یەکپارچە و سەرجەمگەرەکان. بۆ نمونە رەخنەی لیوتار لەسەر هابرماس ئەوەیە کە ئەو لەدیدی کۆدەنگیەوە (اجماع) قسەدەکات و نەگونجانی گوتاریی لەبەرچاو ناگرێت. دیدی لیوتار دیدی نەبوونی کۆدەنگیە *Dissense* واتە لە روانگەی لیوتارەوە لە پەیوەندیدا بە دوو گوتاری جیاوازەوە، پێوەرێکی بەرزتر *Metaregell* بوونی نیە کە کۆدەنگیەکی گوتاری دروستبکات.

دیدی لیوتار بەرەو ناهاوتا و ناچونیەك و نەگونجاوە[4].

لەم رەخنانەی پۆستمۆدێرندا لە سەرجەمگەری، رەخنە لە سەرجەمگەری فەلسەفەی هیگڵ، دەورێکی گەورەی هەیە.

فەلسەفەی هیگڵ بەگشتی فەلسەفەیەکی سەرجەمگەرە کە رووی لە رەهایە. ئەم فەلسەفەیە بە روکەش پشتی بە نمونەی "ئاشتکردنەوەی دژایەتیەکان" بەستووە. بەڵام ئەم ئاشتکردنەوەیە –وەك ئادرنۆش دەیگووت– ئاشتیەکی سەپێنراوە.

خاڵی دەرچوونی فەلسەفەی هیگڵ، لەراستیدا خاڵی دەرچوونی چونیەکیە *Identitat*.

هیگڵ سەرەتا جیاوازی و ناچونیەکیەکان وەك دژایەتی دادەنێت و پاشان چارەسەری دەکات. هێنانە ئارای رەوایەتی ئەم جیاوازیانە لە پانتایی فەلسەفەی هیگڵدا، بابەتی کتێبی بەناوبانگی "جیاوازی و دوبارەبونەوە"ی جیل دۆلۆزە.

لەناو پانتای کلتوری مرۆڤایەتیدا، جیاوازیگەلێك هەن کە لەخود و بۆخۆیان هەن و لەگەڵ جیاوازیەکانی دیدا، دژایەتیان نیە.

لە دیدی دۆلۆزدا هیگڵ هەموو جۆرە جیاوازیەك بەدژایەتی دەزانێت و ئەم جیاوازیە بەدژایەتی دانراو، چارەسەر دەکات.

دیدی فەلسەفیانەی هیگڵ لە "ئەویدیبوون" نزیکدەبێتەوە، بەڵام لەم ئەویدیبوونە، ئەویدبوون دەستێنێت. هیگڵ هەمیشە دژایەتیەکانمان بەروودا دەدات، بەڵام میخانکیتی سەرەکی سیستەمە فەلسەفیەکەی، نمونەی چارەسەر و هەڵگرتنە*Aufhebung* . واتە ئەم میخانکیتەی کە تەوەرەی سەرەکی فەلسەفەی هیگڵە، بەرلەوەی کە لەسەر تێکەڵکردن، ئاشتکردنەوە و یەکێتی داژایەتیەکان راوەستابێت، لەسەر دژایەتی دامالین دامەزراوە.

کاترین مالابۆ لە وتارێکدا بەناوی "چ کەسێك لە گورگە هیگڵیەکانی دەترسێ"دا دەنوسێ: "بازنەی هیگڵی گەڕانەوەیەکی نەمرانە نیە، بەڵکو تەنها سوڕانەوەی چونیەکیە لەرێگەی نەفیکردنەوە" ئەم هەڵسەنگاندنە لەڕاستیدا دوبارەکردنەوەی هەڵسەنگاندنەکەی جیل دۆلۆزە لە کتێبی "جیاوازی و دوبارەبونەوە"دا. دیارە لێرەدا وشەی چونیەکی وەرگێڕانی وشەی *Identitat*ە کە هەندێکجار بە هاوتایی وەرگێڕاوە. دیدی پۆستمۆدێرن، دیدی دژایەتیەکان و جیاوازیە چارەسەر هەڵنەگرەکانە.

ئەم دیدە دژایەتیەکان بەهێز دەکات و سەرقاڵی جیاوازیە گوتاریەکان دەبێت، بێ ئەوەی هەوڵ بۆ دروستکردنی کۆدەنگیەك لەبارەی جیاوازیە گوتاریەکانەوە، بدات.

نوسینەکەی لیوتار لەژێر ناونیشانی "وەڵام بۆ پرسیاری پۆستمۆدێرنە چیە"دا، نوسینی سەرەکی لیوتارە لەسەر دیاردەی پۆستمۆدێرن.

لەم نوسینەدا لیوتار جەخت لەسەر نمونەی بنەڕەتی ستاتیکای کانت دەکات، واتە "شتی باڵا" یان "*Das Erhabene*" کە لە ئینگلیزیدا بە "*The sublime*" وەرگێڕاوە.

لێرەدا دەبێ سەرنج لە هەندێك لە پەرەگرافەکانی تێکستە سەرەکیەکەی لیوتار بدەین. لیوتار دەنوسێ "من بەتایبەتی بڕوامولیە لەناو ستاتیکای شتی باڵادایە کە دەبێت ئەنگێزەی هونەر و ئەدەبیاتی مۆدێرن و یاسا سەرەکیەکانی لۆژیکی ئاڤانگارد "طلیعییت" بدۆزینەوە".

ئامانجی سەرەکی هونەر لە دیدی لیوتارەوە، جوانی و لەزەت وەرگرتن لەجوانی نیە، بەڵکو نزیکبونەوەی دەربڕین و پیشاندانەوەی شتی باڵایە" ئەو ئەم شتە باڵایە بە قابیلی پێشکەشکردن نازانێت و بڕوای وایە پیشاندانەوەیەکی *representation* شتی باڵا، بێ هودەیی پیشاندانەوە، دەردەبڕێ. سەرنج لە پەرەگرافێکی درێژی نوسینەکەی لیوتار بدەین: "بەپێچەوانەی لەزەتەوە، شتی باڵا کاتێك فۆرمەلە دەبێت کە خەیاڵکردنەوە، ڕەنگە لەرووی ڕەسەنایەتیەوە، توانای پێشکەشکردنی شتی کە لەگەڵ چەمکێکدا گونجاوەی، نەبێت. ئیمە وێنەیەك لە جیهانمان "کۆی ئەو شتانەی کە بونیان هەیە" هەیە، بەڵام توانای پیشاندانی نمونەیەکیمان نیە. ئێمە وێنایەکی شتی سادە (شتێك کە ناتوانین بەش بەشیبکەین و دابەشیبکەین)مان هەیە. بەڵام ناتوانین وەك شتێکی هەستپێکراو وەك نمونەیەکی ئەو شتە وێنەبکەین. (دەتوانین) مەزنێتی بێ کۆتایی یان دەسەڵاتی بێ کۆتایی وێنابکەین، بەڵام هەموو شێوەکانی پێشکەشکردنی شتگەلێك کە هەوڵدەدەن ئەم مەزنی یان دەسەڵاتە، بەبڕوای ئێمە بێهودەن..ئەمانە کۆمەڵێ وێنای زیهنین کە هیچ جۆرە "پێشکەشکردنێکیان مومکین" نیە.

لە پەرگرافی دواییدا لیوتار دەڵێت: "من ناوی مۆدێرن لەو هونەرە دەنێم کە "پیشەسازییە کورتەکەی" بە وتەی دیدرۆ خۆی تەرخان بکات بۆ ئەو راستیەی کە ئەوەی پێشکەش ناکرێت، بوونی هەیە. مەسەلەی وێنەکێشانی مۆدێرن ئاشکراکردنی ئەو خاڵەیە کەشتێکی قابیلی وێناکردن هەیە کە نە دەکرێ ببینرێ و نە دەکرێ دەربخرێ".

لە دیدی لیوتاردا ئاراستە بۆ ناهاوتا یان ئەوەی لیوتار بە "پێشکەش ناکرێت"ی دادەنێت، لە بواری هونەری مۆدێرندا، هەمیشە بوونی هەبووە. پۆستمۆدێرنەش بەشێوەیەك سێبەری ناهاوتای مۆدێرنە بووە. بە وتەی ئیهاب حەسەن دەکرێ گۆڕانی هەمیشەیی مۆدێرنە بە پۆستمۆدێرنە دابنێین.

بەرهەمێکی هونەری لەبەردەم هەرجۆرە پیشاندانەوەیەکی چەمکیدا، بەرگری دەکات. لەم تێپەڕینە لە بواری چەمك، چەمك لەناو ناچێت، بەڵکو دەبێتە هاوتای قابیلی چەمك نەکردنەکان.

جەختی لیوتار لەم نوسینەدا لەسەر نەگونجانی دیاردەیەکی هونەرییە، لە چوارچێوەی گونجاندنە گوتاریەکاندا. لەم نوسینەدا لیوتار لەسەر وێنەکێشانی مۆدێرن یان وێنەکێشانی تەجریدی، جەختدەکات. وێنەکێشانی

مۆدێرن گواستنەوەی شتە دەرەکیەکان بۆ سەر کاغەزی سپی و رەنگکردنی ئەم شتانە نیە.

وێنەکێشانی مۆدێرن، دیدێکە بۆ جیهان لە دیدی گومان، دڵەڕاوکێ و بێ بڕواییەوە، واتە دیدێکی نەفیکەرانەیە.

وێنەکێشانی مۆدێرن دیدی ئێمە لە سنورێکی بینیندا، واتە دیدی رۆژانە، ئازاد دەکات و رایدەکێشێ بۆ بواری چەمکنەکردنەکان. بۆ نمونە گۆرنیکای بیکاسۆ، دیدێکە بۆ روداوی گۆرنیکا لە دیدێکی بێ باوەڕیەوە. ئەم تابلۆیە، دەرکەوتنی ناهاوتاییەکانە. لەم تابلۆیەدا هیچ شتێك بەو شێوەیە نیە کە دەبێت ببێت. ئەم تابلۆیە کۆکردنەوەی تێکشکانەکانە. دیدی وێنەکێش لەم تابلۆیەدا، دیدێکی حەپەساوە و ئەم حاڵەتی حەپەسانە لە سەرتاسەری تابلۆکەدا بڵاوبۆتەوە.

سارتەر سەردەمێك نوسیبووی گەر ئێمە 1000لاپەڕە لەسەر ئەم تابلۆیە بنوسین، ناتوانین چۆنێتی ئەم تابلۆیە دەربڕین.

لەبەرهەمێکی هونەریدا، ئاڵۆزی چرکەیەکی نەناسراوی و ناهاوتاییە.

ئادرنۆ بە ئاماژەکردن بۆ نیچە، لەکتێبی "ئەخلاقی بچوکدا" دەنوسێ: بینینی لێکچوون لەهەموو جێگایەکدا، بینینی هەموو شتێك هاوتای یەك، ئاماژەیەکی لاوازی بینینینە". ئەم دەربڕینەی لیوتاریش کە "وێنەکێشانی مەزن... تەنها بە نەبینینکردن، دەتوانێ توانای بینینمان بداتێ"، دەکرێ وتنەوەی قسەکەی ئادرنۆ بێت: واتە دەکرێت بگوترێت دیاردەیەکی هونەری لە پەیوەندیدا بە دیدێك و چەمکێکی دیارەوە، نەناسراو و ناهاوتایە.

لێرەدا چەمکی "پێشکەشنەکردن" ی لیوتار لەگەڵ چەمکی "ناهاوتا"ی ئادرنۆدا، پەیوەندیەکی قوڵی هەیە کە دەبێ بهێنرێتە پێشێ.

ئادرنۆ یەکێك لە باوکە مەعنەویەکانی پۆستمۆدێرنە.

لەم نوسینەدا لیوتار رەخنە لە چەمکی کۆدەنگی گوتارە جیاواز و نەگونجاوەکان دەگرێت.. واتە رەخنە لە دیدی هابرماس دەگرێت.

لە پەرەگرافی کۆتایی ئەم نوسینەدا، لیوتار بێ ئەوەی ناوی هیگڵ بەرێت رەخنە لەچەمکی ئاشتی و چەمکی هەمەکیگەری دەگرێت، چونکە "ئاشتی چەمك لەگەڵ شتی هەستپێکراودا" بناغەی فەلسەفەی هیگڵە: "ئێمە لەپێناو دڵتەنگیماندا بۆ هەمەکی و یەکتای بۆ ئاشتکردنەوەی چەمك لەگەڵ شتی هەستپێکراودا و ئاشتکردنەوەی ئەزمونی ئاشکرا و ئەزموونی پەیوەندی، بەئەندازەی پێویست بەهایەکی گرانمان داوە".

وتاری "وەڵامی پرسیاری پۆستمۆدێرن چیە" ی لیوتار بە رستەیەکی دروشم ئاسا کۆتایی پێدێت: "وەرن دژی هەمەکی بجەنگین. وەرن شایەتی شتی پێشکەشنەکراو بین..وەرن جیاوازیەکان بەهێز بکەین و ئابروی ناو بپارێزین".. ئەم رستەیەش لەراستیدا راگەیاندنی فەلسەفەی پۆستمۆدێرنە.

## پەراوێزەکان

1-وشەی پۆستمۆدێرن لە سەرەتای پەنجاکاندا لە ئەنجامی وتوێژ لەبارەی دیاردەی ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبیدا، بڵاوبۆوە.

نوسینەکەی ئیرفینگ هۆ لەژێر ناونیشانی "کۆمەڵگای مێگەلی و چیرۆکی پۆستمۆدێرن" کە لە ساڵی 1959دا لە گۆڤاری "پارتیزان رۆیو"دا بڵاوبۆوە، دەورێکی گرنگی لە بەنمونەکردنی ئەم وشەیەدا هەبوو. لەم ساڵانەدا نوسینەکانی هانری لیوین و ئیهاب حەسەن، دەورێکی گرنگیان لە بڵاوبونەوەی ئەم وشەیەدا هەبوو.

ئەم وشەیە لە ساڵی 1958دا لەپەیوەندیدا بە دیدێکی تازە لە ئەندازیاریدا، سودی لێوەرگیرا.

لەبواری کۆمەڵناسیدا، چەمکی پۆستمۆدێرن یەکەمجار لەلایەن "ئەمیتا ئیتزۆنی"وە کە دامەزرێنەری قوتابخانەی کۆمینیتاریزمە، سودی لێوەرگیرا.

نوسینە بەناوبانگەکەی لیوتار بەناوی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن: وتارێك لەبارەی زانستەوە" وشەکەی لەبواری فەلسەفەدا بڵاوکردەوە، بەڵام مێژووی ئەم چەمکە زۆر کۆنترە.

یەکەمجار ئەم وشەیە لە ساڵی 1870دا لە وتاری "چاپمن"دا، لەپەیوەندیدا بە رەخنە لە ئیمپرسیۆنیزمی فەرەنسیدا، سودی لێوەرگیرا.

جاری دوهەم ئەم وشەیە لە ساڵی 1917دا لە نوسینی "رۆدۆلف پانویتز"دا لەژێر ناونیشانی "قەیرانی کلتوری ئەوروپیدا" سودی لێوەرگیرا.

رۆدۆلف پانوڵتز لەلایەنگرانی نیتچە بوو. ئەوەی ئەو لەبارەی مرۆڤی پۆستمۆدێرنەوە دەیگوت، لە مەزنە پیاوی نیتچە دەچوو.

رەنگە زەردەشتی نیتچە، یەکەم بەرجەستەبوونی وێنای مرۆڤی پۆستمۆدێرن بێت.

ئەمڕۆ هایدگەر، ئادرنۆ، فینگشتاین وەك باوکانی مەعنەوی پۆستمۆدێرن ناودەبرێن.

بێگومان لیوتار مەیلی بەلای نمونەی بونیادی فەلسەفەی ئادرنۆدا واتە چەمکی *Das Nichtidentische* کە بەئینگلیزی بە *The Nonidentical* وەرگێراوە، و چەمکی "گەمە جیاوازەکانی زمان"ی فینگشتایندا هەیە.. رەنگە فەلسەفەی لیوتار لە کۆی خۆیدا لە کۆکردنەوەی ئەم دوو نمونەیە، دروستبوبێت.

(تەماشای نوسینەکانی *Wolfagng Welsh*لەبارەی پۆستمۆدێرنەوە بکە)

2-یۆرگن هابرماس، لە کتێبی "وتوێژی فەلسەفی مۆدێرنە" دەقە ئەڵمانیەکە. ئەم کتێبە تەفسیری روبەروبونەوە دیاردەی مۆدێرنە و پۆستمۆدێرنەیە و لەم کتێبەدا تەفسیری بۆ فەلسەفەکانی جۆرج بتی، میشل فۆکۆ و ژاك دێریدا، پێشکەشکراوە.

3-بابەتی "ئەویدیبوون" و جیاوازی گوتارەکان، بابەتی سەرەکی کتێبێکی لیوتارە کە دەبێ لە وتوێژی دوایدا باسبکرێت. تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە:

*Jean_Francois Lyotard Der widerstreit_Wilhhelm Finlc Verlag, 1987.*

4-تەماشای نوسینەکەی لیوتار بکە: "پۆستمۆدێرن. وتارێك لەبارەی زانینەوەت: کامران ساسانی.

## سەرچاوە

اسمایی، شمارە ششم سال 1381 ص47

# خوێندنەوەی کتێب

## فەلسەفەی سیاسی – پێشەکییەکی مێژوویی

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

**نوسینی: میکائیل. ج . هوایت**
**ژمارەی لاپەڕە: 265 لاپەڕە.**

دانەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "میکائیل. ج. هوایت"ە کە

مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی ویلایەتی ئەریزۆنا لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بۆ ماوەی سیی ساڵ یاخود زیاتر وانەی فەلسەفەی وتوەتەوە و چوار کتێب و زیاتر لە پەنجا وتاری بڵاوکردۆتەوە، ڕاوێژکاری جیهانییە لە فەلسەفەی سیاسی و مەنتیقدا.

دانەر لەم کتێبەدا مێژوی فەلسەفەی سیاسی لە سەردەمی یۆنانەوە تاکو ئەمڕۆ دەخاتەبەرچاو، کتێبەکە لە نۆ بەش و پێشەکیەك و کۆتاییەك پێکهاتووە.. بێگومان دانەر لەسەر سەرەتای فەلسەفەی سیاسی لای گەورە فەیلەسوفانی یۆنان بۆ نمونە "ئەفلاتون" و "ئەرستۆ" ڕادەوەستێت، لە واقیعدا ئەو دوانە فەلسەفەی سیاسیان دامەزراند، یەکەمیان کتێبە بەناوبانگەکەی (کۆماری) نوسیی و تێیدا تیۆریای خۆی سەبارەت بە سیاسەت و هونەری حوکمڕانی کردن و ئەو کۆمەڵگایەی کە فەیلەسوفان دەیبەن بەڕێوە..هتد خستوەتەڕو، بەڵام قوتابیەکەی "ئەرستۆ" وەك هونەرێکی نایاب کە لە بەرزترین شێوازدابێت باس لە سیاسەت دەکات و کۆمەڵێ تیۆریای لە زانستی سیاسەتدا بۆ بەجێهێشتوین کە تاکو ئێستا لە هەموو زانکۆکانی جیهاندا دەخوێندرێت،وەك چۆن تیۆریای سەبارەت بە میتافیزیکا و زانستی مەنتیق و شیعر بۆ جێهێشتوین.




دواتر دانەر دەگوازێتەوە بۆ قۆناغی مەسیحیەت کە سەدەکانی ناوەڕاستی گرتۆتەوە و دوای سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانی دێت، ئالێرەدا دین و سیاسەت یاخود کڵێسا و دەوڵەت دەست دەخەنە کاروباری یەکترەوە، ئەم دەستتێوەردانەش تاکو سەرەتای سەدەکانی مۆدێرنە بەردەوام دەبێت و ئیدی لاهوتی سیاسی مەسیحی بەدرێژایی هەزار ساڵ باڵادەست دەبێت.

پاش ئەو قۆناغە فەلسەفەی ڕۆشنگەری و مۆدێرنە دێت و وردە وردە پیاوانی ئاینی و سیاسەت لێکدی جیادەکاتەوە، لێرەدا دانەر لای "هۆبز" و "جۆن لۆك" لە سەدەی حەڤدەهەمدا ڕادەوەستێ، ئاشکراشە ئەو دوانە تازەگەرییان هێنایە ناو سیاسەتەوە کە دوای خۆیان بە سەدەیەك یاخود دوو هاتەدی.

هۆبز فەیلەسوفێکی ئینگلیزی بوو، ساڵی 1588 لەدایك بووە و تاکو ساڵی 1679 ژیاوە، واتە 91 ساڵی بەسەر بردووە! ئەم تەمەن درێژییە کە ئەوکات خەڵکی لەسەری ڕانەهاتبوون هەلی ئەوەی بۆ هۆبز ڕەخساند زانست و ئەزمونە جۆراو جۆرەکانی سەردەمەکەی خۆی وەربگرێ، هۆبز لە سەردەمێکدا ژیا پڕبوو لە پەشێوی ئاینی و سیاسی، بێگومان هەموو ئەوانەش ڕەنگدانەوەیان هەبووە لەسەر تیۆریا فەلسەفییەکەی.

هۆبز لەو بڕوایەدابوو مرۆڤ گورگێکە بۆ مرۆڤی برای، لێرەوە گەر پادشایەك نەبێت حوکمی گەل بکات و دەسەڵات و هەیبەتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ، ئەوا خەڵك دەبنە دێو و درنج و یەکتر دەخۆن، هەربۆیە هۆبز هیچ وەهمێکی لەسەر ئادەمیزاد نەبووە، لەبەر ئەم هۆیەش بوو لە

داواکەرانی دەوڵەتێکی بەهێز بوو کە یاسا بەسەر هەمواندا دەسەپێنێ و لێناگەڕێ بەهێز بێهێز بخوات.

بەڵام "جۆن لۆک"ی فەیلەسوف (1632-1704)هاوسەردەمی هۆبز بوو گەرچی بەتەمەن لەو بچوکتر بوو، لۆک فەیلەسوف و سیاسەتمەدارێکی ئینگلیزی بوو، بەمانای ئەوەی ئەو تەنها بەوەوە نەوەستا تیۆریزەی فیکری بۆ سیاسەت بکات، بەڵکو پراکتیکی سیاسەتیشی دەکرد، لە گرنگترین کتێبەکانی:

نامەیەك لەسەر لێکبوردن 1689، نامەیەك لەسەر هونەری حوکمکردن 1689، بیروڕا لەسەر زانستی پەروەردە 1693، مەسیحیەتی عەقڵانی 1695..هتد.

جۆن لۆك بە عەقڵانییەتەکەی و بە بلیمەتیەکەی کاریگەری لەسەر فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری جێهێشت، ئەوانەی لەسەدەی هەژدەدا سەریانهەڵدا بە تایبەتی ڤۆڵتێر، جۆن لۆك باوەڕی بە یاسای سروشتی هەبوو، واتە عەقڵانی، لەو بڕوایەشدا بوو هەر ئەوە دەتوانێ بەشێوەیەکی ئاسایی حوکمی ئادەمیزاد بکات.

لۆك دەیوت قەشەکانی مەسیحی نوێنەری خودا نین لەسەر زەوی و هەقی ئەوەشیان نییە بە بیانوی ئەوەی ئەوان پیاوانی ئاینین خەڵك بچەوسێننەوە، خوای گەورە و میهرەبان هەموو خەڵکی بەشێوەیەکی یەکسان دروستکردووە، کەس لەوی دیکە باشتر نییە تەنها بەبڕی ئەو چاکەیە نەبێت کە بۆ خۆی و بۆ هەموو کۆمەڵگا جێبەجێی دەکات، هێرشی دەکردە سەر توندڕەو و دەمارگیرەکانی نێو کڵێسای مەسیحی و بانگەشەی ئاشتبونەوەی لە نێوان ئاین و عەقڵدا دەکرد.

لە واقیعدا لۆك دامەزرێنەری فەلسەفەی لیبرالییەتە لە مێژوی ڕۆژئاوادا، دەیوت ئەوە یاسای سروشتە مافی خەڵك لە ژیان و، لە ئازادی و، لە موڵکییەتی تایبەتی دەپارێزێ، یاسای سروشت داوا لە خەڵك دەکات پابەندی بەڵێنەکانیان بن و چەندیش لە توانایاندا هەیە بۆ زامنکردنی ئاسایشی ئەوانی دیکە جێبەجێی بکەن، لێرەوە یاسای سروشتی سزای هەر کەسێ دەدا گەر دەستدرێژی کردە سەر کەسێکی دیکە و پاداشتی هەر کەسێکیش دەکات گەر کارێکی چاکەی بۆ خەڵك ئەنجامدا.

لێرەوە هەر دەوڵەتێ یاسای سروشتی جێبەجێ بکات دەوڵەتێکی دیموکراتی بەرپرسیارە، بەڵام ئەو دەوڵەتەی ئەو یاسایە جێبەجێ نەکات ئەوا دەوڵەتێکی ستەمگەر و ناڕەوایە، چونکە لە دەرەوەی یاسا یاخود بێ یاسا دەچێت بەڕێوە، لەبەر ئەم هۆیەیە لۆك لای هەندێ کەس بە تیۆرستی پێشوەختی دیموکراسی و جیاکەرەوەی نێوان دەسەڵاتەکان و حوکمی یاسا دادەنرێ، بەڵام هیچ کام لەو بابەتانە بەشێوەیەکی ڕون و ئاشکرا و تێروتەسەل لە نوسینە سیاسیەکانیدا بەدیناکرێ، بەڵکو تەنها تۆوەکەی دەبینرێ و تەنها دوای مردنیشی ئەو تۆیانە دەکرێنەوە، بەڵام شتی بنچینەیی کە لۆك جەختی لەسەر دەکرد بریتی بوو لە حوکمی یاسا و پێویستی پابەندبون پێیەوە لەلایەن هەموو هاوڵاتیان و دەسەڵاتدارانەوە بەبێ جیاوازی، چونکە بێ بوونی یاسا گێرەشێوێنی بڵاودەبێتەوە و ڕژێم تێکدەچێ و ژیانی ئاشتیخوازانە لە کۆمەڵگادا دەبێتە مەحاڵ، لێرەوە گواستنەوە لە حاڵەتی

وەحشیگەرانەی سروشتییەوە بۆ حاڵەتی دەوڵەتی سیاسی کە لە لایەن یاساوە بەڕێوە دەچێ لە گرنگترین ئەو دەستکەوتە ژیاریانەیە کە مرۆڤایەتی بەدەستی هێناوە.

دواتر دانەر بەردەوام دەبێت و دەڵێ: لۆك لەو بیرمەندە بەراییانەیە کە تیۆریزەی بۆ لێکبوردن کردووە لە کۆمەڵگای ئینگلیزی و بەشێوەیەکی گشتیش لە کۆمەڵگای ئەوروپیدا، بیری لێکبوردنەکەشی لە قەناعەتە ئاینییە مەسیحییەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە و، دەڵێ دەمارگیری دژ بە ڕۆحی ئینجیلە کە دەڵێ: (ئەوەی بە ڕومەتی ڕاستیدا کێشایت ڕومەتی چەپیشتی بۆ بخەرە بەردەست!)، بەڵام ئەودەم لۆك دەیوت لەسەر یاسا دانەران پێویستە یاساکان لەسەر پرنسیبەکانی مەسیحیەت دانەڕێژن، بەڵکو لەسەر پرنسیپەکانی عەقڵ و یاسای سروشتی دایڕێژن کە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە نەك تەنها مەسیحییەکان.

ئیمان، لە تێڕوانینی لۆکدا کێشەیەکی کەسییە و خەڵکانی دی پەیوەندیان پێوە نییە، مرۆڤ لەم لایەنەوە بەرپرسیار نییە لەبەردەم مرۆڤێکی دیکەدا، تەنانەت گەر ئەو مرۆڤە قەشە یاخود کەشیشیش بێت، بەڵکو تەنها لەبەردەم یەزداندا بەرپرسیارە، بۆیە گەر کەسێك گومڕا یاخود کافر بێت، ئەوا هەرخۆی ئازاردەدا مادام ئەرکەکانی وەك پێویست بەرامبەر ئەوانی دیکە و کۆمەڵگا جێبەجێ دەکات، ئا بەم شێوەیە جیاوازی دەکرد لەنێوان هاوڵاتی و مەسیحی و دەیوت: هەموو مەسیحیەك هاوڵاتییە، بەڵام هەموو هاوڵاتییەك مەسیحی نییە.

بەم شێوەیە جۆن لۆك تێڕوانینی مۆدێرنی بۆ ئیمان دارشت و بەمەش لە تێڕوانینی کلێسا و سەدەکانی ناوەڕاست دەرچوو، ئالێرەدا گەورەیی و مەزنی لۆك دەردەکەوێ.

دواتر دانەر لەسەر وتەکانی دەڕوات: کاریگەری بیری جۆن لۆك لەسەر هاودەمەکانی و نەوەکانی دواتر گەورەیە، تیۆریاکەی وەرچەرخانێکی گەورەی یەکلایکەرەوەیە لە مێژوی یاسای سروشتی و حوکمی دەستوری و یاسای لێکبوردنی ئاینیدا، لە واقیعدا کاریگەری ئەو ئاشکرایە بەسەر دەستوری ئەمریکی و ئەو جاڕنامە بەناوبانگەی کە لە شۆڕشی فەرەنسییەوە سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی دەرچووە، هەروەها کاریگەری ئەو بەسەر هەموو فیکری لیبرالی ڕۆژئاواوە دەبینین کە دواتر گەشە دەکات، دەتوانین بڵێین بیروڕاکانی ڕێگایان بۆ بیرمەندانی دوای خۆی لە نمونەی ئادم سمث و کارل مارکس خۆش کرد.

دواتر دانەر دەگوازێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر دوو گەورە بیرمەندی سەدەکانی مۆدێرنە ئەوانیش: "جان جاك ڕۆسۆ و کارل مارکس"ن، هەردووکیشیان دنیایان پڕکرد و خەڵکیان سەرقاڵ کرد، سەدەیەك لە زەمەنیش لێکدیان جیادەکاتەوە، ئەمە جگە لەو جیاوازییە گەورەیەی لە نێوان کەسێتی ڕۆسۆ و کەسێتی مارکسدا هەیە.

ڕۆسۆ جگە لەوەی بیرمەندێکی گەورە بوو، ئەدیبێکی گەورەش بووە، توانی لە کەسێتی خۆیدا بلیمەتی شێواز و بلیمەتی فیکر و ناوەڕۆك کۆبکاتەوە، ڕۆسۆ جیاوازی کرد لە نێوان مرۆڤێك کە لە دۆخی سروشتیدایە لەگەڵ مرۆڤێك کە دەچێتە دۆخی کۆمەڵایەتی، شارستانییەوە،

مرۆڤ لە حاڵەتی یەکەمیاندا مرۆڤێکی باشە گەرچی تێگەشتو و عاقڵ نییە، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا بوەتە مرۆڤێکی خۆویست و دڵی پڕە لە حەسودی و لە توانایدا هەیە بە ئارەزوو شەڕانی بێت، لەبەر ئەم هۆیەیە ڕۆسۆ ڕەخنەی لە هەموو ئەو دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسیانە گرت کە لە سەردەمەکەی خۆیدا باوبوون و وای لەقەڵەم دەدا زۆربەی خەڵك بۆیە گەندەڵ بوون چونکە خودی حوکمکردن گەندەڵە. لێرەوە پەیوەندییەك هەیە لە نێوان تاك و کۆمەڵگا و ناکرێ لە یەکێکیان تێبگەین بەبێ ئەوەی لەوی دیکەیان تێبگەین، ئا لێرەوە سەرزەنشتێکی زۆری ڕۆسۆیان کرد بەهۆی هۆگربونی بە ئەفسانەیی بوونی مرۆڤەوە، مرۆڤی سەرەتایی بێوەی کە لە نێو سروشتی دەستکاری نەکراودا دەژیا و دەیانوت گەر ڕۆسۆ باوەڕی وابێت ئەوە حاڵەتێکی تۆباوییە، لە واقیعدا ڕۆسۆ زیاد لە جارێ وتویەتی ئەو فیکرەیەی تەنها بریتیە لە گریمانەیەکی تیۆری و بەمانای واقیعی وشەکە ڕاست نییە، ئەم گریمانەیەشی وەك ئامرازێکی ئیشکردن وەرگرتووە تاکو تیۆریا سیاسییە گشتییەکەی پێگەلاڵە بکات، ئەم گریمانەیە دەرفەتی دەداتێ جیاوازی نێوان بەرائەتی کۆمەڵگای سەرەتایی و نەگریسی کۆمەڵگای "شارستانی" دەربخات.

فڕوفێڵ، دووڕوویی، قسە بۆهەڵبەستن، بەخیلی و کێبڕکێ لەسەر پلەوپایە و بژێوی بەشێوەیەکی نامرۆڤانە، هەر هەمووی شتگەلێکی باوبون لەسەردەمی ئەودا، لەبەرئەوە ڕۆسۆ کۆمەڵگای پاریسی بەجێهێشت و ڕۆشت تاکو لە لادێدا بژی، لەوێ دوور لە پلان و فڕوفێڵی پایتەختەکانەوە ژیان بگوزەرێنێ و، دەیوت نزیکبونەوە لە سروشت و باڵندە و گوڵ و درەخت و تەنانەت لە دێو و درنج باشترە لە تێکەڵبوونی خەڵکانی سەردەمەکەی، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە تا چەند بەدەست فێڵ و تەڵەکەبازی ئەوانەوە ئازاری چەشتووە.

لێرەوە ڕۆسۆ لە ڕێگەی پەروەردەکردنێکی ڕاست و دروستەوە بانگەشەی چاکسازی دەرونی دەکرد، بانگەشەی چاککردنی دەزگا سیاسییەکانی دەکرد کە پەڕپوت بوبوون و بە تەواوی ژەنگیان هەڵهێنابوو، بەڵگەش بۆ ئەوە شۆڕشی فەرەنسی دوای مردنی ڕۆسۆ بە دەساڵ بەرپابوو، ئەمەش گەورەترین سەلماندنە بۆ ئەو ڕەخنانەی کە لە کۆمەڵگاکەی و سەردەمەکەی دەگرت و ڕەخنەکانی ڕاست و لە شوێنی خۆیدا بوون.

ڕۆسۆ بانگەشەی ئەوەی نەدەکرد کە بگەڕێینەوە بۆ کۆمەڵگای سەرەتایی وەك ئەوەی زۆرێك واتێگەشتون، بەڵکو ئەو بانگەشەی دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی تازەی دەکرد لەسەر شوێنەواری کۆمەڵگای کۆن، دەڵێ خەڵك بۆخۆیان گەندەڵ نین بەڵام ئەو دەزگایانەی حوکمیان دەکەن گەندەڵن، لێرەوە هیچ چارەسەرێك نییە بەبێ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەزگا زۆردارانەی کە کۆمەڵگای دابەشکردووە بەسەر چەند چینێکدا، چینی گەورەکان و چینی کۆیلەکان کە خزمەتی چینە گەورەکان دەکەن، ئەم بارودۆخەش پێچەوانەی یاسای سروشتی یاخود عەقڵانییە، ڕۆسۆ هیواخواز بوو خەڵك ئازادبێت، بەڵام لە هەموو شوێنێکدا کۆت و بەند کراون.

ئەم هاوارەی ڕۆسۆ ئەو پێشەکییە سەرەتاییە بوو بۆ

بەرپاکردنی شۆڕشی فەرەنسی و هەر بەناوی ئەویشەوە گەل لە ڕوی چینی دەرەبەگ و ئەرستۆکراتەکان کە حوکمیان دەکرد و خوێنی گەلیان دەمژی ڕاپەڕین، بەڵام ڕۆسۆ ستایشی کۆماری ڕۆمانی و ڕژێمی شاری "سبارتە" ی پێش مەسیحی کرد، خەڵکی ئەودەم لە کۆمەڵگای بچوك بچوکدا دەژیان کە لەلایەن پادشای عاقڵەوە بەڕێوە دەچو، هەروەها هاوڵاتیانیش ڕێزی یەکتریان دەگرت و چاکەی یەکتریان دەویست و بەرژەوەندی گشتیان خستبووە پێش بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیانەوە.

دواتر ڕۆسۆ تیۆریا گشتییەکەی لە هەردوو کتێبە بەناوبانگەکەیدا "ئەمیل" و "پەیمانی کۆمەڵایەتی" گەڵاڵە دەکات، ڕۆسۆ دەڵێ: لە سەرەتادا خەڵك یەکسان بوون و بە ئازادی لە نێو دارستانەکاندا هاتوچۆیان کردووە و دووربوون لە یەکترییەوە، لێرەوە گەندەڵی ئەخلاقی و زۆرداری بەرهەمی کۆمەڵگان، یاخود ڕاستر بەرهەمی ئەو جیاوازیە کۆمەڵایەتیەی نێوان دەوڵەمەند و هەژارانە.

بۆ ئەوەی لەو خراپەکاریە کۆمەڵایەتیە کەمکەینەوە پێویستە لەسەرمان بگەینە دەوڵەتی یاسا کە دەسەڵاتی دەوڵەمەند یاخود بەهێز لەسەر هەژار یاخود بێهێزەکان کەمدەکاتەوە، دەوڵەتی یەکسانی ئەو دەوڵەتەیە کە بە یەکسانی یاسا بەسەر هەمواندا جێبەجێ دەکات، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئەوە کوڕی فلانە یاخود فیسارە، هەموان یەکسانن یاخود دەبێ یەکسان بن لەبەردەم یاسادا.

دواتر دانەر دەڵێ: لە واقیعدا فیکری سیاسی ڕۆسۆ لەسەر چەمکی ئیرادەی گشتی بنیاتنراوە، مەبەستی ڕۆسۆ لە ئیرادەی گشتی ئەمەی خوارەوەیە:

هەموو هاوڵاتیەك جگە لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکەی بەرژەوەندی گشتیشی هەیە کە لە خۆشبەختی هەموو کۆمەڵگادا خۆی دەنوێنێ، ڕۆسۆ لەو بڕوایەدا بوو بنچینەی یاسا و کۆمەڵگای سیاسی دەبێ پشت ئەستوربێت بە هەموو هاوڵاتیان کە وەك ( گشتێکی کۆ) هەڵسوکەوت دەکەن و بە ئازادی ئەو یاسایانە پیادە دەکەن کە دەیانەوێ بەیەکسانی بەسەر هەموو تاکێکدا جێبەجێ بکرێت.

لە چوارچێوەی ئەم تێڕوانینەدا بۆ یاسای سیاسی ئەوا بناغەی چاکەکاری مەدەنی لەو ئەرکە کۆمەڵایەتیانەدا دەردەکەوێ کە بە ئازادی هەڵبژێردراوە، لێرەوە ڕۆسۆ تەبەنی تێڕوانینێکی دیموکراسی دەکرد و بناغەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و ئەرستۆکراتی کۆنی ڕەتدەکردەوە، ئەو هاوڵاتیانەی لەگەڵ یەکدی کۆدەبنەوە بۆ قسەوباسکردن لەسەر مەسەلە گشتیەکان ئەوانە تاکە حاکمی شەرعین بۆ کۆمەڵەی سیاسی. بەڵام حاکمی شەرعی خاوەن سەروەری چیتر پادشای فەرەنسا نەبوو بەڵکو خودی گەل بوو، حکومەتیش هیچ نییە تەنها ئامرازێکی تایبەتی ئیرادەی گشتی نەبێت بۆ هەموو گەل.

پاشان ڕۆسۆ دەڵێ: بۆ ئەوەی هەر کۆمەڵگایەك شەرعی بێت ئەوا پێویستە بڕیارە سیاسیەکان لەگەڵ ئەو یاسایانەدا بگونجێ کە میللەت دایدەنێن و بەبێ ئاوارتە بەسەر هەموو هاوڵاتیاندا دەسەپێنرێت، بەمەش یاسایەك نییە بۆ کوڕوکاڵی خانەوادە و دەوڵەمەندەکان و یاسایەکیش بۆ خەڵکانی ڕەش و ڕووت، وەك ئەو حاڵەتەی لە دەوڵەتە کۆنەکاندا هەبووە، بەڵکو تەنها یاسایەك هەیە بەسەر هەمواندا جێبەجێ

دەکرێ بۆ لەبەرچاوگرتنی پلەوپایە.

لێرەوە هاولاتی لە دەوڵەتی دیموکراتی مۆدێرندا ملکەچی یاسایەك نابێت پێی نامۆ بێت، بەڵکو پابەندی یاسایەك دەبێ خۆی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بەشداربووە لە داڕشتنیدا، لەبەر ئەم هۆیەشە ئەو بەشێوەیەکی ئۆرگانی پەیوەستە بە بەرژەوەندی گشتییەوە و بەتەنگییەوە دێ، ئەمە پێچەوانەی مرۆڤە لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی کۆن کە هیچ یاسایەکی تێدانییە تەنها یاسای بەهێزەکان و دەوڵەمەندەکان و خانەدانەکان نەبێت: واتە یاسایەکی نارەوای هەرەمەکی کوێرانە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە خەڵکی لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەمدا بۆ نمونە بەتەنگی خزمەتگوزارییە گشتیەکانی وەك پاسەکان، باخچە گشتییەکان، درەختەکان، ڕێگاوبانەکانەوە نایەن، ئەوان هەموو شتێکی کۆمەڵگا بە موڵکی دەوڵەتی دەزانن نەك بە موڵکی میللەت، ئەوان ڕقیان لە موڵکە گشتیەکانە چونکە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان خۆیان و ئەو موڵکانەدا نابینن، ئەمەش بە پێچەوانەی هاولاتیانی ولاتە ئەوروپاییە پێشکەوتوەکانەوەیە، کە لێناگەڕێن بۆ نموونە کورسی پاسەکان تێکبدرێ، چونکە ئەوان پێت دەڵێن ئەوە ئێمەی هاولاتین نرخی ئەوە دەدەین، لێرەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان هاولاتیەکی فەرەنسی و دەوڵەت و بەرژەوەندی گشتیدا.

**سەرچاوە**

بیان الکتب/ 2004/3/31

## ڕۆمانی ( ئەمە جەستەی کوڕەکەم نییە )

**سەردەم**

**نووسینی تونی کاد بامبارا**
**بڵاوکەرەوە: کریستیان بورجوا – پاریس 2002**

نووسەری ئەم ڕۆمانە خاتوو (تونی کاد بامبارا)یە کە خوشکی ڕۆمان نووسی ناوداری ئەمریکی خاتوو (تونی موریزون)ە، هەر ئەمیش لە دوای مەرگی خوشکەکەی ساڵی 1995 کتێبەکەی بەچاپ گەیاند و بۆ بڵاوکردنەوەی بە دەستنووسەکەدا چووەوە.

نووسەری ڕۆمانەکە گەلێك ڕۆمانی تری ناوداری بڵاوکردۆتەوە لەوانە (خوێ خۆرەکان) (گۆریلای دلۆڤان)ە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ڕۆمانی (ئەمە جەستەی کوڕەکەم نییە) سامناکترین و وروژێنەرترین کاریەتی. چونکە ناوەڕۆکی کارەکە بریتییە لە زنجیرەیەك کوشتن کە زۆربەیان منداڵ و ڕەش پێستەکان بوون، ئەم کاری کوشتنانە ساڵی 1979 ئەنجامدراون و کاربەدەستانی ئەوسایش جەختیان لەسەر ئەوە کردوە کە ڕووداوەکان جیاوازن و پەیوەندییان بە یەکترەوە نییە.

شانۆی پرۆسەی کوشتن و فڕاندنی منداڵانی ڕەش پێست شاری (ئەتڵەنتا)یە، سەرۆکی شارەوانیی ئەو شارە لە ساڵی 1973 وە ئەمریکییەکی بەڕەگەز ئەفریقی بووە. واتا ئەمریکییەکی ڕەش پێست، یان "ئەفر و .. ئەمریکی). تۆنی بامبارایش بێجگە لەوەی ڕۆماننووسێکی دیارە، یەکێکە لە تێکۆشەرانی بواری مەسەلەی ڕەشەکان لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بۆیە کوشتنی منداڵانی ڕەش لە ناخەوە هەژاندی و بڕیاری لەسەر نووسینی دا وەك دایکێکی ئەو منداڵانە. ڕووداوی ناو ڕۆمانەکە

وا دەست پێدەکات کە سەر لە بەیانیەکی مانگی یولیوی ساڵی 1980 "سونی" کە منداڵێکی تەمەن دوانزە ساڵە ناگەڕێتەوە ماڵێ. تۆ بڵێی ئەم نەگەڕانەوەیە پەیوەندی بە فڕاندن یان کوشتن یان هەڵاتنەوە هەبێت؟ ئایا "سونی" قوربانیە یان "بکوژ"ە لەگەڵ ئەوەیشدا کە منداڵە؟ (تۆنی کاد بامبارا) بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە باس لە شێوازی پۆلیس ناکات، بەڵکو و باس لە واقیعی "ئەتڵەنتا" دەکات لە سایەی "ماینارجاکسون"ی ڕەشدا کە سەرۆکی شارەوانیە.

"تونی کاد بامبارا" وێنەی دنیایەکی تازەی لە بابەتی (چەوساوەکانی سەر زەوی) لەسەر شێوەی "فرانز فانون" دەکات، هەر لەسەر هەمان ڕێبازیش لێپرسراویەتی ئەو کارە دەنێتە ئەستۆی ئەو پەیوەندیە مرۆڤایەتیەی لەسەر بنەمای چەوسانەوە و دەست بەسەراگرتنی دامەزراوە، چونکە "ژیان چیە بێجگە لە پەیوەندیەکانی نێوان مرۆڤ؟" کارەساتی منداڵانی ئەتڵەنتایش وەك نووسەر دەستنیشانی کردوە بریتییە لە "ونبوون"ی ئەو جۆرە پەیوەندیە و نەبوونی فۆرمێك بۆ "پێگەیشتن"ێکی ڕاستەقینە لە نێوان خۆیان و کەس و کاریان و کۆمەڵگا و خودی خۆشیاندا، هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی ئامادەگیەکی تەمەڵی و بێ دەربەستی پۆلیسدا. کە ناتوانێ و بەڵکو و هەوڵیش نادات پارێزگاری ئاسایش بکات. ئەمە بە پاڵ پەرەسەندنی بازرگانی کردن بە مادە سڕکەرەکان و خواردنیان لەلایەن منداڵانی بچووکەوە کە لەباتی گەشەکردن و پێگەیشتنی جەستەیان دەبێتە هۆی لەناوچوونیان. توندوتیژیش بەشێکی تری ئەو دیمەنەی ئەتڵەنتایە، ئەو توندوتیژیەی کە لەوپەڕی خۆدەربڕینیدا تەقینەوەی نارنجۆکێکە لە یەکێك لە قوتابخانەی باخچەیەکی ساواندا ئەم ڕۆمانە — یان ئەم بەڵگەنامەیە لە ڕەهەندێکی تری سیاسیەوە نووسەر باس لە چالاکی ئەو جووڵانەوە مەدەنیانە دەکات کە دژی هەموو چەوسانەوەیەکن بە تایبەتی دژ بە ڕەشەکانی ئەتڵەنتا کە گەلێك کەس لە ئەمریکادا بە "قیبلەی ڕەشەکان"ی دەزانی. "تونی کاد بامبارا" کۆلەوەیش ناکات لەوەمان ئاگادار بکات کە ئایندە زۆر تاریك و ڕەشترە، چونکە "مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە" وەك ڕۆمانەکە بە درێژایی زیاد لە 800 لاپەڕە باسی دەکات.

### سەرچاوە

بیان الکتب ژمارە 222

## "کیرکە گۆر" و خیانەتی خۆشەویستی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*Kierkegaard and the treachery of love*

*Amy Lura hall - Cambridge university Press. 2002 p.222*



نووسەری ئەم کتێبە خاتوو "ئامی لۆرا هۆل"ە، کە مامۆستای ئەخلاقناسی و

خوداناسییە لە زانکۆی دیۆک. تەوەری سەرەکی ئەم کتێبەی مەسەلەی خۆشەویستییە لە بەرهەم نوسینەکانی فەیلەسوفی بەناوبانگی دانیمارکی "سۆرین کیرکەگۆر" دا.

"کیرکە گۆر" چەند کتێبێکی بۆ مەسەلەی خۆشەویستی تەرخان کردبوو، ئەگەرچی نە ژنی هێناو نە وەچەشی خستەوە.. بەڵام لە ژیانی ئەودا سەربوردەی عەشق و خۆشەویستیەکی بەناوبانگ و ئێجگار سەیر هەیە کە زۆر جاران بۆتە مایەی سەرسورمانی نوسەر و لێکۆڵیاران.

لە تەمەنی لاویەتیدا "کیرکە گۆر" دەکەوێتە داوی خۆشەویستی کچێکی خەڵکی شاری کۆپنهاگن، بەناوی "ریجینا ئۆڵسن". پاش ماوەیەك بە مەبەستی هێنانی داوای دەکات و دەبنە دەزگیران، بەڵام لە دواساتدا ڕای دەگۆڕێت و تکا لە "رێجینا" دەکات جێی بهێڵێت و شو بە کەسێکی تر بکات. "کیرکە گۆر" بۆ ئەوەی "رێجینا" وازی لێبێنێت و ڕقی لێی بێت دەستدەداتە ناشیرینکردنی خۆی و هەڵسوکەوتی بێ سەروبەر، بەڵام ئەم کارانەی بێ هودە بوون، چونکە "رێجینا" ئالودەی بووبوو.

بەڵام "کیرکە گۆر" بۆ وایکرد؟ لەبەرئەوە بوو کە "رێجینا"ی خۆشنەدەویست؟ نەخێر.. بەڵکو زۆری خۆشدەویست و بە دڵ عاشقی بوو، بەڵام ترسی هەبوو لەوەی مێردێکی سەرکەوتوو نەبێت و نەتوانێت هاوسەرەکەی بەختەوەر بکات. کەواتە بەجێهێشتنی لە پەرۆشی و خۆشویستنیەوە بوو، نەك ڕقی لێی بووبێت.

شایەنی باسە "کیرکە گۆر"ی فەیلەسوف وەکو زۆربەی زۆری فەیلەسوفان کەسێکی نائاسایی و لە ڕوی دەرونیشەوە ئاڵۆز و پڕ گرێ بووە، ئەویش بە هۆی ئەوەی جەستەیەکی ناشیرین و نارێکی هەبووە. هەروەها لاواز و قەمور بووە، سەرەڕای ئەوانەش نەخۆش و دەردەدار بووە و پێی وا بووە زۆر ناژی.

هەرچەندە "رێجینا" "کیرکە گۆر"ی جێهێشت و شوی بە پیاوێکی تر کرد و بوو بە دایکی منداڵان، بەڵام "کیرکە گۆر" هەر خۆشیدەویست.

بەڵگەش ئەوەیە کە بەر لە مردنی وەسیەت نامەیەکی نوسیوە و تیایدا هاتووە کە لە دوای مردنی تەواوی بەرهەمەکانی بە دیاری بدرێتە "رێجینا" و هاوکات قازانجی فرۆشی کتێبەکانیشی هەر بۆ ئەو بێت، لەبەرئەوەی ئەو تەنها میراتگری دەبێت و گرنگترین بونەوەرێکە بۆ ئەو لە بوندا.. دوای مردنی "کیرکە گۆر"، "ریجینیا" زیاد لە نیو سەدە دەژیا.. کەواتە لێرەوە تێدەگەین کە "کیرکە گۆر" بە شێوەیەکی ڕۆمانی نەك جەستەیی، بوو بووە هاوسەری "رێجینا" و زیاد لە گیانی خۆی خۆشیدەویست.

(بەرهەم و نوسینەکانی دەربارەی خۆشەویستی) لە ساڵی 1947 لە کۆپنهاگن چاپکران و یەکێکە لەو کتێبە دانسقانەی کە بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردۆتەوە، نەك بە ناوێکی خواستراوەوە (کیرکە گۆر زۆربەی بەرهەمەکانی بە ناوی خواستراوەوە بڵاوکردۆتەوە). بە ئاشکرا لەم کتێبەیدا دیارە کە "کیرکە گۆر" نوسینەکەی ئاڕاستەی ئەو کەسە کردووە کە ڕۆژگارێك دەزگیرانی بووە و هەنوکە وا نەماوە و شوی بە کەسێکی تر کردووە. واتە گەر "رێجینا" و خۆشەویستی ئەو نەبوایە، کتێبێکی لەمجۆرەی نەدەنوسی. هەرچەندە "کیرکە

گۆر" خۆی پەیوەندی لەگەڵ "ڕێجینا" دابڕی و ناچاری کرد جێی بهێڵێت، بەڵام سەروەختێك کە زانی شوی کردووە خەمێکی قوڵ دایدەگرێت. "کیرکە گۆر" لەبەرئەوەی کەسێکی ئیماندار بوو پێی وابوو "ڕێجینا" لە سەر زەوی نا، بەڵکو لە ئاسماندا دەبێتە دەزگیرانی و لەوە دنیا هەتا هەتایە لەگەڵیدا دەبێت.

لێرەدا پێویستە خۆشەویستی مەسیحی لە خۆشەویستی وەسەنی (بەشێوە یۆنانی و ئەفلاتۆنیەکەی)، جیابکەینەوە.. چونکە خۆشەویستی وەسەنی یاخود دنیای ئامانجی بەیەکگەیشتنەو بوون بە خاوەنی جەستەی ئەو ژنەیە کە خۆشیدەوێت، بەڵام خۆشەویستی مەسیحی وەك ئەوەی "کیرکە گۆر" تێی گەیشتبوو خۆشەویستیەکی خۆبەخۆیە و ئامانجی بەیەکگەیشتن نییە. هەر لەبەر ئەمەش بوو وەك جەستە لەگەڵ ئەو تەنها ئافرەتەدا جوت نەبوو کە خۆشیدەویست، بەڵکو بە شێوەیەکی ڕوحانی و عیرفانی ئاوێتەی بوو. ئەو پێی وابوو عەشقی جەستەیی دوای تێرکردنی حەز و ئارەزووەکان دەمرێت و فەنا دەبێت، تەنها عەشقێك کە بۆ ئەبەد بژی و سەرمەدی بێت خۆشەویستی ڕۆحانییە.. سەرباری ئەوەش ئایینی مەسیحی هەرگیز ئامانجی ئەوە نەبووە کە لە دنیادا سەرکەوتن بە دەست بێنێ یاخود زاتی خۆی لەسەر زەمین تەحقیق بکات، بەڵکو ویستی وا بووە لە دنیا بکشێتەوە. ئەی ئەوە حەزرەتی مەسیح نییە کە دەڵێت: (مەملەکەتی من لەم دنیایەدا نییە؟). کەواتە "کیرکە گۆر" کە بە دامەزرێنەری فەلسەفەی بونخوازی مەسیحی دادەنرێت، بۆی گرنگ نییە لەم دنیایەدا سەرکەوتوو بێت و "ڕێجینا ئۆڵسن" بخوازێت، ئەوەی بۆ ئەو گرنگە ئەوەیە کە بەسەر حەز و ئارەزووەکانیدا زاڵبێت و بە پاکی لەم جیهانە بچێتە دەر. ئەوانەی قەناعەتێکی لەمجۆرەیان هەیە سەرکەوتنی مادی بە هیچ نازانن، بۆیە هەموو ئەو شتانەی مرۆۋ هەوڵی بۆ دەدات بە مەبەستی دەوڵەمەند بوون و پارەداری، بۆ کەسێکی وەك "کیرکە گۆر" هیچ ناگەیەنێت، بگرە ئەو بە پێچەوانەوە دەیەوێت لەم ژیانەدا نوشست بهێنێت بۆ ئەوەی ئەو دنیاو ژیانی ئەبەدی و نەمری بباتەوە. ئەوەی بۆ ئەو گرنگ بوو ئەوە بوو کە "ڕێجینا" لەگەڵ مێرد و منداڵەکانیدا دڵخۆش و بەختەوەر بێت، چونکە ڕۆژێك دێت لە دنیایەکی سەرمەدی و پاکژتر لەم دنیایە بەیەکدەگەن و پێکەوە دەبن.

سەبارەت بە خۆشەویستی، "کیرکە گۆر" دەنوسێت: (ئەی خواوەندی خۆشەویستی چۆن دەکرێت وەکو پێویست باسی خۆشەویستی بکەین ئەگەر تۆمان لە یاد نەبێت؟ هەموو خۆشەویستی زەوی و ئاسمان لای تۆوە دێت، تۆ هیچ شتێکت پاشەکەوت نەکردووە و هەموو شتێکت لەپێناو خۆشەویستیدا بەخشیوە، بۆیە دەبێت هەموو ئەوانەی خۆشەویستی دەکەن لە ڕێی تۆوە بیکەن.. باسی خۆشەویستی چی بکەین گەر تۆمان لە یاد کرد، تۆ ئەو کەسەی مانای خۆشەویستیت فێرکردین؟ تۆی ڕزگارمان دەکەیت و گوناهەکانمان دەبەخشیت و بەزەیت پێماندا دێتەوە، تۆ قوربانیت بە خۆتدا بۆ ئەوەی تەواوی مرۆڤایەتی ڕزگار بکەیت — ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئازار و لەخاچدانی مەسیح—).

کەواتە عەشقی "کیرکە گۆر" عەشقێکی ئینسانی نییە، بەڵکو عەشقێکی پیرۆزی ئاسمانیە و بە عەشقی "ڕابعەی عەدەویە" دەچێت. بگرە هەندێ جار کە تێکستەکانی "کیرکە گۆر" دەخوێنینەوە، دەقە ناسك و قەشەنگەکانی ئەومان بیردێنێتەوە.

"کیرکە گۆر" ئەوەندە "ڕێجینا ئۆڵسن"ی خۆش دەویست، لێی دوورکەوتەوە! چونکە ئەو نەیدەویست بە شتە مادی و حەز و ئارەزووە جەستەییەکان پیسی بکات. "ڕێجینا" لای ئەو بووبووە خانمێکی پاك و بێگەرد و وەکو فریشتەیەك لێی دەڕوانی. خۆشەویستی زۆری بۆی کردبوویە فریشتە و ڕۆحیانەتێك، کە دەکرێت تەنها لە ئاسماندا بە شێوەیەکی هەمیشەیی و سەرمەدی پێکەوە بژین. ئەمەش پێچەوانەی ئەو پەیوەندیە زەمینیەیە کە بە مەرگ یان بە پایانی عیشق و غەریزەی سێکسی کۆتایی دێت. خۆشەویستی نێوان "کیرکە گۆر" و "ڕێجینیا" بووە ئەفسانە و دەیان کتێب و باس و خواسی لەبارەوە نوسرا..

پێدەچێت گەر "کیرکە گۆر" "ڕێجینا"ی بهێنایە و پێکەوە بژیانایە، کتێبەکانی مێژوو باسیان لە هیچ شتێکی ئەم پەیوەندیە نەکردایە. هەروەها مەحرومی و پێکنەگەیشتن، بەهرەی "کیرکە گۆر"یان جۆشدا و وای لێهات جوانترین دەقی ئەدەبی و قوڵترین تێکستی فەلسەفی خۆی بنوسێت.

فەیلەسوفی فەرەنسی "جۆرج گۆسدۆرف" دەڵێت: (ناتوانین بزانین ڕێجینا ئۆڵسن لە ژیان و بەرهەمەکانی کیرکە گۆردا چ پێگەیەکی گەورەی هەبووە، بەهۆی ئەم خانمەوە کە لە ژیاندا دەسگیری نەبوو، کیرکە گۆر بوو بە شاعیرێکی مەزن و قارەمان و تەنانەت بووە قەدیسێکیش. ڕێجینیا بۆ کیرکە گۆر بووە ئیلهام بەخشێکی وا کە حەقیقەتی خۆی و قولایی ناخی خۆی پێناساند. ڕەنگە گەر ئەو نەبوایە و ئەو دابڕانە سەختە نەبوایە کە دڵی هەردووکیانی پارەپارە کرد، "کیرکە گۆر" نەدەبووە ئەو فەیلەسوفە مەزنەی دەیناسین.. نەهامەتی و تراژیدیای ژیان پیاو دروست دەکات و نوسینیش تەنها لە حاڵەتی ئازار و ژاندا گەشە دەکات). جێی باسە جیابونەوەی "کیرکە گۆر" لە "ڕێجینا" کۆتایی پەیوەندی نێوانیان نەبوو، بەڵکو سەرەتا بوو. چونکە ژیانی "کیرکە گۆر" دوای ئەو دابڕانە بوو بە دیالۆگ و گفتوگۆیەکی بێدەنگ لەگەڵ "ڕێجینا"دا.

خەیاڵی ئەو خانمە لە پشت تەواوی ئەو کتێب و وشانەوەیە کە ئەو نوسیونی و دەکرێت بڵێین ئامادەنەبوونی زۆر بەهێزترە لە هەموو ئامادەبوونێك.

کەواتە زیادەڕۆیی نییە کە بڵێین مەزنی "کیرکە گۆر" لە ڕوی فەلسەفیەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چرکەساتە سەرەکیە: واتە چرکەساتی جیابوونەوەی لەگەڵ خۆشەویستە بەنرخەکەیدا.. ئەوەی "کیرکە گۆر" لەگەڵ "ڕێجینا"دا کردی خیانەتکردن نەبوو لە خۆشەویستی، بەڵکو ئەوپەڕی وەفاداری و دڵسۆزی بوو.

## سەرچاوە

بیان الکتب – ژمارە (240)، بەرواری 2002/12/9.

## "لیۆنی ئەفریقی"

### ڕۆمانێکی مێژوویی بەروانینێکی هاوچەرخ

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

ڕۆماننووسی بەڕەگەز لوبنانی و بە ناسنامە فەرەنسی "ئەمین مەعلوف" سالآنێکی دوور و درێژە لە خۆرئاوادا دەژی بەلآم بە ئەقڵیەتی خۆرهەلآتییەك ئەدەب بەرهەم ئەهێنێت کە لە ڕووداوەکانی مێژوودا ژیاوە و لە نزیکەوە شوێنەکانی ناسیوە، ئەو لەسەر دۆکیومێنتی مێژوویی کاردەکا و لە ڕۆمانەکانیدا سوود لەو دۆکیومێنتانە وەردەگرێت. لە میانی زیاد لە دۆکیومێنتێکەوە ڕاستیی ڕووداوەکانی ناو ڕۆمانەکانی بە خەیاڵێکی جوانی خۆرهەلآتی دادەڕێژێ بە چەشنێك ڕۆمانی مێژوویی بە گیانێکی هاوچەرخانە بەرهەمدەهێنێت، ئەمین مەعلوف پێشتر ڕۆژنامەنووس بووە و هەروەها پەیامنێری چەندین ڕۆژنامە بووە لە شوێنە سەخت و گەرمەکاندا، بۆیە هەست دەکەین زمانی ڕۆژنامەوانیی هێناوەتە ناو زمانی ئەدەبەوە، بەمە خوێنێکی گەشتری بە بەر ئەدەبدا کردووە، جگە لەوەی بابەتی جیاجیا بە فۆرمی نووسینی جیاجیا دەنووسێت کە دواجار ئەدەبێك بەرهەم ئەهێنێت شایستەی ئەوەیە بە قووڵی بخوێنرێتەوە.

ئەمین مەعلوف لە ساڵی 1949 لە لوبنان لە دایکبووە و لە ساڵی 1976 بۆیەکجاری چووەتە فەرەنسە و لەوێ وەکو نوسەرێکی سەربەخۆ و وەکو پەیامنێری چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی فەرەنسی و عەرەبی کاری کردووە، بەلآم دواتر نووسین بە زمانی فەرەنسی شوهرەتێکی پێ بەخشی و چەندین ڕۆمانی بەو زمانە نووسیوە لەوانە (سەمەرقەند) و (بەردی تانیوس) و (باخچەکانی ڕووناکی) و (پەیژەکانی خۆرهەلآت) و (ناسنامە بکوژەکان) و (لیۆنی ئەفریقی) کە ئەم ڕۆمانەی دوایی باسی ژیانی پیاوێکی عەرەبی ئەندەلوسی دەکات کە بە ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیادا دەگەڕێ و لەگەڵ خۆیدا خۆشەویستی بۆ ژیان و داکۆکیکردن لە ڕاستی هەڵدەگرێت، بەلآم دواجار ئەم پیاوە ئەندەلوسیە عەرەبە لە ڤاتیکان دەگیرسێتەوە.

ئەم ڕۆمانە بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی 1986 چاپ کراوە و لە ساڵی 1990یش لە لایەن وەرگێڕی کۆچکردوو عەفیف دیمەشقی کراوە بە عەرەبی، وەرگێڕانە عەرەبییەکە ئەمین مەعلوفیشی سەرسام کردووە چونکە بەوردبینیەکی جوان داڕێژراوەتەوە هەندێجار لە دەقە فەرەنسییەکە جوانتر تەرجەمەکراوە. مەعلوف لە ساڵی 1993دا پاداشتی گونکۆری فەرەنسی وەرگرتووە کە هەر ساڵەی دەدرێ بە نووسەرێکی داهێنەری فەرەنسی نووس.

ئەمین مەعلوف لەم ڕۆمانەدا ڕاناوی کەسی سێیەم بەکاردەهێنێ و "حەسەن وەزان" دەکات بە قارەمانی سەرەکیی ڕووداوەکان، ئەم کاراکتەرە لە غەرناتەدا فێری بەرائەت و بێگەردی دەبێت و لە شاری فاسدا بە غەمباری دەژی و لە قاهیرەشدا وەك مێرمنداڵێك ڕەفتار دەکا و لە ڕۆماشدا فێری حیکمەت و دانایی دەبێت، ئەمانە ئەو شوێنانەن کە حەسەن وەزان تیایاندا دەژی و لەوێوە پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکانی پەرەپێدەدا بە تایبەتی لەگەڵ پیاوانی کەنیسەدا لە ڕۆما ئەگەرچی بە دەست و پێ

بەستراوی بەرەو ئەوێ راپێچکراوە.

مەعلوف ئەم ڕۆمانەی بەسەر چوار بەشی سەرەکیدا دابەشکردووە بە پێی ئەو شارانەی حەسەن وەزان تیایاندا ژیاوە، حەسەن وەزان نە کەسێکی ئەوروپییە و ئەفریقاییە و نە عەرەبی بەڵکو ژیانی پڕ بووە لە گەشتێکی بەردەوام بە ناو وڵاتان و شارە جیاجیاکانی ئەوروپا و ئەفریقیا و ئاسیا. بەشی یەکەمی ڕۆمانەکە لە غەرناتەدا دەست پێدەکات و لەوێدا حەسەن وەزان لە ساڵی 894ی کۆچی لەدایك دەبێت ئەو دەمەی حوکمی عەرەب لەو شارەدا لاواز ببوو و سوڵتانی ئەو شارە علی بن سعد النصری وەك پیاوێکی ستەمکار و زاڵم ناسرابوو، لە جەنگی ساڵی 897ی کۆچیدا حوکمی عەرەب لە وڵاتی ئیسپانیادا کۆتایی پێهات و زۆربەی خێزانە عەرەبەکان بەرەو مەغریب و فاس کۆچیان کرد لەوانە خێزانی حەسەن وەزان و خزم و کەسوکارەکانیان، لەوێدا وەزان ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات بەڵام خاڵییە لە خۆشگوزەرانی، حەسەن وەزانی منداڵ لە مەغریبدا لە کەشوهەوایەکی ئاییینی گەورە دەبێ و قورئان خەتم دەکا و دواتر لە رێگەی باوکیەوە بازرگانەکان دەناسێت و دەچنە شاری فاس و ئیتر لەوێوە گەشتە سەخت و سەمەرەکانی دەست پێدەکات، گەشتکردنی بەردەوام بۆ حەسەن وەزان دەبێتە مایەی سەرکێشی و ئاگایی و دەوڵەمەندی چونکە لەودەمەدا ئازایی و چاوکرانەوە و هۆش و زانیاری لە ڕێگەی سەفەرەوە دەڕسکان و کەسایەتییان بەهێز دەکرد.

خێزانی حەسەن وەزان و کەسوکارەکەی یەك لەدوای یەك و وردە وردە دەمردن و ئەو بە تەنها دەمێنێتەوە، بەڵام زانیاری و ئاگایی زیاد دەکات و دەوڵەمەند دەبێت و پتر لە سوڵتان نزیك دەبێتەوە بۆیە سوڵتان دەیکات بە سەفیری وڵاتە دوورەکان و ئەرکی سیاسی و ئابووریی پێ دەسپێرێت، حەسەن وەزانیش لە جێبەجێکردنی ئەو کارانەدا سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام ئەم سەرکەوتنە بەردەوامانەی وەزان لەلایەن نەیار و ناحەزەکانیەوە دەقۆزرێتەوە و دوچاری قەیرانی دەکەن و دواتر زەرەر و زیانێکی زۆر دەکات بۆیە ناچار دەبێت ئەو وڵاتە بەجێبهێڵێت و دەچێتە شاری قاهیرە لەوێ ژن دەهێنێت و منداڵیان دەبێت. دواتر درێژە بە سەفەرەکانی دەدا و لە یەکێ لەو سەفەرانەدا لەلایەن چەند چەتەیەك دەگیرێ و بە دەست و پێ بەستراوی دەیبەنە ڕۆما، لەوێدا قەشەیەك سەرسام دەبێت بە زیرەکی و دانایی وەزان و متمانەی خۆی پێدەبەخشێت و داوای لێدەکات فێری زمانی عەرەبییان بکات، واتە دەرسی زمانی عەرەبی بە قەشەکان بڵێتەوە، دواتر پەیوەندیی حەسەن وەزان لەگەڵ گەورەی قەشەکاندا پتەو دەبێت گەورەی قەشەکان وایدەبینێ کە ئەم پیاوە – واتە وەزان – شایستەی ئەوەیە نازناوی خێزانی دومدیچی هەڵبگرێ کە یەکێکە لە خێزانە خانەدانەکانی ئەو وڵاتە، بەم چەشنە ناوی حەسەن وەزان دەگۆڕێ و دەیکات بە یۆحەنا دومدیچی یان لیونی ئەفریقی، ئیدی بە درێژایی مانەوەی لە ڕۆمادا بەو ناوە دەناسرێت.

لەو سەردەمەدا بزووتنەوەیەکی گەورەی هرتەقییەکان لە ئەڵمانیا دەست پێدەکات و دەگاتە ئیتالیا و چەندین پیاوی کەنیسە بەرئاگری ئەو بزوتنەوەیە دەکەون لەوانە لیۆنی ئەفریقیش کە لە ڕۆمادا

ژنێکی هێنابوو بە ناوی مادالینا و کوڕێکی لێبوو ناوی نا جوسب.

حەسەن وەزان یان یۆحەنای دومدیچی یان لیۆنی ئەفریقی، کاتێك دەیەوێت لە ڕۆما هەڵبێت، دەکەوێتە بەردەستی هرتەقییەکان و ئەوەندەی نەمابوو تیا بچێت بەڵام هانزی قوتابی کە لیۆن لە کەنیسەدا دەرسی عەرەبی پێدەوتەوە ڕێگەی دەربازبوونی پیشان دەدا و بەمجۆرە حەسەن وەزان لەگەڵ خێزانەکەیدا هەڵدێت و دەگەڕێتەوە بۆ باکووری ئەفریقیا، پاش ئەوەی چل ساڵی لە سەفەر و گەشتی بەردەوامدا بەسەر برد بەڵام پڕ بوو لە سەرکێشی و زانیاری.

بێگومان ئەم ڕۆمانە لەسەر بینایەکی مێژوویی دامەزراوە و پشتی بە دۆکیومێنتی راستەقینە بەستووە، ئەمین مەعلوف لە چەندین مۆزەخانە و کتێبخانەی گەورەدا بە دوای ئەو دۆکیومێنتانەدا گەڕاوە تا ڕۆمانێکی مێژوویی بنووسێت بەڵام لەسەر ئیقاعی ڕۆمانی هاوچەرخ.

مەعلوف لە چوارسەد لاپەڕەی ڕۆمانەکەیدا جەنگەکانی پەنجا ساڵی ئەو سەردەمەی بەشێوەیەکی تر داڕشتۆتەوە و لە نەتەوەو ئایینە جیاجیاکانی ئەوروپا و ئەفریقیا و ئاسیا دواوە و جەنگەکانی نێوانیانی خستۆتە ڕوو، لێرەوە ئەمین مەعلوف توانیویەتی لە ڕێگەی ڕۆمانەوە جارێکی تر و بەشێوەیەکی تر مێژوو بخوێنێتەوە.

### سەرچاوە

لە ئینتەرنێتەوە

(بیان الکتب ژمارە 253).

## کاتێ هەموو شتێ دەسووتێ من چیبکەم

لە عەرەبییەوە: دانا ئەحمەد

**ئەنتۆنیۆ لوبو ئەنتۆنیس**

**لە بڵاوکراوەکانی کریستیان بۆرجوا — پاریس 2003**

ئەنتۆنیۆ لوبو ئەنتۆنیس نووسەرێکی پورتوگالییە و بەرهەمەکانی بۆ چەند زمانێکی جیهانی وەرگێڕراوە، بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە لە سەرگوزشتەی واقعیەوە نزیکترە تا جیهانی داهێنانی ڕۆمان.. لەگەڵ ئەوەی هەندێکیان ناویان لێنراوە (ڕۆمان).

لەم بەرهەمەیدا (کاتێ هەموو شتێ دەسووتێ من چیبکەم؟) نووسەر باس لە جادە و گەڕەکەکانی شاری (لشبونە)ی ئیسپانی دەکات، کە ساڵی 1942 تیایدا لەدایك بووە، دایك و باوکی هەردوکیان دوو پزیشکی ناودار بوون، بەڵام منداڵەکەیان (ئەنتۆنیۆ) هەر لە منداڵیەوە خولیای ئەدەبی هەبوو بۆیە دەستی دایە خوێندنەوەی سەرچاوەکانی بە زمانە ئەسڵیەکەی خۆی.. وەك (گەڕان بە دوای زەمەنێکی لە دەست چوو) نوسینی مارسیل پروست و بەرهەمەکانی فلوبیر و کارە کلاسیکییەکانی ئەدەبی فەرەنسی بە زمانی فەرەنسی، هەروەکو بەرهەمەکانی فوکنەری دەخوێندەوە و زۆر کاریگەریان هەبوو لەسەری بە ئاراستەی ئەو هەلومەرجەی خولقاندبوویان، دواتر بەرهەمەکانی شاعیری گەورەی ئەڵمانی (گۆتە)ی بە زمانی ئەڵمانی خوێندەوە.. ئەم نووسەرە جگە لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی زمانی پورتوگالیشی ئەزانی کە بەرهەمەکانی ئەدیبە روسیەکانی

پێ دەخوێندەوە بە تایبەتی چیخۆف و دیستوڤسکی و تۆڵستۆی.

لە سەرەتای ژیانیدا (ئەنتۆنیۆ لوبو ئەنتۆنیس) وەك باوك و دایکی زانستی پزیشکی خوێندەوە لە بواری سایکۆلۆجیدا قالْ بۆوە، بۆ یەکەم جار وەکو پزیشکی سەربازی چوو بۆ (ئەنگۆلا لە ئەفریقا) ئەو وەختە لە ژێر دەستی پورتوگالیەکاندا بوو، ماوەی دوو ساڵ لەوێ مایەوە لەپڕ بوو بە توندوتیژیی چونکە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ڕزگاری بوو لەلایەن ئەفەریقیەکانەوە.. هەر بۆیە لە بەرهەمەکانی دواییدا شەقڵی خوێن و سەر شۆڕی پێوە دیارە بە تایبەتی لە بەرهەمی (یادەوەریەکانی فیلێك) کە لە ساڵی 1979دا بڵاوکرایەوە کە تیایدا باسی خۆی دەکات وەکو پزیشکێکی دەروونی و باس لە ئەنگۆلا و دایك و باوکی و سەرگوزشتەی ژیانی و خێزان دروست کردن و جیابوونەوە لێی بەشێوەیەکی زۆر خێرا.. ئەم ڕووداوانە لە بەرهەمەکانیدا و بە تایبەتی ئەم بەرهەمە بەرجەستە دەبێت هەندێ جار هێندە خوازە بەکاردێنێ کە نووسینەکە بە ئاراستەی شیعر دەبات.. ئەم جۆرە نووسینە بۆتە سیمای جیاکەرەوەی ئەنتۆنیۆ لوبو ئەنتۆنیس. بەڵام ئەم خوازەیە جارێکی تر تێکەڵ بە مێژوویەکی ڕاستەقینە دەکات کە خۆی یان کۆمەڵگەکەی تیایدا ژیاوە.. هەروەکو لەم بەرهەمەی کۆتاییدا باس لە بۆرجوازییەتی پورتوگاڵی دەکات کە خۆی تیایدا ژیاوە.. بە تایبەتیش گەڕەکەکانی (لشبونە).. لە بەرهەمی (کاتێ کە هەموو شتی دەسووتێ چیبکەم؟) باس لە زەمەنی مناڵی دەکات، ڕۆڵی سەرەکی لەم بەرهەمەدا مناڵێك دەبێت کە توشی ئەشکەنجە و ئازار و نەهامەتی هاتووە لە سێبەری دایك و باوکیدا.

## سەرچاوە

لە ئینتەرنێتەوە

(بیان الکتب) ژمارە (280)

# بڵاوکراوەی نوێ












# تەوەرەکانی ژمارەکانی داهاتووی

# گۆڤاری سەردەم

لە ژمارەکانی داهاتووی گۆڤاری سەردەمدا ئەم تەوەرانەی لای خوارەوە بڵاودەبنەوە هیواداریین وەرگێڕەکانی کوردستان بە بابەت دەوڵەمەندیان بکەن:

- کۆمەڵگای مەدەنی.
- ڕەخنەی ئەدەبی.
- مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنیتە.